# بوون
# لە شیعری (مەحوی) دا





د . محەمەد ئەمین عەبدوڵا

# بـوون لـەشیعری مـەحـویـدا

## لێکۆڵینەوەیەك لە شیعرەکانی مەحوی لە روانگەی
## فەلسەفەی بوونگەراییەوە

د . محەمەد ئەمین عەبدوڵڵا

مەڵبەندی کوردۆلۆجی

هەرێمی کوردستان

سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران

مەڵبەندی کوردۆلۆجی

- ناوی کتێب: بوون لە شیعری مەحویدا
- بابەت: لێکۆڵینەوەی فەلسەفی
- نوسەر: د . محەمەد ئەمین عەبدوڵا
- پیتچنین: د . محەمەد ئەمین عەبدوڵا
- دیزاین: د. محەمەد ئەمین عەبدوڵا
- بەرگ:رەنج شوکری
- سەرپەرشتیاری چاپ: بڕیار فەرەج کاکی
- ژمارەی سپاردن: ٢٢٣٧، ساڵی ٢٠٠٨
- چاپخانەی تیشك/چاپی یەکەم ، سلێمانی
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- نرخ: ٣٥٠٠ دینار
- زنجیرە: ٢٠


مەڵبەندی کوردۆلۆجی

ناونیشان: سلێمانی، گردی ئەندازیاران- گەڕەك/١٠٥، کۆڵان/٢٥، ژ.خانوو/٤، ژ. پۆست/٩٥

تەلەفون: ٣١٩٣٠٩٣ – ٣١٩٣١٧٥

kurdology2006@yahoo.com

# ناوەڕۆك

## وشە کورتکراوەکان :

**ب.ط : بدون طبعة**

**چ : چاپ**

**ل : لاپەڕە**

**ت : ترجمة**

**ب. س.چ : بێ ساڵی چاپ**

**ب.ژ.چ : بێ ژمارەی چاپ**

**د . م : دیوانی مەحوی**

**هـ . س : هەمان سەرچاوە**

**س : سنة ( ساڵ)**

**ص: صفحة**

**هـ . ل : هەمان لاپەڕە**

**ط : طبعة**

# پێشـــــەکی

لێکدانەوەو راڤەکردنی شیعرەکانی مەحوی و دۆزینەوەی ئەو رەهەندو لایەنە شاراوانەی تیایاندان ، کارێکی ئاسان نییە ، چونکە ئەو مەبەست و نەگوتراوانەی تیایاندا پەنهانن ، بە ئاسانی خۆیان نادەن بەدەستەوە . ئەمەش خوێنەر تووشی سەر لێ تێکچوون و ئاڵۆزیی دەکات و وا هەستدەکات ئەو شیعرانە زۆر نەهیلیزمین و هیچ واتایەکی گرنگ نادەن بە دەستەوەو زۆر ئاڵۆزن . بۆ دەربازبوون لەم بارەو کردنەوەی دەرگایەك بە رووی شیعرەکانی مەحویدا ، بۆ ئەوەی بچینە ناو جیهانی شیعرەکانی و تیایاندا قووڵ ببینەوە ، پێویستمان بە کۆمەڵێك بۆچوونی فەلسەفی هەیە تا لەرێگەیانەوە بتوانین زۆرترینی شیعرەکانی مەحوی راڤەبکەین و بزانین چ مەسەلەیەکی گەورە ئاوا مەحویی خەریککردووە و وای لێکردووە زۆربەی جار ئەو واتایەی یان ئەو بیرەی ویستوویەتی دەری ببڕێت ، شیعر نەیتوانیووە دەری ببڕێت و تەنها لایەنێکی کەمی واتاو مەبەستەکەی هاتووەتە ناو شیعرەکەوەو زۆر مەبەست و واتای هەر بە نەگوتراوی ماونەتەوەو پێویستە لە پشت دێڕەکانەوە نەگوتراوەکان بە دەست بهێنرێت . لێرەدا ئەوە دەردەکەوێت کە جیهانی شیعرەکانی مەحوی جیهانێکی فراوانەو چەند زیاتر لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێت ، ئەوەندە زیاتر ئەو دنیایە کەشف دەکرێت و هەست بە گەورەیی و دنیابینییە فراوانەکەی مەحوی دەکرێت . ئەمانە وایان کرد ئەم لێکۆڵینەوەیە لەژێر ناوی (بوون لە شیعری مەحوی)دا بنووسرێت ، چونکە هەستدەکرێت ئەگەر مەحوی لە قۆناغێك لە قۆناغەکانی تەمەنیدا سۆفی بووبێت و بە کۆمەڵێك ذیاردەو رێورەسمی سۆفیگەرییەوە خەریکبووبێت ، ئەوا ئەم قۆناغەی تێپەڕاندووەو بەرەو ناوەوەی خۆی گەڕاوەتەوەو بە مەسەلەی (بوون)ی خۆیەوە خەریکبووە . روونکردنەوەی ئەم مەسەلەی (بوون)ەش لە شیعرەکانی مەحویدا بە سوودوەرگرتن لە بۆچوونە فەلسەفییەکانی کۆمەڵێك فەیلەسووف و بە تایبەتیش فەیلەسووفە بوونگەراکان دەبێت .

لێکۆڵینەوەکە لە سێ بەش پێکهاتووە :

**بەشی یەکەم** : بە ناوی ( بوون و رەنگدانەوەی بوون لە شیعری مەحویدا)یە : سەرەتا لە رووی تیۆرییەوە باسی بوون کراوە لای هایدگەر ، هەروەها لە روانگەی هیگڵەوە باسی ئاستەکانی بوون کراوەو ، دواتریش باسی جۆرەکانی بوونك راوە لای هایدگەر . پاشان

کار لە سەر ئەو شیعرانە کراوە کە بوون و ئەو مەسەلانەی پەیوەستن بە بوونەوە تیایاندا رەنگی داوەتەوە .

**بەشی دووەمیش** : کە بە ناوی ( عیشقی بوون و رەنگدانەوەی لە شیعری مەحویدا) یە: سەرەتا باسی عیشق کراوە لای ئەفلاتوون و لە روانگەی بۆچوونەکانی ئەفلاتوونەوە باسی عیشق و ئەو مەسەلانە کراوە ، کە پەیوەستن بە عیشقەوە لە شیعرەکانی مەحویدا .

**بەشی سێیەمیش** : کە بەناوی ( عەدەم و رەنگدانەوەی عەدەم لە شیعری مەحویدا)یە: سەبارەت بە (عەدەم)ە . سەرەتا لە رووی تیۆرییەوە باسی عەدەم کراوە لای هایدگەر ، ئنجا باسی دنیاو هۆی وازهێنانی مەحوی لە دنیاو کەوتنە عەدەم و دەرکەوتنی (یار - بوون) کراوە .

لە کۆتاییشدا گرنگترین ئەو ئەنجامانەمان خستووەتەڕوو کە لەم لێکۆڵینەوەیەدا پێیان گەیشتووین و دواتر لیستی سەرچاوەکانمان نوسیوە .

**ڕێبازی لێکۆڵینەوەکە** :

ئەو رێبازەی لەم لێکۆڵینەوەیەدا گیراوەتە بەر زیاتر رێبازێکی شیکاریە بە سوود وەرگرتن لە کۆمەڵێك چەمك و بۆچوونی فەلسەفەی بوونگەرایی ، بە تایبەتی زیاتر سوود لە چەمك و بۆچوونەکانی مارتن هایدگەر وەرگیراوە .

**گیرو گرفتی لێکۆڵینەوەکە**:

ئەو گیروگرفتانەی لەم لێکۆڵینەوەیەدا هاتوونە رێگەمان ، زیاتر نەبوونی سەرچاوەی کوردی بوو لەسەر بابەتەکە کە بتوانین بۆ ئەم لێکۆڵینەوەیە سوودیان لێ وەربگرین ، چونکە ئەو لێکۆڵینەوانەی لەمەوپێش لەسەر شیعرەکانی مەحوی کراون ، کۆمەڵێك پێوەری ئایینی و سۆفیگەرییان هێناوەو هەوڵیان داوە شیعرەکانی مەحوی لەگەڵ ئەو پێوەرانەدا بگونجێنن[1] ، یان هەندێکی تر ویستویانە مەحوی وا پیشان بدەن کە لە شیعرەکانیدا لەو پێوەرە ئایینیانە

(1) بۆ نموونە د. ئیبراهیم ئەحمەد شوان لە نامەی دکتۆراکەیدا بەناوی (شیعری ئایینی و سۆفیگەری لە شیعرە کوردیەکانی مەحویدا) بەمجۆرە لە شیعرەکانی مەحویی کۆڵیوەتەوە .

لایداوه[1]، یاخوود هەندێکی تر هەوڵیانداوه مەحوی وا پیشان بدەن کە هەستی بە گوناهکردووەو شاعیرێکی مەرگدۆست و رەشبینبووه[2] . ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی لە شیعرەکاندا قووڵ نەبنەوەو تەنها ئەو شیعرانە وەرگرن کە لەگەڵ پێوەرەکانیاندا دەگونجێن و ئێمە نەتوانین بۆ شیکردنەوەی شیعرەکان سوودیان لێ وەربگرین . بۆیە ئێمە هەوڵمانداوه بە شیعرەکاندا رۆبچین و تیایاندا قووڵ ببینەوەو لە پشت گوتراوی شیعرەکانەوه نەگوتراوەکان بەدەستبهێنین و پێوەرەکان لە خودی شیعرەکانەوه وەرگرین . بۆ ئەنجامدانی ئەم کارەو وەرگرتنی کۆمەڵێك چەمك و زاراوە تا لەرێگەیانەوه شیعرەکان شی بکەینەوه ، ناچاربووین پەنابەرینە بەر بۆچوونی فەیلەسووفە بوونگەراکان و چەند فەیلەسووفێکی تری وەك هیگڵ و ئەفلاتوون و نیچه.

(1) بۆ نموونە د . ئەحمەدی مەلا لە نامەی دکتۆراکەیدا بە ناوی (مەحوی لەنێوان زاهیرییەت و باتینییەت و سەرچاوەکانی عیشق و وێنەی مەعشووقدا) بەمجۆرە لە شیعرەکانی مەحویی کۆڵیوەتەوه .

(2) وەك مەریوان وریا قانیع و بەختیار عەلی و هەندێ نوسەری تر ...

# بوون چییه ؟

پێش ئەوەی وەڵامی ئەو پرسیارە بدەینەوە کە (بوون) چییە ، گرنگە ئەوە بزانین بە شێوەیەکی گشتی بیرکردنەوەمان زیاتر بەو شتانە ئاشنایە کە بەرجەستەن ، واتە شتانێکی کۆنکرێتی و دیارن و ئاسان پێیان ئاشنا دەبین و لێیان تێدەگەین . ئێمە بەو قسانە راهاتووین کە ئەوە درەختێکە لەبەردەمماندا ، یان ئەوە کەسێکە ، وەك شتێکی بەرجەستە درەخت یان کەسێك دەزانین چین ، بەڵام لامان قورسە بیر لە (بوون)ی کەسەکە ، یاخود بیر لە (بوون)ێکی پەتی بکەینەوە ، یان بیر بکەینەوە لە گوتراوی (بوون) بەگشتی ، (بوون) بەوەی کە (بوون)ەو بەشێوەیەکی هەستەکی لەم شت یان لەو شتدا بەرجەستە نابێت[1]. بیرکردنەوە لەمەو زانینی ئاسان نییە، بۆیە پێویستمان بە جیهازێکی وێناکردنی تایبەت هەیە کە جیاواز بێ لەو وێناکردنانەی لە رێگەیانەوە لە مەوجود تێدەگەین ، تا بتوانین لە رێگەیەوە لە (بوون) تێبگەین . واتە پێویستمان بەوە هەیە بیرکردنەوەو هۆشمان ئامادەکەین بۆ زانین و تێگەیشتنی ئەوەی بە (بوون) ناودەبرێت کە پەتییەو بەرجەستە نییەو هەوڵبدەین بتوانین وێنای بکەین . سەرەتا دەبێت ئەوە بزانین ، بوون شتێك نییە لەبەرامبەرماندا بێت و پێمان نامۆبێت ، دیمەنێك یان دیاردەیەك نییە لەبەر دەمماندا بێت ، یاخود بابەتێك نییە لەبەردەستماندا کە بتوانین لێکی بدەینەوەو بیپشکنین ، وەك چۆن زانایەکی رووەکناس لە درەختێك دەکۆڵێتەوە کە لەبەر دەستیایەتی . واتە سەرەتا ((وا هەست دەکرێت کە بوون شتێکی شاراوەو نادیارە ؛ بەو مانایەی هەر لە یەکەم ساتەوە وادیارە کە دەرناکەوێت و لێمان بزرە))[2]. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا بوون شتێکە کە دەوری داوین و کیانمان پێك دەهێنێت ، مرۆڤیش دیاردەیەکە لە دیاردەکانی بوون و لە کات و شوێنێکی دیاریکراودایە . ئەوەی لە بوون دەکۆڵێتەوە ، ناتوانێ ئەوە فەرامۆش بکات کە خۆیشی بوونێکە ، کەواتە ((بوون ناوێکی هاوبەشە لە نێوان هەموو شتەکانداو خودی ئەو پرسیارکەرەش دەگرێتەوە کە لە بارەی واتای بوونەوە پرسیار دەکات . بۆیە ئەستەمە لە دەرەوە بڕوانرێتە بوون))[3]. بەم پێیە بوون لە هەموو شوێنێکدایەو هەر مەوجودێك جۆرە بوونێکی هەیە ، وەك بوونی شت ، بوونی ئامراز ، بوونی

---

(1) بروانه : موسوعة العلوم الفلسفية (المجلد الثانی) ، هیجل ، ت : ا. د. امام عبدالفتاح امام ؛ مکتبة المدبولی ـ القاهرة ، بدون ط ، س ١٩٩٧ ؛ ص ٥٥.

(2) المذاهب الوجودية ، ريجيس جوليفيه ، ت : فؤاد كامل ، دار الآداب ـ بيروت ؛ ط ١ ؛ س ١٩٨٨ ، ص ٦٥ .

(3) اشكالية الوجود والتقنية عند مارتن هيدجر ، ابراهيم احمد ، منشورات الاختلاف ، الجزائر ، ط ١ ؛ ٢٠٠٦ ، ص٧٠.

مرۆڤ...هتد[1] . واتە هەموو مەوجودێك بوونی هەیە ، بۆیە دەڵێین بوونی مرۆڤ و بوونی ئاژەڵ و بوونی کانزاو رووەك و...هتد . ئەمانە هەموویان هەن و بە مەوجود ناو دەبرێن ، ئەوەی وایان لێدەکات هەبن ، خۆیان نین بەڵکو بوونیانە . بەم پێیە ئەوە بوونە رێگە بە هەموو مەوجودەکان دەدات هەبن و بوونیان هەبێت ، ئەم بوونە بوونی یەکەمە ، رەسەنە ، یاخود دەتوانرێت بووترێت بوونی گشتییە یان بوونی رەهایە[2] . لێرەدا بوون واتایەکی گشتیی هەیە ، بەڵام پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە مەبەستمان لە (بوون) ، بوون نییە بە شێوەیەکی گشتی ، بەو واتایەی کە هەموو بوونەوەرو خودی گەردوون بگرێتەوە ، بەڵکو لەڕوانگەی فەلسەفەی بوونگەراییەوە باس لە (بوون) دەکەین و ((بوونگەراکان وشەی (بوون ـ Existence ) بە شێوەیەکی سنووردار بەکار دەهێنن ، بەجۆرێك کە تەنها بەسەر ئەو شێوەیەی بووندا دەچەسپێ کە لە بوونی مرۆییدا دەیناسین))[3] . واتە ئەو (بوون)ەی کە ئێمە باسی دەکەین (بوون)ی مرۆڤە ، چونکە (بوون)ی راستەقینە ئەو (بوون)ەیە کە تایبەتە بە مرۆڤ . لێرەدا بۆ روونکردنەوەی هەر یەك لە مرۆڤ و ئەو بوونەی تایبەتە بە مرۆڤ ، پێویستە ئەوە بزانین کە هەر یەك لە مرۆڤ و بوون چین ؟ مرۆڤ لە رواڵەتدا مەوجودێکەو وەکو هەر مەوجودێکی تر (دار ، ئاژەڵ ، شاخ ...هتد) لەهەمەکییەتی بووندا شوێنی خۆی هەیە . کە دەڵێین شوێنی خۆی هەیە ، مەبەستمان ئەوەیە لە رێکخستنی بووندا هاوبەشی دەکات و تێیدا بەشدارە . بەڵام مرۆڤ بەو پێیەی مەوجودێکی بیرکەرەوەیەو بەڕووی بووندا کراوەیەو پێوەی پابەندە ، زیاتر لەگەڵ بووندا دەگونجێت ، ئەمەش سیمایەکی دیارو جیاکەرەوەی مرۆڤە وەك مەوجودێك لە مەوجودەکانی تر[4] . جگە لەمە ، مەوجودی ئینسانی بەوە لە مەوجودەکانی تر جیا دەبێتەوە ، کە گرنگی بە بوونی خۆی دەدات و لە بارەی بوونی خۆیەوە پرسیار دەکات . بەمە دەبێتە پرسیارکەر ، ((بوونی ئەم پرسیارکەرەش لە هەموو مەوجودەکانی تر جیایە ، چونکە لە پەیوەندییەکی بەردەوامدایە لەگەڵ خۆیدا))[5] ، واتە پەیوەستە بە خودی خۆیەوەو

---

(1) بڕوانە : هـ . س ، ل ٧١ .

(2) بڕوانە : نداء الحقيقة ، مارتن هايدجر ، ت: أ. د. عبدالغفار المكاوى ، دار الشرقيات للنشر والتوزيع ، القاهرة ، ط ١ ، سنة ٢٠٠٢ ، ص ١١٦-١١٧ .

(3) بڕوانە : فەلسەفەی بوونگەرایی، جۆن ماکواری ، و: ئازاد بەرزنجی، چاپخانەی رەنج ، سلێمانی ، چ ١ ، ٢٠٠٥، ل٣٤.

(4) بڕوانە : مبدأ الهوية ، مارتن هيدجر ، ت : آمال ابى سليمان ، مجلة العرب والفكر العالمى ، العدد الرابع ، سنة١٩٨٨،ص ٣٧ .

(5) نداء الحقيقة ، مارتن هيدجر ، ص ٦١ .

سنووردارو چەسپاو نییە ، بەڵکو بریتییە لە توانای بوون و عیبارەتە لەوەی کە دەتوانێت بەدیبهێنێت و ئەمانەش بەپێی چۆنییەتیی ئیمکانەکانی دەبن ، لەمەوە خۆ خەریککردن و سەرقاڵبوون بە عالەم و ئەوانی ترەوە سەرهەڵدەدات ، ئەم خەریکبوونە مەسەلەیەکە کە لە بناغەدا پەیوەستە بە ئیمکانە تایبەتییەکانییەوە[1] . واتە خەریکبوونی بەعالەم و مەوجودەکانی ترەوەو تێکەڵبوون و هەڵسوکەوتکردنی لەگەڵ خەڵکانی تردا ، بۆ ئەوەیە ئیمکانەت و تواناکانی بوونی خۆی بەدەست بهێنێت . واتە مەوجودی ئینسانی پێش هەموو شتێك گرنگی بە بوونی تایبەتی خۆی دەدات و دەیەوێت خاوەنی بوونێکی تایبەت بە خۆی بێت ، کە هایدگەر بە (بوونی من ، یان بوونی تایبەتی من ـ jemeinigkeit ) ناوی دەبات . واتە هەر مرۆڤێك خاوەنی (بوونی من)ێکی تایبەت بە خۆیەتی[2]، کە ئەمە لە مەوجودەکانی تری جگە لە مرۆڤدا نییە . ئەگەر سەیری مانای فەرهەنگیی وشەی (بوون) بکەین کە لاتینییەکەی (Existence )ە لە دوو برگە پێکدێت : (EX) واتە دەرەوە، (sistere) واتە دەوەستێت . لێرەدا فرمانی (هەیە ـ ex - sist) یان (exsist) لە فرمانی لاتینیی (exsistere)ەوە وەرگیراوە ، کە واتای دێتە دەرێ یان دەردەکەوێت دەگەیەنێت . دەردەکەوێت واتای ئەوە دەگەیەنێت شتێك کە هەبێت ، لە زەمینەیەکی دیاریکراوەوە دێتەدەرێ[3] . واتە ئەو (بوون)ەی کە دەردەکەوێت کۆمەڵێك ئیمکانەو لە ئایندەدا دێنەدی . کەواتە «پێویستە بوترێت بوون بریتییە لە ئیمکانەتەکانی»[4] . لەناو هەموو بوونەوەرەکانیشدا تەنها مرۆڤ بەمانا راستەقینەکەی ئەم وشەیە بوونی هەیە ، واتە تەنها مرۆڤ کۆمەڵێك ئیمکان لە ناویدا هەن و بەدییان دەهێنێت و لە بوونەوەرەکانی دی و هەموو ئەو سروشت و دەوروبەرەی تیایدا دەژی جیاوازە[5] . هەموو ئەو شتانەی دیکەی دەوروبەری مرۆڤ بە گیاندارو بێگیانەوە ، بەو جۆرەی مرۆڤ (بوون) ی هەیە ، ئەوان نیانە «بەرد هەیە ، بەڵام (بوون)ی نییە. درەخت هەیە ، بەڵام (بوون)ی نییە . ئەسپ هەیە ، بەڵام (بوون)ی نییە. سێگۆشە هەیە ، بەڵام (بوون)ی نییە»[6] . کە دەڵێین

---

(1) المذاهب الوجودية ، فؤاد كامل ، ص ٧٨.

(2) بڕوانە : نداء الحقيقة ، مارتن هايدجر ، ص ٦٦.

(3) بڕوانە: نداء الحقيقة ، مارتن هايدجر ، ص ٨٢ ، هەروەهافەلسەفەی بوونگەرایی ، جۆن ماکواری ، ل ٧٣ .

(4) المذاهب الوجودية ، ريجيس جوليفيه ، ص ٦٧.

(5) بڕوانە : موسوعة العلوم الفلسفية (المجلد الثانى) ، هيجل ، ص ٢٦٢.

(6) بڕوانە : سورين كيركجارد ـ مؤسس الوجودية المسيحية ، د. على عبدالمعطى محمد ، دار المعرفة الجامعية ـ الأسكندرية ، بدون ط ، س ١٩٨٥ ، ص ١١٤.

(بوون)یان نییە مەبەستمان ئەوە نییە کە ئەوانە نین ، بەڵکو مەبەستمان ئەوەیە بوونی ئەوان وەك (بوون)ی مرۆڤ نییە . راستە ئەوانیش هەن ، بەڵام مرۆڤ بە مانایەکی قووڵتر و دوورتر لەوان هەیە ، چونکە مەوجودێکە دەچێتە ناو پەیوەندی لەگەڵ بوونی خۆیداو توانای ئەوەی هەیە گەشەی پێ بدات ، تەنانەت توانای ئەوەی هەیە لەگەڵ مەوجودەکانی تردا پەیوەندی ببەستێت . مەوجودەکانی تری جگە لە مرۆڤ راستە هەن ، بەڵام ئەوان خاوەنی ئەو توانایە نین کە لەگەڵ خۆیاندا بکەونە پەیوەندییەوەو دەرك بە بوونی خۆیان بکەن[1]. واتە مرۆڤ تاکە مەوجودێکە ، نەك هەروەك مەوجودێك دەردەکەوێت ، بەڵکو هەست بە (بوون)ی خۆی دەکات و بە هوشیارییەوە دەزانێ کێیەو چییەو کێ دەبێت و چی دەبێت و لە هەرساتێکدا ئەو حاڵەتەی خۆی تێدەپەڕێنێت کە تیایەتی ، واتە سروشتێکی ناجێگیری هەیەو بەردەوام لە گۆڕان و گەشەکردن و بەرەوپێشچووندایەو لە (بوون)ی خۆی رادەمێنێت و بەرەو بەدیهێنانی ئیمکانەکانی (بوون)ی خۆی دەچێت . بەم پێیە ((تەنیا مرۆڤ هوشیاری بە بوونی خۆی هەیە))[2]. بەڵام گیانەوەرو شتەکانی دەوروبەری مرۆڤ ، کۆمەڵێ سیفەتی دیاریکراو و جێگیریان هەیە کە پێوەی پەیوەستن ، نازانن چین و کێن و توانای رامانیان نییە لە (بوون)ی خۆیان ، واتە ((بوونی گیانەوەر ، بوونێکە کە هوشیاری بەخۆی نییە ، بەمە لە ئاستێکی نزمتری بووندایە))[3]. ئەگەر مرۆڤ لەگەڵ ئاژەڵ و گیانەوەرەکانی دەوروبەری لەوەدا لەیەك بچن کە لەڕێگەی یاساکانی سروشتەوە گۆڕان و گەشەکردن تیایاندا روودەدات ، ئەوا مرۆڤ بە جۆرێك لەجۆرەکان ، لە بارێکدا لەوان جیاوازەو لەڕێگەی ئەو وێنانەوە کە لە بارەی خۆیەوە دروستیان دەکات ، خۆی تێ دەپەڕێنێت و هەوڵی بەدیهێنانی ئەو وێنانە دەدات و گۆڕان و گەشەکردن تیایدا روودەدات . بەڵام ئەم بارە لە ئاژەڵ و گیانەوەرو مەوجودەکانی تردا نییە . جگە لەمە ، ((بابەتگەلێك هەن کە راستەوخۆ پەیوەستن بە بوونی مرۆڤەوەو وای لێدەکەن بوونێکی ناوازەی هەبێت و جیاواز بێت لە هەموو بوونەکانی تر ، وەك : **ئازادی و هەڵبژاردن و بڕیاردان و بەرپرسیاریەتی و** ...هتد))[4]. ئازادی یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی مرۆڤ و پێویستی بە لەسەر وەستان هەیە ، چونکە لە فەلسەفەی

(1) بڕوانە : نداء الحقيقة ، مارتن هايدجر ، ص ٦٤.

(2) اشكالية الوجود والتقنية عند مارتن هيدجر ، ابراهيم احمد ، ص ٧١.

(3) هـ . س ، هـ . ل .

(4) بڕوانە : فەلسەفەی بوونگەرایی ، جۆن ماکواری ، ل ١٩.

بوونگەراییدا بایەخێکی زۆر بە ئازادی دراوە ، بە تایبەتی هایدگەر لەڕوانگەیەکی جیاوازەوە باسی ئازادی دەکات . هایدگەر پێیوایە ئازادی ڕێگە بە مەوجود دەدات ، بەو جۆرە بێت کە خۆی لەسەریەتی ، یاخود خۆی چۆنە ئاوابێت . واتە ئازادی بریتییە لەوەی واز لە مەوجود بهێنیت ، ببێت . لێرەدا باس لە وازهێنان کراوە ، وازهێنانیش کاتێك باس دەکرێت کە بۆ نمونە پرۆژەیەکمان هەیە ، بەلاّم دەستی لێ هەلّدەگرین و ئەنجامی نادەین یان تەواوی ناکەین ، واتە ئیتر دەستی لێ نادەین و خۆمانی پێوە خەریك ناکەین ، لەم حالّەتەدا وازهێنان واتایەکی سلبیی هەیە . بەلاّم ئەو وازهێنانەی لێرەدا باس دەکرێت ، مەبەست لێی گوێ پێنەدان نییە ، بەلّکو ڕێك پێچەوانەی ئەمەیە ، واتە وازهێنان لە مەوجود بۆئەوەی ببێت ، ئەو مەبەستە دەگەیەنێت خۆمانی بۆ تەرخان بکەین . دیسان نابێت وا لەمەش تێ بگەین کە تەنها بریتییە لە هەلّسوکەوتکردن لەگەلّ مەوجودەکەدا ، هەروەك چۆن تەنها پاراستن و ڕێکخستنی مەوجودەکە نییە ، بەلّکو واتای ئەوەیە مرۆڤ خۆی بۆ ئەو کرانەوەیە تەرخان بکات کە هەموو مەوجودێك تێی دەچێت و تیایدا ئارام دەگرێت و لەم کرانەوەیەدا مەوجودەکە خۆی چۆنە ئاوا دەردەکەوێت . ئەم کرانەوەو دەرکەوتنەی مەوجود بە (ناپۆشین - اللاتحجب - ئەلیثیا ) ناو دەبرێت . لێرەدا ئەوە دەردەکەوێت کە ئازادی واتای هەلّبژاردنی ئەم لایەن یان ئەو لایەن نییە ، هەروەها مانای ئەوە نییە کەسێك پابەند نەکرێت بەوەی شتێك بکات یان نەیکات «واتە لە ئەسلّدا ماهییەتی ئازادی هیچ پەیوەندییەکی بە ویست(ئیرادە)وە نییە»[1] ، بەلّکو ئازادی ، پێش ئەمانە خۆتەرخانکردن یاخود چوونە بەرەو ئاشکرابوونی مەوجود وەك خۆی ، بەم خۆتەرخانکردنە دازاین خۆی چۆنە ئاوا دەردەکەوێت . مرۆڤ لە ڕێگەی ئازادییەوە ، واتە لەو حالّەتەدا کە ئازادەو لەژێر دەسەلاّت و کاریگەری هیچ کەس و بابەتێکی دەرەوەی خۆیدا نییە ، دەتوانێت خۆی چۆنە ئاوا دەربکەوێت و سەربەستانە هەلّبژاردن ئەنجام بدات ، چونکە «بوونی مرۆڤ ئەوەیە خۆی هەلّبژێرێت»[2] . هەلّبژاردن بەو مانایەی خۆی ئەوە هەلّدەبژێرێت چی و چۆن بێت و خۆی بڕیار لەسەر ئەو چییەتی و چۆنیەتییەی خۆی دەدات ، مەبەستیش لەم هەلّبژاردن و بڕیاردانە ئەوەیە

---

(1) الفلسفة فی مواجهة العلم والتقنية ، مارتن هيدجر ، ت : د. فاطمة جيوشي ، وزارة الثقافة ، سوريا - دمشق ، س ١٩٨٨ ، ص ٨١ .

(2) الوجود والعدم ، جان بول سارتر ، ت : عبدالرحمن البدوي ، منشورات دار الآداب - بيروت ، ط ١ ، س ١٩٦٦ ، ص ٧٠٤ .

واز لـەخۆی دەهێنێـت چـی لەباردایـەو چـۆنە ، بـەو جـۆرە بێـت ، واتـە ڕێگـە بـە ئیمکانـەکانی خـۆی دەدات بـەدی بـێن . ئەمـەش لـە هەسـتکردن بـە بەرپرسـیاریەتی بەرامبـەر بـوونی خـۆی دەکـات و لـە ڕێگـەی ئەمانـەوە بـەرەو ئـەوە دەچـێت خـودی ڕاستەقینەی خۆی بەدی بهێنێت.

وەك وتمان لە ڕوانگـەی فەلـسەفەی بوونگەراییـەوە باسـی (بـوون) دەکـەین ، فەلسەفەی بوونگەراییش لە مرۆڤەوە دەست پێدەکات وەك (مەوجود)ێـك کـە خـاوەنی کردەو هەست و ویژدانە ، نەك تەنها وەك بیرکەرەوەیـەك . ئـەم جـۆرە فەلـسەفەیە لـە سروشت و ماهییەتی مرۆڤ ناکۆڵێتەوە تا لە ئەنجامدا کۆمـەڵێك بۆچـوون لەسـەر مـرۆڤ بەدەست بهێنێت ، چونکە ناتوانین سەرەتا سروشت و ماهیەتی مرۆڤ دیاری بکـەین و پاشـان لـە بارەیـەوە ئـەنجامگیری بکـەین ، ئەمـەش لەبەرئەوەیـە مـرۆڤ ماهیـەتێکی دیاریکراوی نەگۆڕو پێشوەختی نییە ، بۆیە لە (بـوون)ی مرۆڤـەو دەسـت پێـدەکات و لـەو (بـوون)ە دەکۆڵێتـەوە ، چـونکە «بـوونی مـرۆڤ پـێش ماهیەتیـەتی»[1] . مەبەسـت ئەوەیە مرۆڤ سەرەتا دەبێت ، دواتر بە هۆی ئەو (بوون)ەوە ماهیەت بە خۆی دەدات و دیاری دەکرێت و دەناسرێت ، واتە ڕووبەڕووی خۆی دەبێتـەوەو دەچـێتە نـاو جیهـانی دەوروبەری و ئیمکانەکانی خۆی بەدی دێنێت و خۆی دەناسێت و بەو شێوەیە دەبێت کە خودی خۆی ، خۆی دیاری دەکات .

## ئاستەکانی بوون

دەتـوانین بـوونی مـرۆڤ و دەرکـەوتن و بەرجەسـتەبوونی بەسـەر دوو قۆنـاغ ، یاخود بەسەر دوو ئاستدا دابەش بکەین ، ئەوانیش بریتین لە :

**ا ـ بوون لە خۆیدا (یان بوون بەهێز) :**

بوون لـەم ئاسـتەدا ، یاخود لـەم بـارەدا تـەنها وەك ئیمکانێك یان تواناداربیەك ، یاخود وەك تۆوێك وایە کە هێشتا پەرەی نەسـەندووەو لـە دۆخی شاراوەییدایەو ناتوانرێت هەستی پێ بکرێت و دیاری بکرێت ، چـونکە بوونـە لـە خۆیدا ، واتە بوونێکە تەنها لە ناو خۆیدایـەو هێـشتا لـە دەرەوە یـاخود لـەناو عالەمـدا دەرنەکەوتووە . ئەم بوونـە لەوانەیـە هـەڵگری زۆر توانـاو داهێنـان و شـتی دەگمـەن و

---

(1) الوجود والعدم ، سارتر ، ص ٧٠٢ .

سەرنج راكێش بێت ، بەلاّم لەبەرئەوەی بواری بۆ نەڕەخساوە ئەوەی لە هەناویدایە لە دەرەوە بەدیی بهێنێت و بەرجەستەی بكات ، تەنها وەك توانایەك تیایدا هەن و شتانێكی شاراوەن و دەرنەكەوتوون[1] .

ئەگەر بمانەوێت روونتر لە (بوون لە خۆیدا) بگەین ، دەتوانین تۆوی رووەك یان درەخت بەنموونە بهێنینەوە . تۆو لەخۆیدا شتێكی سادەیە ، زۆر تۆو هەیە تەنها وەك خاڵێك دەردەكەوێت ، هیچ سیفەت و رەنگ و روویەكی وای نییە كە سەرنج راكێش بێت ، لە كاتێكدا ئەم تۆوە هەموو سیفەت و تایبەتمەندی و پێكهێنەرەكانی درەختی لەناودایە . قەدو لق و گەڵاو رەنگ و بۆن و چێژو ...هتد هەموو ئەمانە لە ناو ئەو تۆوەدا هەن ، بەلاّم هێشتا بەرجەستە نەبوون و بەدی نەهاتوون ، واتە هێشتا تۆوەكە ئەو زەمینەیەی بۆ نەڕەخساوە كە خۆی تیادا بەدیبهێنێت و ئەو توانایەی ناوی پەرە پێبدات كە لە (قەد و لق و گەڵاو...هتد)دا بەرجەستە دەبن .

سەبارەت بە مرۆڤیش دەتوانین نمونەیەكی روونتر بهێنینەوە : ئەویش گوتراوی (من)ە . ئەم وشەیە كاتێك كەسێك دەری دەبڕێت و دەڵێت (من) ، زۆر سادەیەو هەموو كەسێك دەتوانێت بڵێت من ، بەلاّم ئەم (من)ە هەڵگری سامانێكی زۆرە لە داهێنان و بیرو بۆچوون و هەست و سۆزو حەزو ئارەزوو و رق و خۆشەویستی وخۆشی و ناخۆشی و ... هتد. هەموو ئەمانە لەو پنتەدا كۆبوونەتەوە كە (من)ە . بۆیە دەتوانین بڵێین: ((ئەم (من)ە هێزێكە ، یان بیرۆكەیەكی سەراپاگیرە (یان حەقیقەتێكی بنەڕەتیە) بۆ هەموو ئەوەی كە مرۆڤ لە ناو خۆیدا پەرەی پێ دەدات))[2] . واتە هەموو ئەوانەی لە رەوتی پەرەسەندنی مرۆڤدا دەردەكەون و تیایدا بەرجەستە دەبن ، پێشتر وەك ئیمكانێك و توانایەك تیایدا هەبوون ، بەلاّم دەرنەكەوتبوون و بە شاراوەیی تیایدا مابوونەوە ، چونكە لەم بارەدا ئەو مرۆڤە هێشتا بوونە لە خۆیدا ، واتە ئەوەی لە باریدایە هێشتا وەك توانایەكە تیایداو دەرنەكەوتووە . بۆیە گرنگە سەبارەت بە بوون لەخۆیدا ((ئەوە بزانین شتێكی سادە هەیەو لە ناو خۆیدا لەسەر فرەیی پێكهاتووە . بەلاّم هێشتا بە ئاشكرا دەرنەكەوتووە))[3] و هەر كاتێك زەمینەی بۆ رەخسا ئەو سادەییە تێ دەپەڕێنێت و فرەییەكەی بەرجەستەو ئاشكرا دەكات .

---

(1) بڕوانە : محاضرات هيجل في تاريخ الفلسفة ( المجلد الثالث) ، هيجل ، ت : ا. د. امام عبدالفتاح امام ، مكتبة المدبولي - القاهرة ، بدون ط ، س ١٩٩٧ ، ص ١٩٧ .

(2) هـ . س ، ل١٩٨ .

(3) هـ . س ، ل ١٩٩ .

**٢ ـ بوون بۆخۆی (یان بوون به کرده):**

لەم بارەدا ئەوەی وەك ئیمکانێك ، یان وەك توانایەك لە بوون لەخۆیدا ( یان بوون بە هێز)دا هەیە ، پەرە دەسێنێت و دەردەکەوێت[1]. واتە (بوون) دەکەوێتە بەرجەستەکردن و بەدیهێنانی هەموو ئەوانەی وەك تواناداریيەك تیایدا هەن و خۆی دەسەلمێنێت و دەچێتە بواری (بوون)ی پراکتیکییەوەو بەرەو ئەوە دەچێت ببێتە شتێکی جیاوازو ناوازەو لە ئیمکانەوە ببێتە شتێکی بەرجەستەو ببێت بە (بوون لێرە) ، واتە ببێتە بوونێکی بەرچاو و ئەو توانایانەی تیایدا هەن دەریان بخات[2]. بۆ نمونە دەوترێت مرۆڤ بە سروشت عاقڵە ، واتە بەوەی کە مرۆڤە خاوەنی عەقڵە ، ئەو هەر بە زگماکی خاوەنی عەقڵ و تێگەیشتن و خەیاڵ و ئیرادەیە ، تەنانەت لە سکی دایکیشیا هەر خاوەنیانە . بەڵام ئەوەی بە کردە لای منداڵ هەیە عەقڵ نییە ، بەڵکو تواناداری عەقڵە ، ئەو عەقڵێکی پەنهانی هەیە جارێ دەرنەکەوتووە ، ئەمەش یەکسانە بەو گوتەیەی ئێمە کە دەڵێین عەقڵی نییە ، لەبەرئەوەی توانای ئەوەی نییە هەڵسوکەوتی عاقڵانە بکات ، کەواتە جارێ عەقڵی نییە یاخود بڵێین جارێ عەقڵی دەرنەکەوتووە . بەڵام کاتێك منداڵ گەشە دەکات و دەچێتە قۆناغی گەنجییەوەو پاشان دەبێت بە پیاو ، عەقڵی دەست بە دەرکەوتن دەکات و لە هەڵسوکەوتی عاقڵانەی ئەودا رەنگ دەداتەوەو بەدی دێت . ئەمەش مانای وایە ، ئەوەی لە سەرەتادا لای مرۆڤ شاراوەو پەنهانە ، لەو کاتەدا کە گەورە دەبێت ، دەبێتە شتێکی ئاشکرا و دیار ، یان دەتوانین بڵێین (بوون لە خۆیدا) دەبێت بە (بوون بۆ خۆی)[3]. هەروەها مرۆڤ دەتوانێت هەموو توخم و لایەنەکانی تری وەك ( بیرکردنەوەو هەست و سۆزو خۆشەویستی و ئارەزوو... هتد) کە وەك توانایەك تیایدا هەن ، بەدییان بهێنێت و تواناداری خۆی بسەلمێنێت و لە(بوون بە هێز)ەوە ببێت بە(بوون بەکردە) و وەك (مەوجود)ێك خۆی بناسێت کە جیاوازە لە (مەوجود)ەکانی دی و بە چەند پەیوەندییەکی دیاریکراو پەیوەست دەبێت پێیانەوە[4]. ئەمەش لەکاتێکدا دەبێت کە زەمینەی بۆ رەخسا بێت و ئازاد بێت ، چونکە ئازادی مەرجی بنەڕەتیی بەدیهاتنی (بوون)ە لە رێی پراکتیزەکردن و

---

(1) بروانە : هـ . س ، ل ٢٠٠ .

(2) بروانە : هـ . س ، ل ٢٠١ .

(3) بروانە : هـ . س ، ل ٢٠٢ .

(4) بروانە : موسوعة العلوم الفلسفية (المجلد الثانی) ، هیجل ، ص ٢٦٢ .

خستنەگەڕی تواناکانییەوە . بەبێ ئازادی ، (بوون لەخۆیدا) ناتوانێت خۆی چۆنەو چی لە باردایە ، ئاوا خۆی بەدی بهێنێت و ببێتە (بوون بە کردە) ، چونکە ئازادی ئەو بوارەی پێ دەدات کە خۆی چ جۆرە توانایەکی تێدا هەیە ، بەو جۆرە پەرە بسێنێت و دەربکەوێت . واتە بە شێوەیەکی سروشتی گەشە بکات و خۆی بەدی بهێنێت و ببێتە (بوون)ێکی دیار و ، لە دەوروبەرو بوونەکانی دی جیاواز بێت . لێرەدا ئازادی دەبێتە خاسیەتێکی ئەو بوونەو ئەو راستیە دەسەلمێنێت کە دەڵێت : ((مرۆڤ ئازادە ، ئەمە سروشتیەتی و ئازادی تایبەتمەندییەکی پەیوەستە بە ماهیەتیەوە))[1] . واتە ئازادی بەشێکی جیا نەکراوەیە لە (بوون) ی مرۆڤ و لە رێگەی ئەم ئازادییەوە (بوون)ی راستەقینەی خۆی بەدی دێنێت .

لە کۆتایدا دەتوانین بڵێین مرۆڤ ئەو مەوجودەیە کە خاوەنی بوونێکی تایبەت بەخۆیەتی ، ئەو بوونەش لەوانەیە بوونێکی رەسەن بێت ، یاخوود لەوانەیە بوونێکی ساختە بێت . بابزانین ئەم دوو جۆرە بوونە چین و کامیان پەسەندترن ...

## جۆرەکانی بوون

لای هایدگەر دوو جۆر بوون هەن کە بریتین لە بوونی رۆژانە و بوونی تایبەتی[2]، کە مەبەست لە بوونی رۆژانە بوونی ساختەیەو ، بوونی تایبەتیش بوونی رەسەنی کەسەکە دەگرێتەوە . با بزانین ئەم دوو جۆرەی بوون چین ؟

### یەکەم: بوونی ساختە:

بوونی ساختە ((ئەو بوونەیە کە کۆمەڵێك کارتێکەری دەرەکی پێکی دەهێنن ، ئیدی ئەو کارتێکەرانە بارودۆخ بن ، یاخود یاسای ئەخلاقی و دەسەڵاتی ئایینی ، یان سیاسی و شتی لەم بابەتە))[3] ، یان دابونەریتی کۆمەڵایەتی بن کە رۆڵیان هەیە لە دروستکردن و پێکهێنانی ئەم جۆرە بوونەدا . لەم رووەوە دەتوانین بڵێین ((ئەو کەسەی کە ژیانێکی رەسەن ناژی ، واز لە هەڵبژاردنی خودی خۆی دەهێنێت و بوار بەوانی تر دەدات ئیمکاناتەکانی بۆ دیاری بکەن ، یان (دەتوانین

---

(1) محاضرات هيجل في تاريخ الفلسفة ( المجلد الثالث) ، هيجل ، ص ٢٠٣ .

(2) بڕوانە : نقد العقل التأويلي ، فتحي المسكيني ، مركز الانماء القومي، بيروت ، ط ١ ، س ٢٠٠٥ ، ص ٢١٦ .

(3) فەلسەفەی بوونگەرایی ، جۆن ماکواری ، ل ٢٣٥ .

بلێین) بوار بەو نادیارە دەدات ، کە بە خەڵك یان جەماوەر یان رای گشتی ناو دەبرێت ، شتی بەسەردا بسەپێنن))[1] . واتە لە بری ئەوەی ، خۆی توانا و ئیمکانەکانی ناوەوەی خۆی هەڵبژێرێت و بەدیان بهێنێت ، بوار بە دەرەوەی خۆی دەدات کۆمەڵێك توانا و ئیمکانی بۆ دیاری بکەن کە هی خۆی نین و لە دەرەوەی خۆیدا بۆی دیاری کراون . ئیتر ئەو کەسە ((بە شێوەیەکی باو هەر لە بواری بوونی بێزراو و ساختەو لەژێر کاریگەری تەمبەڵی و فشاری نەریتەکان و سیستەمە کۆمەڵایەتیەکاندا دەمێنێتەوە... بە جۆرێك هەر بە کۆیلەی ژیانی رۆژانەی بێمانا (ژیانی خەڵکی) یاخود ژیانی هەر تاکێك لە تاکەکان بەبێ جیاوازی دەمێنێتەوە ، کە دەکرێ هەر کەسێکی تر شوێنمان بگرێتەوە یان ئێمە شوێنی هەر کەسێکی تر بگرینەوە))[2] و بە تێپەڕبوونی کات ، کەسەکە وای لێدێت هەست بە بوونی تایبەتی خۆی ناکات و لە دەرەوەدا دەتوێتەوەو لە ژیانی گشتی خەڵکدا بزر دەبێت ((چونکە ژیانی تەوەسوت یان ژیانی گشتی خەڵك ، گشت جیاوازییەك رەتدەکاتەوەو رەسەنایەتی بەلاوە دەنێت و هەموو توانایەکی هەڵگرتنی بەرپرسیارییەتی و بۆچوونی سەربەخۆو بڕیاردان لە کەسەکەدا ناهێڵێت . واتە لەوە بێبەشی دەکات خودی خۆی بێت و ژیانی گشتی خەڵك شێوازی بوون دەسەپێنێت بە سەریا))[3] . ئەو بوونەش کە لە دەرەوە بەسەر مرۆڤدا دەسەپێنرێت بوونێکی ساختەیەو پەیوەستە بەوانی ترەوەو ((ئەوانی دی لە زۆربەی کاتەکاندا رێگرن لە بەردەم بە دیهاتنی تواناکاندا))[4] . واتە ئەو کەسانەی کە لە دەوروبەرماندان و لەگەڵیان دەژین و تێکەڵیمان هەیە لەگەڵیان ، بوار بە تاکەکەس نادەن توانا و ئیمکانەکانی خۆی بەرجەستە بکات و خودی خۆی بێت . بۆ نموونە کۆمەڵگەو دەروبەر بەردەوام هەوڵدەدەن تاکەکان بە تەواوی پابەند بن بە چۆنیەتی ژیان و رەوشت و ئەو دابونەریت و بیروباوەڕو بۆچوونانەی لە کۆمەڵگەدا هەن . لەم بارەدا کەسەکە چەند زیاتر پابەند بێت بەو لایەنانەوە ، ئەوەندە لە دەرەوە یاخود لە ناو کۆمەڵگەدا دەردەکەوێ و دەناسرێت و دیار دەبێت . بەڵام سەبارەت بە خودی خۆی مەسەلەکە پێچەوانەیەو تا زیاتر پابەندبێت بەو پێوەرە

---

(1) نداء الحقيقة ، مارتن هيدجر ، ص ٦٦ .

(2) چەند فەیلەسوفێکی بوونگەرا ، فوئاد کامیل عەبدولعەزیز ، و : سامان عەلی حامید ، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم ، بە بێ چ ، س ٢٠٠٥ ، ل ٧٤ .

(3) نداء الحقيقة ، مارتن هيدجر ، ص ٧٠ .

(4) اشكالية الوجود والتقنية عند مارتن هايدجر ، ابراهيم احمد ، ص ٧٥ .

گشتیيانەوە کە کۆمەڵگە بۆ ژیان و دابونەریت دیاریی کردوون ، زیاتر لە خودی خۆی یاخود لە بوونی رەسەنی خۆی دوور دەکەوێتەوەو بوونی خۆی لە بیر دەکات . وەرزش دەکات ، کۆلیژ تەواو دەکات ، دەچێ بۆ سەیران و گەشت ، پابەند دەبێت بە حزبێکەوە ...هتد. هەموو ئەمانە دەکات لەبەرئەوەی خەڵکی دەیان کەن «ئەمە ژیانی تەوەسوت و رۆژانەیە کە مرۆڤ دیل دەکات و جادووی لێ دەکاو وا هەست دەکات بە راستی ئەمە ژیانە»[1] ، لە کاتێکدا هەموو ئەمانە لە خۆیەوە سەرچاوەیان نەگرتووە ، واتە کە ئەو کارانە دەکات ، لەبەرئەوە نییە شتێك لە ناوەوەو ناخی خۆیدا پالی پێوە ناوە بۆ کردنی ئەو کارانە ، بەڵکو لەبەرئەوە دەیانکات کۆمەڵگە بە گشتی سەرقاڵی ئەو کارانەیەو پێوەیان خەریکە ، بوونی کەسەکان لەم بارەو لەم جۆرە ژیانەدا هەمووی هاوبەشەو لەیەك دەچێت . بەم جۆرە لە بوونی رەسەنی خۆیان دوور دەکەونەوەو بوونێکی ساختە ، کە لە دەرەوە هاتۆتە ناویان یاخود بۆیان دروستکراوە ، تیایاندا بالادەست دەبێت . ئەم جۆرە بوونە تاکێتی و دەگمەنی تیادا نییە «بەڵکو شوێنی بوونێکی وەسەتیە کە هەموو بوونەکانی دی تیایدا بەشدارن و هەر یەك لەو بوونانە وەکو ئەوانی تر وایە»[2] و هیچکامیان خاوەنی خاسیەت و تایبەتمەندییەکی وا نین کە لەوانی دی جیاواز بێت . ئەم بوونەش بە بوونێکی سادەی رۆژانە دادەنرێت و «بوونی رۆژانەش لە زۆربەی بارەکاندا خودی خۆی نییە ، بەڵکو رێی (بوونی خۆی) لێ ونبووەو لەناو بوونی گشتیی خەڵکدا تواوەتەوە و بزربووە . لە راستیدا ئەم خودە ونبووە وێنەیەکی شێواوی بوونی رەسەنە»[3] ، چونکە کەسەکە هەست بەم بزربوونەی خودی خۆی ناکات و وادەزانێت ئەوە خودی خۆیەتی بڕیار دەدات و هەڵوێست وەردەگرێت و ژیانی خۆی دیاری دەکات . بۆیە «راستە خەڵکی بە بۆنەو بێ بۆنە وشەی (من ، من ، من) دووبارە دەکەنەوە ، بەڵام زۆر لە بوونی رەسەنی خۆیان دوورن . ئەو (من)ەی بەردەوام خەڵك دووبارەی دەکەنەوەو بەناوی ئەوەوە قسە دەکەن ، منێکی سەرقاڵە بە مەوجودە دەرەکییەکانەوەو لە بوونی رەسەنی خۆی دابڕاوە»[4] ، ئەگەر ئاگای لە بوونی رەسەنی خۆی بوایە ، توانای ئیمکانەکانی ئەو بوونە رەسەنەی خۆی دەدۆزییەوەو بە تەحقیقکردنیانەوە خەریك

(1) نداء الحقيقة ، مارتن هيدجر ، ص ٥٣ .
(2) نقد العقل التأويلي ، فتحي المسكيني ، ص ١٩٧ .
(3) نداء الحقيقة ، مارتن هيدجر ، ص ٩٥.
(4) هـ . س ، هـ . ل .

دەبوو، نەك بە مەوجودە دەرەكییەكانەوە خەریكبێت ، چونكە ((بوونی ڕۆژانەی باوی مەوجودی ئینسانی ، بە سەرقاڵبوون بە شت و مەوجودە ئامادەكانەوە ، یان بەو مەوجودانەوە خەریك دەبێت ، كە لەبەر دەست و لەژێر هەڵسوكەوت (تصرف)ی ئەمدان))[1] . ئەم سەرقاڵبوون و خەریكبوونەش بە مەوجودەكانی دەرەوەی خۆیەوە وای لێدەكەن بە تەواوی تیایاندا ڕۆبچێت و تەنها لە میانەی ئەو مەوجودانەو خەریكبوونیەوە پێوەیان لە خۆی تێ بگات ، واتە ئەگەر توانای خەریكبوونی نەبێت بە شتەكانی دەرەوەو شارەزایان نەبێت ، هەست بە بوونی خۆی ناكات . ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی ئەو كەسە ((نەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ خودی خۆی یان بۆ ئەو تواناو ئیمكانانەی بوونی خۆی كە هیچ پەیوەندییەكیان بە شتەكانی دەرەوە نییەو ، لەژێر كاریگەری خەریكبون بە دەرەوەدا دەمێنێتەوەو لە حاڵەتی چاوەڕوانی ئەوەدا دەبێت ئەو مەوجودانەی ئەم پێوەیان خەریكە چی بۆ دەهێنن))[2] . واتە چاوەڕوانی ئەوە نییە خۆی چی بۆ خۆی دەكات و بەرەو كوێ دەچێت و بەچی دەگات ؟ بەڵكو چاوەڕوانی ئەوەیە مەوجودەكانی دەرەوە چی بۆ دەكەن و بەرەو كوێی دەبەن . ئەمەش وادەكات تەنانەت داهاتوو (مستقبل)ی ئەم كەسە داهاتوویەكی ڕەسەن نەبێت ، چونكە ((داهاتووی ئەو جۆرێكە لە پێشبینیكردن (التوقع) ، كە وای لێدەكات لە هەڵوێستی ، یاخود لە حاڵەتی چاوەڕوانی و داواكردن و ئارەزوودا بێت))[3] . ئیتر نازانێت ئەو چاوەڕوانی و پێشبینی و ئارەزووانەی دێنە دی یان نا ، چونكە بەدیهاتنیان لە دەست خۆیدا نییە ، بەڵكو لە دەست دەرەوەی خۆیدان ، ئەگەر بۆیان هێنایەدی هێناویانەتەدی و ئەگەر نەیان هێنایەدی ، دەبێت ئەم هەر لە چاوەڕوانی هاتنە دییاندا بێت . بێگومان بەسەربردنی ژیان بەم جۆرە ، ژیانێكی زۆر بێمانایەو پڕە لە نائارامی و كات بەفیڕۆدان و كەسەكە ئازادی خۆی لەدەست دەدات ، چونكە واز لە خۆی ناهێنێت خۆی چۆنە بەوجۆرە بێت و بەو جۆرە بژی ، بەڵكو دەرەوە چۆنیان دەوێت ئاوا دەبێت و ئاوا دەژی . بەمەش بوون و ژیانی ڕەسەنی خۆی لەدەست دەدات و لە بوون و ژیانێكی ساختەدا دەبێت ، تەنانەت ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی ئەو كەسە بەرەو چارەنووس و قەدەری خۆی نەچێت ، چونكە ((كاتێك بەرەو ڕووی چارەنووسی خۆمان دەبینەوەو لە قەدەری خۆماندا دەبین ، كە ئەو بوونەی خۆمان دەربكەوێت ، بەبێ ئەم

---

(1) هـ . س ، ل ١٠٠ .

(2) هـ . س ، [illegible] . ل .

(3) هـ . س ، هـ . ل .

دەرکەوتنەی بوونمان شیمانەی ئەوە هەیە بە قەدەری خۆمان نەگەین))[1] . مەبەستیش لە قەدەر ئەوە نییە ، کە چارەنووس و قەدەری کەسەکە لەلایەن هێزێکی بالاترەوە دیاری دەکرێت و کەسەکە هیچ ویست و ئیرادەیەکی لە دیاریکردنی چارەنووسی خۆیدا نییە ، بەڵکو مەبەست ئەوەیە ئەو تواناو ئیمکانانەی لە بوونی رەسەنی کەسەکەدا هەن ، ئەگەر بە تەحقیقکردنیانەوە خەریکبێت ، ئەوا بەرەو چارەنووس و جۆرە ژیانێکی دەبەن کە لە خودی خۆیەوە سەرچاوەیان گرتووەو بەمە لە قەدەری خۆیدا دەبێت . بەلام ئەگەر واز لە تواناو ئیمکانەکانی خۆی بهێنێت و دەرەوە تواناو ئیمکانەکانی بۆ دیاری بکەن ، ئەوا لە قەدەری دەرەوەدا دەبێت .

## خاسیەتەکانی بوونی ساختە

بوونی ساختە سێ خاسیەتی سەرەکیی هەیە کە پێیان دەناسرێتەوە ، ئەوانیش بریتین لە : زۆربلێیی (الثرثرة) و فزول و لێ تێکچوون(التباس)[2] .

کاری سەرەکی زمان ئەوەیە بە هۆیەوە تەعبیر لە خۆمان بکەین بۆ بەرامبەرەکەمان . بەلام لە حاڵەتی بوونی ساختەدا سیمای سەرەکی زمان و قسەکردن جەخت کردنە لەسەر دەستەواژەی (ئەوان دەڵێن) ، کە دەبێتە دەستەواژەیەکی رەهای وردی و حەقیقەت . کاتێکیش بەم جۆرە مامەڵە لەگەڵ زماندا دەکرێت ، زمان ئاماژەدان بە بوونی کەسەکە لە دەستدەدات و تەنها پەیوەست دەبێت بەو دەربڕینانەوە کە شوێنی شتەکان دەگرنەوەو هەموو شتەکان دەبەسترێن بەوەوەی کە خەڵك دەیلێن . ئەم وێنەیەی زمان زۆر بلێیی (ثرثرة) دروست دەکات . یەکێ لە خاسیەتەکانی ئەم زۆر بلێییە ئەوەیە بێ خۆگونجان و راهاتنی مرۆڤ لەگەڵ شتەکاندا ، ئیمکانیەتی تێگەیشتنی هەموو شتێك بە مرۆڤ دەدات . رزگاربوون لەم وێنەیەی ژیانی رۆژانە کە بوونی مرۆڤ بە جۆرێك لە جۆرەکان تیایدا دەتوێتەوە ، کارێکی ئاسان نییەو تیایدا ، بوون لە رەگوریشەی رەسەنی خۆی دادەڕنرێت و هیچ پەیوەندییەکی راستەقینەی لەگەڵ عالەم و کەسانی تروتەنانەت خۆیشیدا نامێنێت . کەسەکەش هەست بەم حاڵەتە ناکات ، چونکە زۆر بلێیی رۆژانەی ، ئەو عەدەمەی لێ دەشارێتەوە

---

(1) مبدأ العلة ، مارتن هيدجر ، ت: د.نظير جاهل ، المؤسسة الجامعية للدراسات والنشر والتوزيع ، بيروت ، ط ١ ، س١٩٩١، ص ٧٥ .

(2) بڕوانە: المذاهب الوجودية ، فؤاد كامل ، ص ٨٠ ـ ٨١ ـ ٨٢ .

کە تێی کەوتووە ، مرۆڤیش تا هەست بە عەدەم نەکات ، ناتوانێت هەست بە بوونی ڕەسەنی خۆی بکات .

(فزول) بریتییە لە ئارەزووی زانینی شت و ئەمەش تەنها بۆئەوەیە لە خودی خۆی دووربکەوێتەوەو لە ناو بابەتەکانی ژیانی ڕۆژانەدا خۆی لەبیر بکات ، چونکە فزول گرنگی بە تێگەیشتنی ئەو شتە نادات کە دەیبینێت ، واتە هەوڵی گەیشتن بە حەقیقەتی بوونی شتەکان نادات ، بەڵکو تەنها ئەوەی بە لاوە گرنگە کە شت ببینێت . یان تەنیا بەدوای شتی نوێدا دەگەڕێت بۆخودی شتەکەو ، بەدوای شتێکدا ناگەڕێت کە دەلالەت لە بوونی خۆی بکات . لەبەرئەمە ئەو کەسە هەرگیز وەستانی بۆ نییەو قەت تەرکیز ناکاتە سەر بابەتێکی ئامادە لە ئێستادا ، هەمیشە بە دوای شتی دوورتردا دەگەڕێت . بەمەش بوونی ڕۆژانەی ئەو ، شێوەیەکی پەرتبوو وەردەگرێت و سەرەڕای بەردەوامی ئەو بوونە ڕۆژانەیەی ، بەلام بوونێکی بێ ناوەڕۆکەو هیچ ریشەیەکی نییە . خراپترین هەڵخەڵەتاندنیش کە لە فزولەوە دێت ئەوەیە کە ئەو فزولە وا لە کەسەکە دەکات ملکەچی بێت و کەسەکەش ئەو وەهمەی لا دروست دەبێت کە ژیانێکی ڕاستەقینە دەژی .

لەم وەهمەوە ، دیاردەی سێیەم دروست دەبێت ، کە لێ تێکچوون(التباس)ە. ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی نەتوانین جیاوازی بکەین لە نێوان ئەوەی حەقیقییەو ئەوەی ساختەیە . ئەم لێ تێکچوونە تەنیا شتەکانی دەرەوەو عالەم ناگرێتەوە ، بەڵکو بوونی هاوبەشی کەسەکان و تەنانەت خودی بوونی کەسەکەو پەیوەندیی بە خۆیەوە دەگرێتەوە . لەم بارەدا هەریەکێك لە کەسەکان وا هەست دەکات هەموو شتێك دەزانێت و لەبارەی هەموو ئەو شتانەوە دەدوێت کە دێنە پێشی ، هەمووکەسێك دەزانێت چۆن لەبارەی ئەو شتانەوە قسە بکات کە بۆی هەیە ڕوویدەن ، بەکورتی توانای قسەکردن دەبێتە پێوەرێکی ڕاست و دروستی ئەوەی دەیزانین و ئەوەی کە هەیە .

دەتوانین بوونی ساختە لەوەدا کورت بکەینەوە کە بریتییە لە حاڵەتی دابڕان . ئەم دابڕانە بەو واتایە نییە کە کەسەکە لە خودی خۆی دابڕنراوە ، بەڵکو بەو واتایەیە کە ئەو کەسە ئیمکان و توانا تایبەتییەکانی خۆی لە دەست دەدات و لە ئیمکان و توانا گشتییەکاندا دەتوێتەوە . کەسەکەش ئاگای لەم دابڕانەی نییەو ئەم حاڵەتە لای ئەو ڕێگەیەکە بەرەو ژیانێکی بالاترو دیارو تەواو واقیعی . لە کاتێکدا کە

مەسەلەکە بە پێچەوانەوەیەو بە تێپەڕبوونی کات کەسەکە بە تەواوی لە خۆی و تواناکانی خۆی بێئاگا دەبێت .

لە کۆتایدا پێویستە ئاماژە بەوە بدەین کە ((بوونی ساختە هەمیشە توانای ئەساسی دازاینەو بەشێکی پێکهێنەریەتی و مرۆڤ ناتوانێت خۆی لێ رزگار بکات))[1] . واتە مرۆڤ بیەوێت و نەیەوێت کە هاتە دنیاوە ، لە ناو کۆمەڵگەدا گەورە دەبێت و لەگەڵ کەسانی تردا دەژی ، بۆیە بێئەوەی هەست بکات لە کۆمەڵگەو لە دەرەوەی خۆیدا دەتوێتەوەو لە بوونی خۆی دادەبڕێت . بەڵام ئەم دابڕانەی لە بوونی خۆی تاسەر نییەو دەتوانێت بوونی رەسەنی خۆی بدۆزێتەوە . دۆزینەوەی بوونی رەسەنیش بازدان نییە بەسەر جیهانی رۆژانەی بووندا ، بەڵکو جۆرێکی تری هەڵسوکەوتە بەرامبەر عالەم و ژیانی رۆژانە بە مەبەستی تێگەیشتنیان.

**دووەم : بوونی رەسەن:**

ئەو بوونەیە کە تیایدا خود هەست بە تاکێتی خۆی دەکات و لەوانی دی دابڕاوە[2]. کە دەوترێت لەوانی تر دابڕاوە مانای ئەوە نییە کەسەکە بە تەنها دەژی و دوورە لە خەڵك ، بەڵکو لەگەڵ خەڵکدا دەژی و لەگەڵیان تێکەڵ دەبێت ، بەڵام لەواندا ناتوێتەوە . ئەم نەتوانەوەیەش لە خەڵکدا بەوە دەبێت کە کەسەکە واز لە خۆی بهێنێت ، بەو جۆرەی یان لەسەر ئەو بارەی لە ئەسڵدا خۆی لەسەریەتی ، ببێت[3]، واتە تواناکانی خۆی هەڵدەبژێرێت و هەوڵی تێگەیشتنی خۆی دەدات . لەم بارەدا کەسەکە ((چەند خاوەنی خۆی بێت و چەند خوڵقێنەری خودی خۆی بێت لەو وێنەیەدا کە بۆخۆی دروست کردووە ، ئەوەندە بوونی رەسەنە))[4]. واتە دەبێت بڕیاردانی لەسەرئەوەی چی بێت و چۆن بێت لە خودی خۆیەوە دەربچێت ، نەك دەوروبەرو کەسانی دی بەسەریدا بسەپێنن.

وەك پێشتر وتمان ، مرۆڤ بە زۆری لەم بوونە رەسەنەی خۆی بێئاگایەو بە مەوجودەکانی ترەوە خەریکەو لە دەرەوەی خۆی و لە خەڵکدا دەتوێتەوەو بێئەوەی هەست بکات کۆمەڵێك تواناو ئیمکانی بەسەردا دەسەپێنرێت کە لە خودی خۆیەوە سەرچاوەیان نەگرتووەو لەلایەن دەرەوە بۆی دیاریکراون . بەڵام ئەگەر مرۆڤ بەرەو

---

(1) هـ . س ، هـ . ل .

(2) بڕوانە: اشكالية التواصل فى الفلسفة الغربية المعاصرة ، عمر مهيبل ، ص ١٤٦ .

(3) بڕوانە : نداء الحقيقة ، مارتن هيدجر ، ص ١١٨ .

(4) فەلسەفەی بوونگەرایی ، جۆن ماکواری ، ل ٢٣٤ .

ئەم بوونەی خۆی بگەڕێتەوەو هەوڵی بەدیهێنانی بدات ، ئەوا لە تواناو ئیمکانە تایبەتییەکانی خۆی دەگات و خودی خۆی هەڵدەبژێرێت و لە توانەوە لەوانی تردا خۆی رزگار دەکات[١] و دەتوانێت بەوبوونەی خۆی بگات و بەدیی بهێنێت .

## خاسیەتەکانی بوونی رەسەن

بەهەمانشێوەی بوونی ساختە ، بوونی رەسەنیش سێ خاسیەتی سەرەکی هەیە کە پێیان دەناسرێتەوەو بریتین لە : حاڵەتی ویژدانی (یان شعوری)و تێگەیشتن و قسە(الکلام) .

بەلای هایدگەرەوە حاڵەتی ویژدانی هیچ پەیوەندییەکی بە (هەڵچوون ، دڵ ، هاوسۆزی )یەوە نییەو بریتییە لەوەی مرۆڤ چۆن خۆی دەدۆزێتەوە ، واتە جۆرێکە لە دۆزینەوەی خود ، چونکە ((ویژدان هەست کردن بە (بوون ـ لە ـ عالەمدا) بە مرۆڤ دەبەخشێت))[٢] . واتە ویژدان و حاڵەتی ویژدانی جۆرێکە لە کرانەوەی مرۆڤ بەڕووی ناوەوەی خۆیداو دۆزینەوەی تواناو ئیمکانەکانی خۆیەتی . ئەمەش لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە مرۆڤ هەستدەکات بێ ویستی خۆی فڕێدراوەتە ئەم عالەمەوەو هەست بە دابڕان دەکات لەو عالەمەی کە فڕێدراوەتە ناویەوە . لەمەوە هەست بەوە دەکات کە بەدەستهێنانی بوونی رەسەنی خۆی ماندوو بوونێکی بێ بڕانەوەی دەوێت و دەبێ بەردەوام لەگەڵ دەرەوە لەشەڕدا بێت تا بتوانێت ئاگای لە بوونی خۆی بێت و لەدەستی نەدات و لە دەرەوەدا نەتوێتەوە[٣] .

تێگەیشتنیش بارێکی تایبەتی مەوجودی ئینسانییەو بریتییە لە کرانەوەیەك کە هەمیشە بەستراوە بە پێکهاتنی (بوون ـ لە ـ عالەمدا)و ((بە تێگەیشتن مرۆڤ بواری بوونی خۆی بۆخۆی دەکاتەوە ، هەروەك چۆن لە هەمان کاتدا بواری ئەو مەوجودانەش دەکاتەوە کە لە عالەمدا پێیان دەگات))[٤] . واتە تێگەیشتن وا دەکات مرۆڤ ، هەم بەڕووی ناوەوەی خۆیدا بکرێتەوەو لە خۆی و تواناو ئیمکانەکانی خۆی تێبگات و هەوڵی بەدیهێنانیان بدات ، هەم بە رووی مەوجودەکانی تریشدا بکرێتەوە و لێیان

---

(1) بڕوانە : نداء الحقیقة ، مارتن هیدجر ، ص ٩٥ .

(2) نقد العقل التأویلی ، فتحی المسکینی ، ص ٢١ .

(3) بڕوانە: المذاهب الوجودیة ، فؤاد کامل ، ص ٧٦ .

(4) نداء الحقیقة ، مارتن هیدجر ، ص ٧٧ .

تێبگات و بۆ تەحقیقکردنی بوونی خۆی سوودیان لێ وەربگرێت ، بێئەوەی بە تەواوی پێیانەوە خەریکبێت و بەم خەریکبوونە خۆی لەبیر بکات و لەدەستی بدات و لەو مەوجودانەدا بتوێتەوە .

قسەکردنیش لە رووی بوونگەراییەوە بە ئەندازەی حاڵەتی ویژدانی و تێگەیشتن رەسەنەو ((قسەکردن بریتییە لە دەربڕینی تێگەیشتن))[1] . واتە ئەوەی مرۆڤ لەبارەی بوونی خۆی و مەوجودەکانی ترەوە تێیگەیشتووە ، بە قسە دەری دەبڕێت و روونی دەکاتەوە . ئەمەش پێچەوانەی زۆر بلێییە کە خاسیەتی بوونی ساختەیەو کەسەکە لەبارەی هەموو شتێکەوە قسە دەکات ، بێ ئەوەی بە قووڵی لەو شتانە تێگەیشتبێت . بە هۆی قسەکردنەوە مەوجودەکان رێکدەخەین و پەیوەندی لە نێوانیاندا دەدۆزینەوەو مانایان پێدەبەخشین . لە هەمان کاتدا بوونی خۆشمانی پێ رێکدەخەین و روونی دەکەینەوە ، بەوەی لەگەڵ کەسانی تردا قسەدەکەین و لە بارەی ئەو بوونەوە یان لەبارەی مەوجودەکانەوە دەدوێین[2] .

جگە لەم دوو جۆرەی بوون کە باسکران ، لە شیعری مەحویدا دوو توخمی دیکە هەن رۆڵیان هەیە لە جێگیربوون و جۆری ئەو بوونەی لە مەحویدا دروست دەبێت ، ئەو دوو توخمەش بریتین لە :

**یەکەم : جەستە:**

ئەولایەنەیە کە شوێنی نیشتەجێبوون یاخوود بەرجەستەبوونی (بوون)ە ، چ بوونی رەسەن بێت یان ساختە ، چونکە مرۆڤ ناتوانێت لە عالەمدا بێت تەنها لە رێی بوونیەوە نەبێت لە شێوەیەکی جەستەیداو لە رێی جەستەوە دەرك بەو شت و کەسانە دەکات کە جیهان پێك دەهێنن[3] . جەستە تەنها نشینگەیەکی ئامادەیە بۆ (بوون)و خۆی ویستی نییە لە دیاریکردنی جۆری ئەو بوونەی تیایدا بەرجەستە دەبێت و تەحەکومی پێدەکات . بۆ نیشتەجێبوونی هەریەك لە بوونی رەسەن یان ساختە لە جەستەدا ، دوو دەرگا هەن کە هەریەکەیان تایبەتە بە یەکێك لەو دوو جۆرەی بوون : یەکیان دەرگایەکە لە ناوەوەی جەستەدایەو تەنها شوێنی هاتنە ناوەوەی بوونی رەسەن و بەرجەستەبوونیەتی لە جەستەدا ، ئەوی دیکەشیان

---

(1) نداء الحقيقة ، مارتن هيدجر ، ص ٧٩ .

(2) بروانە: المذاهب الوجودية ، فؤاد كامل ، ص ٧٩ .

(3) بروانە: فەلسەفەی بوونگەرایی ، جۆن ماکواری ، ل ١٠٧ .

دەرگایەکە لە رووی دەرەوەی جەستەدایەو شوێنی هاتنی بوونی ساختەیە بۆ ناو جەستە.

**دووەم : کەس:**

کە(خود)یش دەگرێتەوەو لە شیعرەکاندا بە (مەحوی) ناوی هاتووە ، ئەو لایەنەیە کە ئەرکی پارێزگاریکردنی جەستەیە . ئەم پارێزگاریکردنەشی لە دوو رووەوەیە : رووی دەرەوەو رووی ناوەوە . پارێزگاریکردنی جەستە لەڕووی دەرەوە لەلایەن مەحوییەوە بەوە دەبێت ئەو دەرگایەی جەستە کە بەڕووی دەرەوەدایە ، بیگرێت و نەهێڵێت بوونی ساختە بێتە ناوجەستەیەوە ، بەمە جەستە بە پاکی رادەگرێت و دەیکاتە نشینگەیەکی ئامادە بۆ هاتن و بەرجەستەبوونی ، بوونی رەسەن تیایدا . لەڕووی ناوەوەش دەرگا بە رووی بوونە رەسەنەکەدا دەکاتەوەو بواری پێدەدات بێتە ناو جەستەوەو بیکاتە نشینگەی خۆی و تیایدا بەرجەستە ببێت و بەدی بێت . ئەم دوو دەرگایەی جەستە هەرگیز لە یەککاتدا هەردووکیان پێکەوە ناکرێنەوە ، داخستنی یەکێکیان کردنەوەی ئەوی دیکەیانە ، واتە داخستنی دەرگای دەرەوەی جەستە بەڕووی بوونی ساختەدا ، کردنەوەی دەرگای ناوەوەیە بە رووی بوونی رەسەنداو بە پێچەوانەوەش . لە ئەسڵدا ئەرکی (کەس ـ مەحوی) ئەوەیە بە رووی دەرەوەدا پارێزگاری لە جەستە بکات و نەهێڵێت بوونی ساختە دزە بکاتە ناوی و بیکاتە نشینگەی خۆی ، چونکە بەمە بوونە رەسەنەکەی خۆی لە دەست دەدات و تووشی کەوتن دەبێت ((مەبەست لە کەوتن دەستنیشانکردنێکی بوونگەریانەیە یاخود هەڵوێستێکەو خود بەرامبەر بە خۆی وەریدەگرێت ، یاخود روونتر بڵێین کەوتن هەڵهاتنی مرۆڤە لە خودی خۆی))[1]. بە دەربڕینێکی تر : کەوتن هەڵهاتنی مرۆڤە لە بوونی رەسەنی خۆی و لە دەستدانیەتی ، ئەمەش بە وون بوون لەناو ئەوەدا کە ئامادەیە دێتەدی[2] . واتە کەوتن لەو حاڵەتەدا روودەدات کە مرۆڤ بە شتانێکەوە خەریك دەبێت لە دەرەوەی خۆیدان و لە ناو ئەمدا ئامادەیی پەیدا دەکەن ، بەمەش ئەو کەسە لە بوونی رەسەنی خۆی دادەبڕێت ، بەم پێیە کەوتن ، نائامادەیی بوونی رەسەنە لە بەرامبەر ئامادەیی دەرەوەداو توانەوەیە تیایدا . بەڵام لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە نابێ واتایەکی سلبی بە (کەوتن) بدەین ، واتە

---

(1) چەند فەیلە سوفێکی بوونگەرا ، فوئاد کامیل ، ل٧٦ .

(2) بڕوانە : نداء الحقيقة ، مارتن هيدجر ، ص١٠٧ .

وا لێکی بدەینەوە کە ژیانی رۆژانە بوونی تێدا نییە ، لێرەدا کەسەکە لە ناو عالەم و لە بوونی بە کۆمەڵدا رۆدەچێت و ئەم حاڵەتە نەمانی بوونی رەسەنە بەو پێیەی کە کەسەکە خودی خۆی نییە ، واتە دازاینی کەسەکە دەبێتە شتێکی دیکەی جگە لە خۆی[1] و بوونێکی تر تیایدا بەرجەستەو باڵادەست دەبێت ، کە بوونێکی بە کۆمەڵەو بە نسبەت کەسەکەوە بوونێکی ساختەیەو لە دەرەوە سەرچاوەی گرتووە نەك لە خودی خۆیەوە . لە کاتێکدا سەرەکیترین کاری خود بەدیهێنانی ئەو بوونە رەسەنەی خۆیەتی ، ئەویش بەوەی جەستە بە پاکی رابگرێت و لە بوونی ساختە بیپارێزێت تا بوار بۆ بوونە رەسەنەکە بڕەخسێنێت بێتە ناوی و تیایدا بەرجەستە ببێت.

## مــــــردن

فەیلەسووفە بوونگەراکان بایەخێکی زۆر بە مردن دەدەن و زۆر لێی دەدوێن . بەڵام ئێمە لێرەدا هەوڵ دەدەین تەنها لە روانگەی هایدگەرەوە لە مردن بدوێین . لای هایدگەر مردن بەنسبەت هەر یەك لە بوونی رەسەن و بوونی ساختەوە واتایەکی جیاوازی هەیە .

لە بوونی رەسەندا مردن یەکێکە لە تواناو ئیمکانەکانی بوون و پێویستە ئەو بوونە هەردەم پابەندی بێت «لەگەڵ مردندا (دازاین) لە تایبەتترین توانای خۆیدا چاو دەبڕێتە خۆی»[2] . واتە مرۆڤ دەکەوێتە سەر تایبەتترین توانای بوونی خۆی و هیچ پەیوەندییەکی بە دازاین و مەوجودەکانی ترەوە نامێنێت ، بەم پێیە «مردن بریتییە لەو توانایەی کە (ئیتر ـ ئەو ـ ناتوانێت ـ لێرە ـ بێت)»[3] . واتە مردن توانای نەمانی گشت تواناو ئیمکانیەتێکە لە کەسەکەداو لە مردندا هیچ پەیوەندییەك لەگەڵ دەرەوەدا نامێنێت و تایبەتە بە کەسەکە خۆی و رەسەنترین توانای دازاینە ، چونکە ئەگەر مرۆڤ لە بوونی رۆژانە یاخود لە بوونی ساختەدا بتوانێت لە شێوەی بوونەکانی تردا دەربکەوێت و تواناو ئیمکانەکانی ئەوان بێنە ناو ئەم و تەحقیقیان بکات ، ئەوا لە مردندا ناتوانێت ئەمە بکات ، چونکە مردنی ، تەنها تایبەتە بە خۆی و تەنها خۆی

---

(1) بڕوانە : المذاهب الوجودية ، فؤاد كامل ، ص ٨١ .

(2) نقد العقل التأويلي ، فتحي المسكيني ، ص 229 .

(3) هـ . س ، هـ . ل .

دەمرێت[1]، نە دەتوانێ لە جیاتی کەس بمرێت ، نە کەسیش دەتوانێت لە جیاتی ئەم بمرێت . ئەم مردنە هەر لە لەدایکبوونیەوە وەك توانایەك تێیدا هەیەو کەسەکە چاوەڕوانی ئەوە بووە یاخود هەستیکردووە ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەم توانایە دێتە دی . بۆیە کەسەکە ترسی لە مردن نییە و لێی ڕاناکات و وەکو هەر توانایەك لە تواناکانی خۆی تەماشای دەکات .

بەڵام لە بوونی ساختەدا مردن وەك توانایەکی ڕەسەنی بوونی مرۆڤ تەماشا ناکرێت ، بەڵکو وەك ڕووداوێك سەیردەکرێت کە هەموو ساتێك و هەموو ڕۆژێك ڕوودەدات و بەسەر کەساندا دێت ، بۆیە نەدەبێ سەرنجمان ڕاکێشێت و نەدەبێ زیاد لە پێویست سەرقاڵمان بکات ، هەروەکچۆن نابێت کارەکانمان ڕاگرێت و لە هەوڵدانمان بخات . بوونی تواوە لە خەڵکدا هەروەکو خەڵك دەڕوانێتە مردن و خەڵکیش بەوە لە بایەخی مردن کەم دەکەنەوە کە لە داهاتوودا بەرەو ڕوویان دەبێتەوە ، بۆیە ئێستا هیچ جێگەی بایەخ و مەبەست نییەو هیچ نەبێت ئەم جارە ئەوانی نەگرتووەتەوە ، هەموو کەسێکیش دەبێت بمرێت[2]. کاتێکیش خەڵك ئاوا سەیری مردن دەکەن و لە بارەیەوە دەدوێن ، ئەوا حەقیقەتی مردنیان لێ تێکدەچێت و لای ئەوان مردن شتێکی دیاریکراو نییە ، بەڵکو ڕووداوێکە لە کاتێکی نادیارو لە شوێنێکی نادیارەوە دێت و یەخەمان دەگرێت ، بەڵام ئێستە جێی مەترسی نییە ، چونکە هێشتا بەسەر ئێمەدا نەهاتووەو بەسەر کەسانی تردا دێت . واتە ڕووداوێکە کە هەموو مرۆڤێك دەگرێتەوەو بە تەنها یەك کەس ناگرێتەوە «مردن لای خەڵك ڕووداوێکی یەقینییە کە هەر دەبێت ببێت و دەربازبوون نییە لێی ، بەڵام هەموو ئەمانەیان لە تەجرەبەی مردنی کەسانی ترەوە بەدەست هێناوە»[3]. واتە لە ژیاندا بیستوویانەو خۆیشیان دەبینن کە مرۆڤەکان یەکە یەکە دەمرن و پێش ئەمانیش چەندەها مرۆڤی تر هەبوون کە ئێستا نەماون و مردوون ، بەهەمانشێوە ئەمانیش دەمرن و نامێنن ، ئا لەمەوە مردن لای خەڵك بووەتە ڕووداوێکی یەقینی . ئەم جۆرە تەماشاکردنەی مردن ، حەقیقەتی مردن دەشارێتەوەو وەك توانایەك سەیری ناکات کە لە ناو خودی مرۆڤدایە یاخود لە بوونی مرۆڤدایە ، بەڵکو وەك ڕووداوێك تەماشای دەکات کە لە دەرەوەو لە شوێنێکی نادیارەوە دێت و یەخەی مرۆڤ دەگرێت و کۆتایی بە ژیانی دەهێنێت .

---

(1) بڕوانە : اشكالية التواصل فى الفلسفة الغربية المعاصرة ، عمر مهيبل ، ص ١٥٥.

(2) بڕوانە: نداء الحقيقة ، مارتن هيدجر ، ص ٨٧ ـ ٨٨ .

(3) هـ . س ، ل ٨٨ .

# ململانێی بوونی ڕەسەن وبوونی ساختە
# لە مەحویدا

خـودێـك هـەیـە کە ناوی مەحوییە ، ئەم خودە نە کوردەو نـە عەرەبەو نـە فارسـە . ئـەم خـودە خـاوەنی جەسـتەیەکە کـە شـتێکی دیـارو بەرچـاوو زینـدووە بەردەوامبوونی زیندوویەتیی ئەم جەستەیە بەهۆی بوونێکەوە دەبێ ، کە بێتە ناو ئـەم جەستەیەوەو تیایدا بەرجەستە ببێت و لە ڕێگەی ئەم جەستەیەوە تواناو ئیمکانـەکانی بەدی بهێنێت .

دیاریکردنی جۆری ئەو بوونەی ئەم جەستەیە دەکاتە نشینگەی خۆی و تیایدا تواناو ئیمکانـەکانی دێنێتـە دی ، ئـەرکی خودەکە یـاخود مەحوییـە . کاتێك مـەحوی دەرگا دەرەکیەکەی جەستەی بە ڕووی دەرەوەدا داخـست و نەیهێشت بـوونی بێگانـە (کـە بـوونێکی سـاختەیە) بێتـە نـاو ئـەم جەسـتەیەوە ، ئـەوا دەرگـای نـاوەوەی ئـەو جەستەیە بە ڕووی بوونی ڕەسەندا دەکاتەوە . ئەم بوونـە ڕەسـەنە هـەم بـە خودەکە یـاخود مـەحوی و هـەم بەجەسـتەکەش ئاشـنایە ، لـە قـوڵایی مـەحوی خۆیـەوە سـەرهەڵدەدات و خـاوەنی کۆمـەڵێك توانـاو ئیمکـانی ڕەسـەنەو بەرەبـەرە بـەدییان دەهێنێت . ئەم تواناو ئیمکانانـە هـەم بـە کەسـەکەو هـەم بـەو کۆمەڵگەیـەش کـە ئـەو کەسەی تێدا دەژی ئاشنان و لەگەڵیاندا تەبان .

بـەڵام ئەگـەر خودەکـە یـاخود مـەحوی ، بـەهۆی کاریگـەری دەرەوە یـان لـە ئیهمالی خۆیەوە ، ئەم ئەرکە گرنگ و ڕەسـەنەی خـۆی لـەبیر کـردو دەرگـای دەرەوەی جەسـتەی بـەڕووی بـوونێکی بێگانـەو سـاختەدا کـردەوەو ڕێگـەی پێـدا بێتـە نـاو جەستەیەوەو بیکاتە نشینگەی خۆی ، ئـەوا هـەم جەسـتەکەو هـەم خودەکـەش ، لـەو بوونە ڕەسەنە دادەبڕێن کە پێیان ئاشنایەو بوونـە سـاختەکە باڵادەست دەبێت و لـە ڕێگـەی ئـەم جەسـتەیەوە کۆمـەڵێك توانـاو ئیمکـان بـەدی دەهێنێـت ، کـە هـەم بـە جەستەکەو هەم بە خودەکەش نائاشنان . ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کەسەکە یاخود مەحوی هەست بە نائارامی و شڵەژان بکات ، هەوڵی ئەوە دەدات لـەو بوونـە سـاختەیە خۆی ڕزگار بکات و بەرەو بوونە ڕەسەنەکەی خۆی بگەڕێتەوەو تواناو ئیمکانەکانی ئەو بوونەی خـۆی بـەدی بهێنێـت . بـەڵام بوونـە سـاختەکەش بەئاسـانی ناچێتە دەرەوەو هەوڵی مانەوەو باڵا دەست بوون دەدات بەسەر مەحویدا . جارێك ئـەم سـەردەکەوێت و

بالاّ دەست دەبێت ، جارێك بوونە رەسەنەكە . ئەم حالّەتە بە روونی لەم شیعرەی مەحویدا رەنگی داوەتەوەو هەستی پێدەكرێ ، كە دەلّێ :

**یار از وفا گذشت بر این کشته‌ء جفا**

**شد مشهدم ز مقدم او روضه‌ء صفا**

**چون در قفاش دلشده‌گانش نمیفتند**

**«کاکل کمند جان و دل افکنده بر قفا»**[1]

واتای دێڕی یەكەم و دووەم یەك لە دوای یەك بەم جۆرەیە : «یار لە رووی وەفادارییەوە بەسەر ئەم كوشتەی بێ مەیلیی خۆیەدا تێپەڕی ، بەهۆی ئەو تێپەڕینەوە كە دەمێ بوو چاوەڕوانی بووم و لەبەر نەبوونی شەهید بوو بووم ، جێگای شەهید بوونەكەم كە بە خوێنی خۆم رازابووەوەو بوو بوو بە گوڵزار ، بوو بە باخچەی خۆشی و رابواردن . مادەم یار كاكۆڵی خۆی كردووە بە كەمەندی گیانی دڵداران و دڵیانی داوە بە كۆڵیا ، ئیتر چۆن دۆستە دڵ رۆیشتووەكانی - بە دوای دڵە رۆیشتووەكانیاندا - نەكەونە دوای ، یا چۆن دڵیان لە دوایەوە نەكەوێ ، كە یەكە یەكە لە كۆڵی دادەكەون»[2]

بە بۆچوونی ئێمە لێكدانەوەی دێڕی یەكەم بەو جۆرەیە كە بە هۆی هاتنی یارەوە شێوەو دیمەنی مەحوی بووە بە گوڵزار و رازاوەتەوە ، نەك شوێنی شەهید بوونەكەی ، بەم پێیە مەحوی بە دابڕان لە یار دەپوكێتەوەو بەرەو نەمان دەچێت ، بەڵام بە دەركەوتنی یار وەك گوڵ دەبوژێتەوە . دێڕی دووەمیش ماناكەی وای لێ دێت : مەحوی دڵی خۆی داوە بە یار ، ئەویش دڵی مەحوی داوە بە كۆڵیا ، ئەگەر بە هۆی بێوەفایی مەحویەوە بڕوات و لە مەحوی دوور بكەوێتەوە ، ئەوا دڵی مەحوی لە كۆڵی دەكەوێتە خوارەوەو بێ جێ دەبێت ، بۆیە مەحوی لە تاو دڵی بۆ ئەوەی بێ جێ نەكەوێت دوای یار دەكەوێت . بەڵام ئایا مەبەستی لە یار كێیە ؟ ئەگەر لە ئاستێكی قووڵداو لەم شیعرەوە لە (یار) بڕوانین و لێكی بدەینەوە ، ئەو (یار)ە بوونی رەسەنی مەحوی دەگرێتەوە كە هەندێكجار ئامادەیەو هەندێ جاریش بزرەو هەستی پێ ناكات . لێرەدا ماوەیەكە لەو بوونەی دابڕاوەو هەستی پێ نەكردووە ، لەم حالّەتی

(1) د . م ، ل ١٠ _ ١١ .

(2) د . م ، ل ١٠ _ ١١ .

بزری و هەست نەکردنەدا بە بوونی خۆی ، تەنانەت ئەوەی بیرچووەتەوە کە کوردەو دەبێ بە زمانی کوردی شیعر بنووسێت ، بۆیە ئەم شیعرەی بە زمانی فارسی دەست پێکردووە . بەم گەڕانەوەو سەرهەڵدانەوەی بوونە رەسەنەکەی (کە بە یار ناوی دەبات) ، ئینجا خۆی بیر دەکەوێتەوەو لە دێڕی دواتردا دەڵێت :

**کوردی زوبانی ئەسڵمە گەر تەرکی کەم بە کول**

**بۆ فـارسی بە کوللی ئەمن دەبمە بێ وەفـا[1]**

واتە کوردی زمانی ئەسڵی منە ، ئەگەر بۆ فارسی واز لە کوردی بهێنم ، ئەوا من دەبمە کەسێکی بێ وەفا بەرامبەر ئەسڵی خۆم . مەبەست لەم ئەسڵەی خۆی ، بوونی ئەسڵی ، یاخود بوونی رەسەنی خۆیەتی و زمانی ئەو بوونە ئەسڵیەی کوردییە . کەواتە خۆشی کوردەو دەبێ بە زمانی کوردی شیعر بنووسێت نەك بە فارسی .

بەڵام لێرەداو لە بیرکردنەوەی مەحویدا ئەوە دەردەکەوێت یاخود هەست بەو بۆچوونە دەکرێت کە لەوانەیە (کوردبوون) تاوان بێ ، بۆیە یەکێك (کە بوونێکی ساختەیە) لە ناخیدا ئەم بۆچوونە زیندوو دەکاتەوە ، مەحویش رووی دەمی دەکاتە ئەو و پێی دەڵێت :

**دووری مەبینە تۆ لە کەریمی بەهانە جۆ**

**هەرچی کە کوردە پاکی ببەخشێ بە (بوالوفا)[2]**

بۆچی کوردبوون بە تاوان دادەنرێ ؟ بە دووری مەزانە ئەو خوایەی لە بیانویەك دەگەڕێ تا بە هۆیەوە لە بەندەکانی خۆش بێت ، لە هەرچی کوردە خۆش ببێت و لەبەر خاتری (بوالوفا) هەموویان ببەخشێت . بە پێی لێکدانەوەکانیش بۆ (بوالوفا) ، لەوانەیە مەبەست لێی پێغەمبەر بێ ، یان (بوالوفا)ی کوڕی سیراجەدینی تەوێڵەبێ[3]، هەرچەندە لە دێڕەکانی تردا دەردەکەوێ کە مەبەست لە (بوالوفا) پێغەمبەرە (د.خ) .

بەڵام لێرەدا مەبەست لە (بوالوفا) هەر کامێکیان بێ ، رەمزی ئەو کەسەیە کە بەتەواوی هەستی بە بوونی خۆی کردووەو لەگەڵ ئەو بوونەیدا تەبایەو بەهۆی ئەم تەباییەی لەگەڵ بوونی خۆیدا ، لای خوا بەڕێزەو تکاکردنی دەخوات ، بۆیە لە دێڕی

---

(1) د . م ، ل ١١ .

(2) د . م ، ل ١١ .

(3) بڕوانە : د . م ، ل ١١.

دواتردا له خوا دەپارێتەوه لـه بـەر خـاتری پێغەمبـەر لێـی خـۆش ببێـت . لێـرەدا ئـەو پرسیارە سەر هەڵدەدات کە ئەم داواکردنی لێخۆش بوونە لە چییە؟ دەبـێ چ تـاوانێکی کردبێ ، وا داوای لێخۆش بوون دەکات ؟ له دوای ئەوەی بەدووری نازانێت (کوردبوون) لای خوا قبولّ بێت و بوونە رەسـەنەکەی خـۆی کـە سـەر هەڵدەداتـەوەو دێتـەگۆ ، بـه کوردی شیعر دەنووسێ ، لێرەدا هێشتا مەحوی تەواو دڵنیا نییە کە شیعر نووسـین بـه زمانی کوردی گوناح نەبێت و خۆی بە گوناهبار دەزانێت ، بۆیە رووده‌کاتە خـواو لێـی دەپارێتەوە کە لەبەر خاتری پێغەمبەر لێی خۆش ببێت ، چونکه بـە کـوردی شیعری نووسـیووەو ئەمـەش وازهێنانـە لـەو بوونـەی کـە هیـی عەرەبـەو لەرێگـەی ئیـسلامەوه هاتووەتە ناو مەحوییەوە .

## عەفووم کە (یاعفو) بە حەق جاهی ئەو شەهە
## ئایـەی عـولووی جـاهی ئـەوە ئـایـەتی (عفا)[1]

لێرەدا لەنێوان خۆی و خوادا پێغەمبەر دێنێتە نـاوەوەو داوا لـە خـوا دەكـات لەبەر خاتری ئەو پێغەمبـەرە پلـەو پایە بـەرزە لێـی خـۆش ببێـت . هێنانـە نـاوەوەی پێغەمبـەریش بـۆ ئەوەیـە عوزرێـك بـۆ بـەکوردی نووسـینی خـۆی بهێنێتـەوە ، لـەو روانگەیـەوە کـە پێغەمبـەریش هەرچـەندە ئـەو وەحیـەی لای خـواوە بـۆی هـاتووە لـە بناغەدا بە هیچ زمانێك نەبووەو تەنها وەك هەستێك بووەو نێردراوەتە ناخیەوە[2]، واتە بە زمانێکی دیاریکراو نەبووە ، بەڵام گەیاندنی ئەم وەحیە لە پێغەمبەرەوە بۆ کەسانی تـر بـە زمـانی عەرەبی بـووە ، ئەمـەش لەبەرئەوەیـە چونکه پێغەمبـەر خـۆی عـەرەب بـووە ، ئـەو وەحییـە نێردراوەتـە ناخییـەوەو دواتـر لـە نـاخی ئـەوەوە سـەری هەڵداوەتەوە ، ئەوەیش کە لە ناخی کەسێکەوە سـەر هەڵبـدات ، کەسـەکە سـەر بـە چ نەتەوەیەك بێت ، بە زمانی ئەو نەتەوەیە دەری دەبڕێت . مـەحویش مـادەم کـوردە ، ئەوەی لە ناخیەوە بێتەدەر ، بە کوردی دەری دەبڕێت ، هـەر بۆیـە شیعریش کـە لـه ناخیەوە دێتەدەر بە کوردی دەنووسێت .

بەڵام هێشتا مەحوی بە هۆی کاریگەری بوونێکی ساختەی عەرەبییەوە کە لـه رێگەی ئیسلامەوە هاتووەتە ناوی ، لەم راستیە بە گومانە کە بە کوردی نووسین تاوان

---

(1) د . م ، ل ١٢.

(2) فەرمودەی پێغەمبەر (د.خ) هەیە باسی ئەوە دەکات کە زۆر جار ئەو وەحیەی بۆی هاتووە ، لە شێوەی دەنگی جەرەس (دقات الجرس) دا بووە .

نییە ، بۆیە واز لە زمانی کوردی دێنێت و بە زمانی عەرەبی بە دێڕە شیعرێك وەسفی پێغەمبەر دەکات کە خوا سەلامی لە خۆی و هاوڕێ و خانەوادەکەی کردووەو دەڵێ :

**صلّی علیه الـهُنا ما یلیقُ بـه**

**مَعَ صَحْبِهِ وآلِهِ والأهلِ ذی الصَّفا**(1)

ئیتر لێرەدا مەحوی لە نێوان ئەو بوونە رەسەنەی خۆیدا کە کوردەو بوونێکی عەرەبیدا کە لە رێگەی ئیسلام و رۆشنبیری عەرەبی ئیسلامییەوە هاتووەتە ناوی ، لەگەڵ بوونێکی تری فارسیدا کە لەڕێگەی ئەدەبیاتی فارسیەوە تیایدا دروستبووە ، لە نێوان ئەم سێ بوونەدا دۆش داماوەو حاڵی تێکچووە ، بۆیە دەڵێ :

**تشویش حال من تو ز تخلیط من بفهم**

**ز اهل زمانه که رسد بر دلم جفا**(2)

بەوەدا لە نائارامی و تێکچوونی حاڵی من بەدەست ئەو بوونانەوە تێبگە ، کە لە نووسینی ئەم شیعرەدا تێکەڵکردنی سێ زمان روویداوە ، دەزانم کە زمانی کوردی ئەسڵمەو بوونی رەسەنم لەمەوەیە ، بەڵام زۆر و ستەم (جفا)ی خەڵکی ئەم سەردەمە بووە بە داخێك لە دڵمداو خەریکە لە خۆمم ون دەکەن ، ون بوونیشم لە تێکەڵکردنی ئەم سێ زمانەدایە کە ئەم شیعرەم پێ نووسیووە .

لێرەدا پێویستە لەسەر (جەفا) و (اهل زمانە) هەڵوەستەیەك بکەین و بزانین مەبەستی لە (جەفا) و لە (اهلی زمانە) چییە و کێیە ؟ ئەگەر قووڵ بەمەبەست و واتای ئەو دوو دەربڕینەدا رۆبچین و لە روانگەی بوونە رەسەنەکەی مەحوییەوە سەیری چەمکی وشەی (ئەهلی زەمانە) بکەین ، ئەوە دەردەکەوێ کە مەبەستی لە ئەهلی زەمانە هەردوو نەتەوەی عەرەب و فارسن ، کە یەکەمیان لە رێگەی ئیسلامەوەو دووەمیان لە رێگەی ئەدەبیاتەوە هاتوونەتە ناو مەحوییەوەو دوو بوونی ساختەیان تێدا دروستکردووەو هەریەکەیان دەیەوێت خۆی بەسەر جەستەی مەحویدا باڵادەست بێت و تیایدا بەرجەستە ببێت و جەستەو خودی مەحوی رەنگدانەوەی ئەو بن . بێگومان ئەمەش لەسەر حسابی بوونە رەسەنەکەی و لەناوبردنی ئەو بوونەیەتی . ئیشکردنی ئەو دوو بوونە ساختەیەش لەسەر نەهێشتن و لە ناوبردنی بوونە رەسەنەکەی ئازارو جەفایەو گەیشتووەتە دڵی . لێرەداو لەم حاڵەتەدا هەوڵدان بۆ

---

(1) د . م ، ل ١٢.

(2) د . م ، ل ١٣.

پەیوەستبوون بە بوونە رەسەنەکەیەوەو لە هەمان کاتدا جۆرە بێدەسەڵاتیەکیش بەرامبەر بەو دوو بوونە ساختەیە ، لە مەحویدا هەست پێ دەکرێت و هەوڵدەدات لە بوونە ساختەکاندا نەتوێتەوە ، بەڵام ناتوانێت بە تەواوی خۆیان لێ دابرێت و خۆی یەکلایی بکاتەوە بۆ بوونە رەسەنەکەی ، کە ئەمەشی پێ نەکرا ، بوونە رەسەنەکەی دەرناکەوێت و نایەت . مەحویش وادەزانێت ئەو بوونەی وەفای نییە بۆی ، بۆیە نایەت و دەرناکەوێت و داوای وەفای لە بوونە رەسەنەکەی کردووەو ، هەر خۆشی لەسەر زمانی بوونە رەسەنەکەیەوە وەڵامی خۆی دەداتەوەو دەڵێت :

**گفتا بتم : وفا طلب از من تو (محويا)**

**در عمر خود شنيدەای از عمر اگر وفا**[1]

واتە یارەکەم وتی : ئەی (مەحوی) ئەگەر لە هەموو ژیانتدا وەفات بیستووە، داوای وەفا لە من بکە . مەبەستی ئەوەیە کە وەفا لای مەحوی بوونی نییە ، کەچی داوا لە بوونە رەسەنەکەی دەکات کە وەفای بۆ مەحوی هەبێت و دەستبەرداری نەبێت ، لە کاتێکدا پێویستە مەحوی خۆی دەست بە بوونی رەسەنی خۆیەوەبگرێت و بیپارێزێت و وەفای هەبێ بۆی ، نەك داوای وەفا لەو بکات . واتە مانەوەو بەرجەستەبوونی بوونی رەسەنی مرۆڤ لە دەست کەسەکە خۆیدایە ، نەك لە دەست بوونەکەیداو دەبێ کەسەکە وەفای بۆ ئەو بوونە رەسەنەی خۆی هەبێت و پابەندی بێت و پارێزگاری بکات ، نەك بە پێچەوانەوە . لێرەدا مەحوی لە بەرامبەر بوونە ساختەکاندا لاوازبووەو وازی لە بوونە رەسەنەکەی خۆی هێناوەو وەفای بۆی نەبووەو بە بوونە ساختەو راگوزەرەکانەوە خەریکبووە ، کەچی داوای وەفای لەو کردووە . بۆیە ئەویش ئەوەی بەرووی مەحویدا داوەتەوە کە مەحوی خۆی پەیوەستی بوونی نائەسڵی تر کردووەو بەرەو ئەوان چووەو وەفای بۆ ئەم بوونە ئەسڵییەی خۆی نەبووە ، کەچی داوای وەفا لەم دەکات . لە کاتێکدا نابێ ئەم داوایە لە بوونی رەسەن بکات ، بەڵکو ئەمە ئەرکێکە لە سەر شانی خۆیەتی و پێویستە خۆی بەم ئەرکەوە پابەند بێ و جێبەجێی بکات ، چونکە ئەو بوونە ساختانەی تر وەك تەمەن وان و تاسەر بۆ کەس نامێنن و ئەوەی بمێنێتەوەو جاویدانی بێت بوونی ئەسڵیی مرۆڤ خۆیەتی ، بۆیە پێویستە مەحوی وەفای بۆ ئەم بوونە ئەسڵییەی خۆی هەبێت .

---

(1) د . م ، ل ١٣ .

بـوونی رەسـەنی مـەحوی لـە نـاو خۆیدایـە ، واتـە زۆر نزیکـە لێـی ، بـەڵام لەبەرئەوەی مەحوی بەدەرەوە خەریکەو ئاگای لەو بوونەی خۆی نییـە ، ئـەو بوونـەی ناوکەوتی کردووەو دەرناکەوێت . لە هەندێ حاڵەتـدا مـەحوی بـێ وازهێنـان لـە دنیـاو دەرەوە ، دەیەوێت ئەو بوونە رەسەنەی دەربکـەوێت و ببینێـت و ئامـادەی ئەوەیشە کە دەرکەوت و هات ، سەری لەبەر پێیدا دابنێت :

**وتـم : نـیازمە بەر پێتی خەم سەرم ، فەرمووی**
**بەنازو عیشوە : شەهیی بۆ گەدا کە نادا دەست**[(1)]

لێـرەدا (یـار ـ بـوون) زۆر لـە مـەحوی نزیکـە ، بۆیـە مـەحوی راسـتەوخۆ روودەکاتە (یار ـ بوون) و پێی دەڵێت من چاوەڕوانی دەرکەوتن و هاتنی تۆم ، هەر کـە تۆ دەرکەوتیت ، وەك نیشاندانی رێزو وەفا بۆت ، نیازمە سەرم بخەمە بەرپێت . بـەڵام (یـار ـ بـوون) بەمـە رازی نییـە ، چـونکە هەستدەکات ئەگـەر ئـەو خـۆی بـۆ مـەحوی دەرخات و مەحویش سەری خۆی لەبەر پێی ئەمدا دابنێت ، ئەوا وەك ئەوەیـە مـەحوی بووبێتە پاشـاو ئـەم بوونـە پاشـایەش وەك پاشـاکانی تـر نییـە ، کـە پاشـایەتیەکەیان لەوەوەیە دەسەڵات و سەروەت و سامان و وڵاتێکیـان لـەژێر دەسـتدایە بۆیـە پاشـان و ئەگەر ئەوانەیان نەما لە پاشایەتی دەکـەون ، ئـەم بـوون بـە پاشـایەی مـەحوی لـەوان جیـاوازەو لـەوەوەیـە کـە (یـار ـ بـوون) دەرکـەوت و مـەحوی پێـی گەیـشت و بـووە خاوەنی ، دەبێـتە پاشـا . ئەو یارەش کە مـەحوی بـە هۆیـەوە دەبێتـە پاشـا ، وەك پـارەو سـەروەت و سـامان و دەسـەڵات نییـە ، کـە دەبڕێنـەوەو بـە تێپـەڕبوونی کـات نـامێنن ، بـەڵکو ئـەم ، کـە مـەحوی بـووە خـاوەنی و کەوتـە بـەدیهاتن ، ئـەوا نـەهیچ کەسێك و نەچەرخی زەمانە ناتوانن کۆتایی پێ بهێـنن و لـەناوی بـەرن . دەرکـەوتنی ئـەم یـارەو گەیـشتنی مـەحوی پێـی ، مـەحوی بـەم پلـەو پایەیـە دەگەیـەنێت ، بۆیـە ئامادەیە سەری خۆی بخاتە بەر پێی . بـەڵام (یـار ـ بـوون) بەمـە رازی نییـە ، چـونکە سەری مەحوی هێشتا شایەنی ئەوە نییە بخرێتە بەر پێی یار :

**بەر پێی ئەوم بە مێژەرەوە ، سەر کە نا ، وتی**
**مـەحـوی تەمایە بمخەڵەتێنێ بە تووری پووت**[(2)]

(1) د . م ، ل ٧٠ .
(2) د . م ، ل ٨٤ .

ڕازی نەبوونی (یار - بوون) بەوەی کە مەحوی سەری خۆی بخاتە بەر پێی ، لەبەرئەوەیە کە سەری مەحوی وەك تووری پووتە ، چونکە ئەگەر تووری پووت نەبوایە ، ئەوەی دەزانی سەرێك کە مێزەری پێوەبێت ، مانای ئەوەیە خاوەنی ئەو سەرە ، کەسێکە کە مەلایەو مێزەری مەلایەتی بەسەرەوەیە ، ئەمەش پلەیەکی کۆمەڵایەتییەو مانای وایە مەحوی لە خەڵك و لە کۆمەڵگە دانەبڕاوەو لە ناویاندا تواوەتەوەو لەوان زیاتر پابەندی ئەو ڕێوڕەسم و دابونەریتانەیە کە کۆمەڵگەو ئایین دیاریی کردوون و بە هۆیانەوە بووەتە کەسێتییەکی ئایینی ، کە ئەمەش بوونێکی ساختەیەو دەرەوەو کۆمەڵگەو ئایین لە ناو مەحویدا دروستیانکردووە و مەحویش بەم بوونە ساختەیەوە پابەندە ، کەچی دەشیەوێت بەبێ وازهێنان لەم بوونە ساختەیە بوونە ڕەسەنەکەی دەرکەوێت و پێی بگات . بەڵام تا ئەو بوونە ساختەیە لەناو مەحویدا بێت ، (یار - بوون) خۆی بۆ مەحوی دەرناخات :

**دەیووت : قیامەت ئەڵبەتە ڕوومت نیشان دەدەم**

**ڕوو دەرخە تاکو ڕۆژی قیامەت هەڵێ لە ڕووت[1]**

لێرەدا (یار - بوون) هەستدەکات مەحوی بەجۆرێك لەو پلەوپایە ئایینی و کۆمەڵایەتیەدا تواوەتەوە ، مەگەر بە مردن بتوانێت خۆی لێ ڕزگار بکات . تا خۆشی لێ ڕزگار نەکات ، ئەوا بوونی ساختە لە ناویدا ئامادەیی هەیە ، کە بوونی ساختەش لە ناو مەحویدا ئامادەیی هەبوو ، (یار - بوون) خۆی پیشانی مەحوی نادات . بۆیە یار هەست دەکات مەگەر مەحوی بمرێت و بەو مردنەی لە کۆمەڵگەو پلەو پایەی کۆمەڵایەتی دابڕێت و لە قیامەتیشدا کە زیندووبوویەوە بوونی ساختەی تێدا نەماوە ، بۆیە یاریش لەوێ (واتە لە قیامەت) ڕووی خۆی پیشانی مەحوی دەدات . بەڵام مەحوی بە (یار - بوون) دەڵێت تۆ ڕووی خۆت دەرخە ، با بتبینم و جوانی و گەورەیی و شان و شکۆی تۆم بۆ دەرکەوێت ، بەمە لە کۆمەڵگەو پلەو پایەی ئایینی و بوونی ساختە دادەبڕێم و خۆم بۆ تۆ یەکلایی دەکەمەوەو ئەمەش وەك ئەوەیە بەو دەرکەوتنەی تۆ قیامەت ڕوویدابێت . بێگومان ئەمەش ڕوونادات ، چونکە (یار - بوون) دەرناکەوێت یاخود خۆی دەرناخات ، بۆئەوەی مەحوی بیبینێت و کە بینیی ئنجا واز لە بوونی ساختە و مەوجود و شتی دنیایی بهێنێت ، بەڵکو دەبێ مەحوی سەرەتا خۆی لەوانە دابڕێت و بەرەو خۆی بگەڕێتەوەو ئامادەی دەرکەوتنی (یار - بوون) بێت ، ئنجا (یار - بوون)

---

(1) د . م ، ل ٨٤ .

دەردەکەوێت . بەڵام لەبەرئەوەی مەحوی ئەمەی ئەنجام نەداوە ، (یار - بوون) لێی دووردەکەوێتەوەو خۆی پیشان نادات ، بۆیە دەڵێت :

**لە رێی ئەو شۆخەدا خۆم کردە خاك و پێی نەنا پێما**
**دەسا خاکی هەموو عالەم بەسەر خۆما نەکەم چبکەم**[1]

مەحوی دەیەوێت بەبێ وازهێنان لە دەرەوەو بوونی ساختە ، بەوەی کە وەك خاك لەبەر پێی یاردا بکەوێت ، ئیتر یار بێت و پێی پێدا بنێت ، کە ئەمەش مانای دەرکەوتنی (یار - بوون)ە . بەڵام دوای ئەوەی کە ئەم ماوەیەکی زۆر خۆی کردووەتە خاکی بەرپێی (یار - بوون) ، کەچی هەر نەهاتووەو پێی پێدا نەناوە ، واتە (یار - بوون) دەرنەکەوتووە . بۆیە مەحوی هەستدەکات تەنها ئەوەی بۆ ماوەتەوە کە لە تاو دەرنەکەوتن و نەهاتنی یار ، قوڕی هەموو عالەم بەسەر خۆیدا بکات ؛ چونکە دەرنەکەوتنی (یار - بوون) وەك مردنی کەسێکی زۆر زۆر نزیك و ئەزیزەو دەبێت قوڕی بۆ بپێوێت ، جگە لەوەی کە بەجێمانی مەحوییە لە یاران :

**بەجێ ماوم لە یاران ، نابەجێ ماوم ، ئەجەل زوو بە**
**بە مردن لەم قوصووری ژینە ئیستیعفا نەکەم چبکەم**[2]

دەرنەکەوتنی (یار - بوون) و نەگەیشتنی مەحوی پێی ، مانای دواکەوتن و بەجێمانی مەحوییە لەو کەسانەی کە بە (یار - بوون) گەیشتوون و بەو بوونەیانەوە ژیان بەسەردەبەن و لەم بەسەربردنەی ژیاندا بەو بوونە رەسەنەوە ، ئەو بوونەیان بەدیدێت . مەحوی هەستدەکات ئەو جۆرە کەسانە (کە لێرە بە یاران ناوی بردوون) بەوەی بوونیان دەرکەوتووەو پێی گەیشتوون و لە بەدیهاتندایە ، بەمە لە ژیاندا ئەرکی خۆیان بەجێگەیاندووەو ژیان و مانەوەیان لە دنیادا لە جێی خۆیدایەتی و شایەنی ئەوەن بژین و ژیانیان بەجێیە . بەڵام مەحوی لەبەرئەوەی بە هۆی کەمتەرخەمیی خۆیەوە ئەو بوونەی دەرنەکەوتووە ، هەستدەکات ژیانی ئەم ژیانێکی نابەجێیە ، چونکە پڕ ناتەواوی و کەموکوڕییەو بوونی ساختەو مەوجودی دەرەکی تێیدا ئامادەییان هەیە ؛ بۆیە مردن بە باشتر دەزانێت لەم جۆرە ژیانەو مانەوە لە دنیادا بە بوونێکی ساختەوە . هەرئەمە وای لێکردووە کە داوا لە ئەجەل بکات بێت و زوو بیمرێنێت و لەم جۆرە ژیانە رزگاری بکات . بۆیەش دەیەوێت بمرێت و لە ژیان رزگاری

---

(1) د . م ، ل ٢٣٠ .

(2) د . م ، ل ٢٣٣ .

بێت ، چونکە هەست دەکات بە جۆرێك بە دنیاو شتی دنیایی و بوونی ساختەوە خەریکبووەو پێوەیان بەستراوەتەوە ، زەحمەتە بتوانێت خۆیان لێ رزگار بکات . تا لەمانەش رزگاری نەبێت و لێیان دانەبڕێت ، (یار - بوون) دەرناکەوێت و خۆی پیشانی مەحوی نادات . (لەیلا - یار - بوون)یش کە هەستدەکات مەحوی بەمجۆرە بێ هیممەت بووەو تا لە دنیادا بێت ، زەحمەتە بتوانێت خۆی لە دنیاو مەوجودو بوونی ساختە دابڕێت ، ئەوا وادەی بەیەکگەیشتنی خۆی لەگەڵ مەحویدا دەخاتە رۆژی قیامەتەوە :

**ئەوا لەیلا بە رۆژی حەشر ئەدا وادەی لیقا (مەحوی)**

**هەتا قامی قیامەت ، ئاه و واوەیلا نەکەم چبکەم**[1]

کە (لەیلا - یار - بوون) وادەی دەرکەوتن و بەیەکگەیشتنی لەگەڵ مەحوی دەخاتە رۆژی قیامەتەوە ، مەحوی ئەمە بە کارەساتێکی ئەوەندە گەورە دەزانێت کە دەبێت تا رۆژی قیامەت شین و واوەیلا بکات و هەناسەی سارد هەڵبکێشێت ، چونکە دەزانێت دەرکەوتنی ئەو بوونە رەسەنەو گەیشتن پێی لە قیامەتدا روونادات و ، قیامەت شوێنی روودانی ئەو دەرکەوتنەی بوونی رەسەن و بەدیهاتنی نییە ، بەڵکو دنیاو ژیانی دنیا شوێنی دەرکەوتن و بەدیهاتنی ئەو بوونە رەسەنەیە . کە مەحوی بە هۆی خەریکبوونی بە بوونی ساختەو مەوجودو شتی دنیاییەوە رێگە لە دەرکەوتن و بەدیهاتنی ئەو بوونە بگرێت و لەم ژیانەدا زەمینەی بەدیهاتنی ئەو بوونەی ساز نەکات ، ئەوا ئیتر هەرگیز ئەو بوونەی دەرناکەوێت و بەدینایەت و ژیانی مەحوی ژیانێکی نابەجێ دەبێت . تەنانەت دابڕان لەو بوونە رەسەنەو دوورکەوتنەوەی ئەو بوونە لێی رۆژی مەحویی رەشکردووە ، بۆیە دەڵێت :

**لەو رۆژەوە جودا بووە لێم ئەو پەری وەشە**

**رۆژم رەشە ، شوعورو دڵم لێ بووە جودا**[2]

لەو کاتەوەی بەهۆی خەریکبوونی بە بوونی ساختەوە بوونە رەسەنەکەی (کە بە پەری وەش ناوی بردووە) لێی جودابووەتەوەو رۆیشتووەو دەرناکەوێت ، رۆژی روناکی لا تاریکبووەو سەری لێ تێکچووەو رێی بزرکردووەو بە جۆرێك حاڵی تێکچووە هەستکردنی نەماوەو دڵی لێ جودابووەتەوەو ، وەك ئەوەیە دڵی نەما بێت کە بەهۆیەوە هەست بە دەرکەوتن و هاتنی بوونی رەسەن دەکات . ئەم بارە ناخۆشەش وای لێ

---

(1) د . م ، ل ٢٣٣ .

(2) د . م ، ل ٧.

کردووه واز له دەرەوه بهێنێت و له بوونی ساختەو شتی دنیایی خۆی دابڕێت و خۆی بۆ بوونی ڕەسەن یەکلایی بکاتەوه . ئەم دابڕان له دەرەوەو چوون بەرەو بوونەش بە کارێکی گەورەو قورس دەزانێت ، بۆیه دەڵێت :

**بەس کاری دڵ توێنەوه مەحوی له پێشته**

**(لایَحْسَبُ الأناسِیُ اَنْ یُتْرَکُوا سدیً)**[1]

هەستدەکات ژیانی بۆئەوه نییه هەر وا بە فیڕۆی بدات و بە دنیاو بوونی ساختەوه خەریکبێت و ژیانێکی بێمانا بژی ، بەڵکو لەم ژیانەدا کاری دڵتوێنەوەو گەورەی هەیه کە دەبێت ئەنجامی بدات . یەکێك لەو کارانەش بریتییه لەوەی ڕووبکاتە بوونی ڕەسەنی خۆی و ئامادەی هاتنی ئەو بوونە بێت . ئەمەش بەوە دەبێت دڵ و دەروونی له دنیاو بوونی ساختە خاڵی بکاتەوەو چاودێری دڵی بکات ، تا لەڕێگەی دڵیەوه ، دەرك بە هاتنی (یار - بوون) بکات ، چونکە بەهۆی دابڕان لەو بوونە ڕۆژی تاریکبووەو لە تاریکیشدا ناتوانێت دەرك بە هاتن و دەرکەوتنی بوونی خۆی بکات و لە ڕێگەی بارودۆخ و حاڵەتی دڵیەوه هەست بە هاتنی (یار - بوون) دەکات ، بۆیه دەڵێت :

**دڵ لەسەر خۆ چوونی پەی دەر پەی دەلیلی یارە هات**

**عەقڵ و هۆش ئەی دڵ بکە حاضر له پێشە کارەهات**[2]

لەم حاڵەتەدا دڵی زووزوو لەخۆدەچێت ، لەخۆچوونەکەشی ئەوەیە بە تەواوی لە دنیاو دەرەوه دادەبڕێت و لێیان بێئاگا دەبێت و بەنسبەت ئەوانەوه دەکەوێتە حاڵەتی غیابەوه ، ئەمەش مانای ئەوەیە (یار - بوون) دێت . لێرەدا مەحوی هەستدەکات ئەو بوونەی دەردەکەوێت ، بۆیە داوا لە دڵی دەکات کە ئەو لەخۆچوون و بێئاگاییەی نەمێنێت و هۆش و عەقڵی بۆ دەرکەوتن و هاتنی (یار - بوون) ئامادە بکات ، چونکە کە (یار - بوون) هات ، کاری ئەم بریتی دەبێت لە خەریکبوون بەو بوونەوەو ئەمەش پێویستی بەوەیە هۆشی لای خۆی بێت و لە حاڵەتی بێئاگاییدا نەبێت . لێرەدا مەحوی لەوە بێئاگایە کە ئەو لەخۆچوون و بێئاگابوونەی دڵ لە دنیاو دەرەوەیەو بەم بێئاگابوونەی لە دەرەوه ، هۆش و عەقڵی ئامادەی هاتنی (یار - بوون) دەبن و کە هات پێوەی خەریکدەبن و کاریان بەدیهێنانی ئەو بوونە دەبێت .

---

(1) د . م ، ل ٧ .

(2) د . م ، ل ٥٦ .

ئەو ساتانەش کە ئەو بوونە بزرەو مەحوی لێی دادەبڕێت ئەوا هەستدەکات هیچ کارێکی نییە ئەنجامی بدات . لەم غیابەی بووندا ئەنجامدانی هەر کارێك خەریکبوونە بە دنیاو مەوجودو بوونی ساختەوە ، بۆیە مەحویش هەوڵدەدات خۆی لە سەرقاڵبوون بەو شتانەوە دووربگرێت و چاوەڕێی دەرکەوتنی (یار ـ بوون) بێت . لەم بێکاری و چاوەڕوانییەدا بێهودەیی دەیگرێت و نائارام دەبێت ، کاتێکیش ئەم نائارامییەی دەگاتە لوتکەو وای لێدەکات دڵی لەخۆ بچێت ، نیشانەی ئەوەیە بوونی رەسەن دەردەکەوێت . هەرچەند دەرکەوتن و هاتنی ئەو بوونە رەسەنە ئاسان نییەو ئازارو ناڕەحەتیی زۆری پێوەیە ، بەڵام کە ئەو بوونە سەریهەڵداو بەدیهات ، ئیتر ئەو کەسە دەبێتە کەسێکی نەمرو پێویستی بە ئاوی حەیات نابێت بۆ ئەوەی نەمری بەدەست بهێنێت :

**خضر ئەگەر چاوی حەیاتی بریە ئاوی حەیات**

**من لە خاکی دەری جانانمە هەر چاوی حەیات[1]**

خدری زیندە بەوە هەوڵی بەدەستهێنانی نەمریی داوە کە بە دوای (ئاوی ژیان)دا گەڕاوە ، دۆزیویەتەوەو لێی خواردووەتەوەو بووە بە کەسێکی نەمر . بەڵام مەحوی ئەم کارەی خدر بە هەڵە دەزانێت ، چونکە لە دەرەوەی خۆیدا بە دوای شتێکدا گەڕاوە کە بەدەستی بهێنێت و بە هۆیەوە ببێتە کەسێکی نەمر . مەحوی هەستدەکات نابێت مرۆڤ چاوەڕوانی ئەوە بێت لە دەرەوەی خۆی و بە هۆی شتێکی دەرەکییەوە نەمریی دەست بکەوێت ، چونکە ئەو نەمرییەی لە رێگەی شتی دەرەوە دەست مرۆڤ دەکەوێت ، نەمرییەکی راستەقینە نییەو وەهمییەو وەك بوونی ساختە وایە کە هەر بە رواڵەت بوونە . مەحوی هەستدەکات ئەگەر چاوی لە (دەری جانانە) ، واتە چاوی لە بوونی رەسەن بێت کە لە ناوەوەی خۆیدایە ، ئەوا کە ئەو بوونەی دەرکەوت و کەوتەبەدیهاتن ، بەمە دەبێتە کەسێکی نەمرو جاویدانی ، نەك بە ئاوی ژیان . دەرکەوتنی ئەم راستییەی کە مرۆڤ لە بوونی رەسەنیدا نەمری بەدەست دێنێت نەك بە ئاوی ژیان ، بووەتە هۆی ئەوەی ئاوی ژیان هەستبکات هیچ کارێکی نەماوە ئەنجامی بدات و دەبێت خۆی ونبکات :

**ون بووە لەو رۆژەوە لێوی حەیات ئەفزاتی دی**

**وا دەبێ شەرم و حەیا ئەی ئافەرین ئاوی حەیات[1]**

---

([1]) د . م ، ل ٦٣.

ئاوی حەیات لە ئەسڵدا نییە ، بەڵام ئەو بۆچوونە باوە کە گوایە هەبووەو دوایی ونبووە . مەحوی لێرەدا هۆی ونبوونەکەی دەگێڕێتەوە بۆ ئەوەی کاتێك ئاوی حەیات بوونی رەسەنی مرۆڤی بینی کە ژیانێکی راستەقینە بە مرۆڤ دەبەخشێت و ئەوەی ئەو بوونەی دەرکەوێت و پێی بگات ، ئەوا کەسێکی نەمرە ، هەستی کرد ئیتر مرۆڤ پێویستی بەو (واتە بە ئاوی حەیات) نەماوە تا بەدەستی بهێنێت و بەهۆیەوە ببێتە کەسێکی نەمر . ئەمە بووە هۆی ئەوەی خۆی ونبکات و بزر ببێت و مرۆڤ نەتوانێت بیدۆزێتەوە . لێرەدا مەحوی دەیەوێت ئەوە بڵێت کە ژیانی راستەقینەو نەمری لە بوونی رەسەنی مرۆڤدایەو پێویست ناکات لە دەرەوە بەدوایاندا بگەڕێت ، چونکە لە دەرەوەی خۆی دەست ناکەون ، بەڵکو لە ناو خۆیدان و تەنها ئەوەندەی دەوێت ئەو لایەنەی لە رێگەی دەرەوە تیایدا دروستبووە کە بوونێکی ساختەیە بیمرێنێت ، بۆ ئەوەی ئەو بوونە رەسەنەی دەربکەوێت :

**بۆ وەفا کردن بە وەعدەی هاتنی بمرە : وتی**
**کەس نییە ئیخطاری کا وا هاتووە وادەی وەفات**(٢)

لێرەدا مەحوی لەگەڵ ئەو لایەنەی خۆیدا دەدوێت کە بە دنیاوە پەیوەستەو بوونی ساختەی تێدایەو فەرمانی بەسەردا دەکات کە بمرێت بۆ ئەوەی کاتی هاتن و دەرکەوتنی (یار - بوون) بێت . مردنی ئەو لایەنەشی مانای نەمان و فەوتانی بوونی ساختە دەگەیەنێت و بەمەش بوونی رەسەن دەست بە هاتن و دەرکەوتن دەکات . مەحوی ئەمادەیە واز لە دنیاو شتی دنیایی وەك پارەو سەروەت و سامان و ...هتد بهێنێت بۆئەوەی (یار - بوون) دەربکەوێت . ئەو بوونەش کە لە ناو مرۆڤدا دەردەکەوێت و مرۆڤ لە ناو خۆیدا بە دەستی دەهێنێت ، بە هیچ شتێکی دنیایی ناچوێنرێت و لە بان شتە دنیاییەکانەوەیە ، هەر لەم روانگەیەوەیە مەحوی لە بارەی (یار - بوون)ەوە دەڵێت :

**عەنبەری سارا وتم زوڵفی ، نەباتی میصری لێو**
**زوڵفی ئاڵۆزا ، وتی لێوی کە ناوی من نەبات**(٣)

لێرەدا مەحوی وەك یارێکی بەرجەستە کە لە دەرەوەیەو لە هەر یارێکی دی

---

(1) د . م ، ل ٥٦ .
(2) د . م ، ل ٥٧ .
(3) د . م ، ل ٥٩ .

دەچێت ، سەیری (یار - بوون)ی کردووەو زوڵفی بە عەنبەرو لێوی بە نەبات چواندووە . بەڵام (یار - بوون) بەوە رازی نییە کە مەحوی وەك یارێکی دەرەکی سەیری بکات ، چونکە ئەمە مانای ئەوەیە هێشتا مەحوی نازانێت حەقیقەتی ئەو (یار - بوون)ەی چییەو دەرکی نەکردووە . ئەوەی ئەو پێوەی خەریکە (یار - بوون) نییە ، بەڵکو وێنەیەکی وەهمیی ئەو بوونەیە ، ئەمەش مانای وایە ئەوەی مەحوی پێوەی خەریکە بوونێکی ساختەیەو لە بوونە رەسەنەکەی خۆی دابڕاوە . دابڕانیشی لەو بوونەی وا دەکات ئەو بوونەی دەرنەکەوێت و نەیەت ، بۆیە مەحوی دەڵێت :

**ئەو نەهاتن دەردە داغی ئەو نەهاتن دەردەها**

**کەس بە دەردی من نەچێ ، وەك من نەبێ تووشی نەهات**[1]

بەلای مەحوییەوە نەهاتنی (یار - بوون) دەردو خەم و خەفەتە . ئەم نەهاتن و دەردو خەم و خەفەتەی نەهاتنی (یار - بوون) ئەوەندە قورس و گرانە ، لەوانەیە مرۆڤ لە بەرامبەریدا خۆی بۆ رانەگیرێت و واز لە چاوەڕوانیی دەرکەوتن و هاتنی ئەو بوونەی بهێنێت و رووبکاتە دنیا ، چونکە دنیا بە دیمەن وا دیارە ئەم دەردو خەم و خەفەتەی تیا نییە :

**جوان و شیرینە ئەگەر دنیا لە روودا میهرەبان**

**وەردی خارە ، شەهدی زەهری مارە ، عەهدی بێ ئەبات**[2]

دنیا بە نسبەت مرۆڤەوە هەڵخەڵەتێنەرەو جوان و شیرین و میهرەبان خۆی پیشانی مرۆڤ دەدات ، بەمە مرۆڤ لە خشتە دەبات و بەرەو خۆی رایدەکێشێت و لە بوونی رەسەنی خۆی دایدەبڕێت . لە کاتێکدا حەقیقەتی دنیا بەم جۆرە نییەو رێك پێچەوانەی خۆی ، خۆی پیشانی مرۆڤ دەدات . واتە دڕك بە گوڵ و ژەهری مار بە هەنگوین ، پیشانی مرۆڤ دەدات و پەیمانی شتی جوان و شیرین بە مرۆڤ دەدات ، کەچی لە بەرامبەر ئەو پەیمانەی خۆیدا بێ وەفایەو هەر ئەوەندەی مرۆڤەکەی بەرەو خۆی راکێشاو لە بوونی رەسەنی خۆی دایبڕی ، ئیتر پشتی تێدەکات و لە خۆشی و شادییە رووکەشەکانی خۆی بێبەشی دەکات و کەسەکەش لەبەرئەوەی بەهۆی رووکردنە دنیاوە لە بوونی رەسەنی خۆی دابڕاوە ، بێهودەیی و خەم و خەفەت و ئازارێکی وا رووی تێدەکەن کە هیچ دەردێ پێی ناگات . واتە رووکردنە دنیاو

(1) د . م ، ل ٥٩ .

(2) د . م ، ل ٥٩ .

خەریکبوون پێوەی خۆی لە خۆیدا دەردێکی گرانەو مایەی خەم و خەفەت و ئازارە ، بە هەمانشێوە رووکردنە بوونی رەسەن و چاوەڕوانکردنی تا دەردەکەوێت و دێت ، ئەمیش خۆی لە خۆیدا خەم و خەفەت و ئازاری پێوەیە . بەڵام ئەوەندە هەیە خەم و خەفەت و دەردی دنیا لە پێناو شتێکی رووکەش و بێماناداییەو بە نسبەت مرۆڤەوە چارەنووس و ئەنجامێکی باش و دڵخۆشکەری نییە ، بەڵام خەم و خەفەت و ئازاری چاوەڕوانیی بوون لە پێناو شتێکی بەرزو بەهادارداییەو سەرئەنجام و چارەنووسێکی باش لە پێش کەسەکەدایە کە دەرکەوتن و هاتنی (یار - بوون)ەو بەمە لە خەم و خەفەت و دەردو ئازار رزگاری دەبێت . هەستکردن بەم جیاوازییە وای لە مەحوی کردووە بڵێت :

**وەصیەتی مەجنوونە هەر کەس دەردی دنیا عارە بۆی**

**خۆ بکا وەك مـن بە دەردی عیشقی یارێ موبتەلا[1]**

رووکردنە دنیاو خەریکبوون پێوەی دەردێکەو کەسێك یەك جار هەستی بە بوونی رەسەنی خۆی کردبێت و لە چاو ئەو بوونەیدا بێ نرخی دنیای بۆ دەرکەوتبێت ، بە لایەوە عارە جارێکی تر بەرەو دنیا بچێتەوەو بە دەردی دنیاوە موبتەلا ببێت . بۆیە روو لە دنیا وەردەچەرخێنێت و بەرەو بوونی رەسەنی خۆی دەچێت و بە دەردی عیشق و گەیشتن بەو (یار - بوون)ەی خۆیەوە خۆی موبتەلا دەکات ، چونکە موبتەلا بوون بەم دەردەوە نەك هەر عار نییە ، بەڵکو کۆتاییەکی باشی هەیەو سەرئەنجام ئەو کەسە بەو بوونەی خۆی دەگات و ئارامی رووی تێدەکات . بەڵام ئەوانەی واز لەم بوونەی خۆیان دەهێنن و بە دنیاوە خەریك دەبن ، هەرگیز ناگەنە ئارامی و دەبنە کەسانێکی چاو برسی :

**چاویان ئەم ئەهلی دنیایە ئەوەندە برسییە**

**پادشاکانی بە دەمدا یەك سەری یەکتر دەبات[2]**

ئەوانەی وازیان لەو بوونە رەسەنەی خۆیان هێناوە کە لە ناو خۆیاندایەو لە چوون بەرەو دنیاو دەستکەوتنی شتی دنیاییدا هەست بە بوونی خۆیان دەکەن ، هەرگیز بە بوونێکی راستەقینەو ئارامی بەخش ناگەن و تا زیاتر شتی دنیایی بەدەستبێنن ، زیاتر چاو برسی دەبن و هەوڵی بەدەستهێنانی شتی زیاتر دەدەن .

---

(1) د . م ، ل ٢٨ .

(2) د . م ، ل ٦٠ .

تەنانەت پاشا ، کە زۆرترین ڕێژەی شتی دنیایی دەستکەوتووەو دەبێت ئیتر لەوەدا هەست بە بوونی خۆی بکات و ئارامی ڕووی تێ بکات ، کەچی هێشتا ڕازی نییەو پەلاماری پاشای تر دەدات و دەیەوێت ئەوەی ئەو پاشایەی تر هەیەتی بۆ ئەم بێت . ئەگەر ئەمەشی بۆ ئەنجام درا ، هێشتا هەوڵی زیاتر دەدات و هەرگیز ئارامی ڕووی تێ ناکات ، چونکە ئەوەی ئەو دوای کەوتووە مایەی ئارامی نییەو وەك سەراب وایەو تەنها لە دوورەوە خۆشەویست و ئارامی بەخشەو لە ئاو دەچێت ، کە لێی نزیك بوویەوە بۆی دەردەکەوێت کە ئاو نییەو سەرابە ، هەر ئەمە وای لە مەحوی کردووە بڵێت :

**بە ئاوی تێگەیشتین دنیا ئێمە هەر سەرابێ بوو**

**هەموو دەشچن بە خنکان و لە وشکیشە مەلەی مەخلووق**[1]

مرۆڤ لە ناخەوە حەزی لەوەیە حاڵەتی ئێستای خۆی تێپەڕێنێت و بەرەو پێشترو بەرەو کەماڵ بڕوات ، واتە لە ناخەوە تینووی شتێکە کە هێشتا پێی نەگەیشتووەو دەیەوێت پێی بگات و ببێتە کەسێکی پێگەیشتوو . کاتێك مرۆڤ وای زانی ئەوەی ئەو تینوویەتی و بە دوایدا دەگەڕێت دنیایە ، ئەوا شوێن دنیا دەکەوێت و هەوڵی بەدەستهێنانی دەدات ، کە بەدەستی هێنا ، هەست دەکات ئەو حەزو تینوویەتیەی ناخی هەر ماوەو چۆن سەراب تینوویەتیی مرۆڤ ناشکێنێت ، دنیاش ئەو حەزو تینوویەتیە ناوەکییەی ئەمی نەشکاندووەو ئەوەی ئەو دوای کەوتووە ، ئەوە نەبووە کە تینوویەتی دەشکێنێت و ئارامی بە مرۆڤ دەبەخشێت . لەمەوە ئەوەی بۆ دەردەکەوێت دەبێت ئیتر واز لە دنیا بێنێت کە وەك سەرابەو ڕوو لە بوونی ڕەسەنی خۆی بکات ، کە نەك هەر سەراب نییە ، بەڵکو گەوهەرێکەو لە ناو کەسەکە خۆیدایە . ئەوەی واز لەم گەوهەرە بهێنێت و ڕوو لە دنیا بکات ، واتە گەوهەرەکەی بگۆڕێتەوە بە دنیا ، مەحوی بە کڕیارێکی غەشیمی دەزانێت و لە بارەیەوە دەڵێت :

**لە سووقی دەهردا دوکانی هەر کەس موددەتی عومرە**

**گوهەر ـ دانە بە پشکڵ دانە مەحوی مامەڵەی مەخلووق**[2]

واتە هەر کەسێك لە ماوەی عومری خۆیدا یاخود لە ژیانی خۆیدا ، واز لە بوونی ڕەسەنی خۆی بهێنێت و ڕوو بکاتە دنیاو شتی دنیایی کە وەك سەرابن و پێوەیان خەریکبێت و ژیانی لە پێناو ئەواندا بەسەر ببات ، ئەوا وەك ئەوەیە ئەم

---

(1) د . م ، ل ١٨٢ .

(2) د . م ، ل١٨٢ .

کەسە دانە گەوهەری بەنرخی گۆڕیبێتەوە بە پشکلێ کە هیچ نرخێکی نییە . واتە بوونی ڕەسەن وەك دانەی گەوهەرەو شتە دنیاییەکان وەك پشکڵن و وازهێنان لە بوونی ڕەسەن و کەوتنە دوای بەدەستهێنانی شتی دنیایی ، وەك گۆڕینەوەی گەوهەرە بە پشکلێ . مەحوی هەستدەکات لە دوکانی عومری خۆیدا مامەڵەی لەم جۆرەی کردووە ، بۆیە تا ئێستا (یار - بوون) دەرنەکەوتووەو خۆی پیشانی ئەم نەداوە .

## خۆ ئامادە کردن بۆ دەرکەوتنی (یار – بوون)

مەحوی هەستدەکات تا لە ناو خەڵکدابێت و بە دنیاو شتی دنیاییەوە خەریکبێت ، لەبوونی ڕەسەنی خۆی دابڕاو دەبێت و ئەو بوونەی دەرناکەوێت . پێویستە ڕێگەیەك بدۆزێتەوە بۆ ئەوەی لە دنیاو خەڵك و دەرەوە دابڕێت و جەستەو ناخ و دڵی لە بوونی ساختەو بێگانە پاکبکاتەوەو بۆ دەرکەوتنی بوونی ڕەسەن خۆی ئامادە بکات ، بۆ ئەمەش دەبێت ڕوو بکاتە سارا :

**بەجێ نایێ دەبێ ڕوو کەینە سارا**

**حەقی ئادابی مەجنوونی لە شارا**[1]

مەرجیش نییە دەرچوون لەناو خەڵك و ڕووکردنە سارا بە جەستە بێت ، واتە لەوانەیە ئەو ڕۆیشتن و دەرچوونە لەناو خەڵك بە جەستە نەبێت ، بەڵکو بەوە بێت لە ناوەوەیدا خۆی لە خەڵك دابڕێت و ڕوویکاتە سارایەك کە سارای بوونی خۆیەتی و لەگەڵ ئەو بوونەی خۆیدا ئازادانە بژی ، چونکە ئەگەر لە ناو خەڵکدا بێت لەم ئازادی و سەربەستییە خودییە بێبەش دەبێت ، بەم دابڕانەی لە خەڵك ئازادی خۆی بە دەست دێنێت و لەژێر کاریگەریی ئەواندا نامێنێت . ئەمەش مانای هەڵبژاردنی بوونی خۆیەتی و بەمە فەزڵی ئەو بوونەی دەدات بەسەر عالەمداو بە تەواوی پاشەکشێ لە چواردەوری خۆی دەکات و ئەنجامی ئەم دابڕان و پاشەکشەیەش ڕۆچوونە بە قوڵایی بوونی خۆیدا . بەم ڕۆچوونە ئەوەی بۆ دەردەکەوێت کە ئەگەر بێت و لەم بوونەی خۆی دابڕێت و بەرەو دنیاو دەرەوە بچێت و بشبێتە دارا ، ئەوا ئەسکەندەرێکی لێ پەیدا دەبێت و دەیفەوتێنێت و نایهێڵێت ، بۆیە دەڵێت :

---

(1) د . م ، ل ۷ .

**که چەرخ ئەسکەندەری دی دەردەدار،**
**وتی : ئەم هەم بوو، هەمدەردی دارا**[1]

لەم دێرەدا مەحوی زۆر قووڵ و دوور دەڕوات و باسی دوو کەسی ناودار دەکات کە لە دەرەوەدا ، واتە لە پلەو پایەو دەسەلات و پاشایەتیدا ، هەستیان بە بوونی خۆیانکردووە . ئەوانیش داریۆشی پاشای فارسەکان و ئەسکەندەری مەکەدۆنین و مەحوی دەیەوێت لە ڕێگەی بەسەرهات و چارەنووسی ئەوانەوە ، ئەو ڕاستیە بسەلمێنێت کە ئەو بوونەی مرۆڤ لە دەرەوەو لای کەسانی تر هەیەتی ، تەنانەت ئەگەر دەسەلاتێکی گەورەو پاشایەتیش بێت ، ئەوە بوونێکی ساختەیەو کەسەکە ناتوانێت تاسەر پارێزگاری لەو بوونە بکات و خاوەنی بێت . ئەوەتە داریوش لەبری ئەوەی لە ناوەوەی خۆیدا هەست بە بووونی ڕەسەنی خۆی بکات ، لە دەرەوەو لە دەسەلات و پاشایەتیدا هەستی بە بوونی خۆی دەکرد ، بەلام لەبەرئەوەی ئەم بوونەی بوونێکی دەرەکی و ساختە بوو ، کەسێکی وەك ئەسکەندەری لێ پەیدا بوو ، کە لەو بەهێزتر بوو ، لە پاشایەتیی خست و تەخت و تاراجی تێکدا ، واتە لێرەدا بووونی ئەسکەندەر بەسەر بوونی داریۆشدا زاڵبوو و لە ناوی برد . ئەم بوونەی ئەسکەندەریش هەرچەند بوونێکی بە تواناو ئازاو دەسەلاتدار بوو ، بەلام لەبەرئەوەی ئەمیش دیسان بوونێك بوو کە ئەسکەندەر لە دەرەوەی خۆیدا بە دەستی هێنابوو ، واتە بوونێکی ساختە بوو ، چەرخی زەمانە بەسەریدا زاڵبوو و ئەو بوونەی نەهێشت و خۆی و دەسەلات و پاشایەتییەکەی لە ناو برد . واتە ئەگەر مرۆڤ واز لەو بوونە ڕەسەنەی خۆی بهێنێت کە لە ناوەوەی خۆیدایەو تەنها خۆی خاوەنیەتی و نەك هیچ کەسێك تەنانەت چەرخی زەمانەش ناتوانێت لێی بسێنێت و لە ناوی ببات ، ئەگەر مرۆڤ وازی لەم بوونەی خۆی هێناو لە دەرەوەدا بە دوای بووندا گەڕاو توانی بوونێکی دەرەکی بەدەست بهێنێت ، با ئەم بوونە دەرەکییەی ئەوەندە بەهێزیش بێت کەس نەتوانێت بەسەریدا زاڵ ببێت و لە ناوی ببات ، بەلام لەبەرئەوەی بوونێکی ساختەیەو لە دەرەوەی خۆیدا بەدەستی هێناوە ، ئەوا وەك مەوجودێکەو بە تێپەڕبوونی کات سیحرو هێزو توانای خۆی لە دەستدەدات و دەفەوتێت ، واتە چەرخی زەمانە لە دنیادا دەیفەوتێنێت و وەك هەموو مەوجودێك و بوونێکی ساختە لە ناو دەچێت . بەلام ئەگەر

---

(1) د . م ، ل ۷ .

مرۆڤ لە ناوەوەی خۆیدا بە دوای بوونی خۆیدا بگەڕێت و بتوانێت ئەو بوونەی بدۆزێتەوەو ببێتە خاوەنی ، ئەوا کەس ناتوانێت بوونی ئەو کەسە لە ناو ببات و بیفەوتێنێت . با ئەو کەسە لە دەرەوەو دنیادا زۆر بێدەسەڵاتیش بێت و بکرێت بە داردا ، بەڵام بەو بوونە رەسەنەی خۆی هەر نەمرەو بە کردن بە داردا کۆتایی بەو بوونەی نایەت و لەناو ناچێت ، هەرئەمە وای لە مەحوی کردووە بڵێت :

**مەتا حەق ناصیرە هەر حەقمە مەنظوور**

**وەکو (مەنصور) ئەگەر بمکەن بە دارا**[1]

لێرەدا لای مەحوی مەنصووری کوڕی حەلاج بە پێچەوانەی داراو ئەسکەندەرەوە بووە ، ئەوان لە دەسەڵاتی دنیایی و پاشایەتیدا هەستیان بە بوونی خۆیان دەکرد ، بەڵام لەبەرئەوەی ئەم جۆرە بوونە بوونێکی ساختەیەو لەدەرەوەی کەسەکەدایە لەناو دەچێت و نامێنێت ، بۆیە ئەوانیش لە ناو چوون و نەمان . بەڵام مەنصوور وازی لە دنیاو شتە دنیاییەکانی وەك پارەو سامان و خۆشی و...هتد هێناو لە ناوەوەی خۆیدا بە دوای حەق و راستیدا دەگەڕا (کە ئەم حاڵەتەش وەك گەڕانە بە دوای بوونی رەسەندا لای مەحوی) بۆیە توانی ئەو حەققەی بە دوایدا دەگەڕێ ، لە ناوەوەی خۆیدا بیدۆزێتەوە . نەشوەی دۆزینەوەی ئەو حەققە مەستیکردو لە دەرەوە دابڕاو ئاگای لە دەرەوە نەماو بە دەنگی بەرز هاواری دەکرد (انا الحق) و لەسەر ئەم وتەیەی کە لە دەرەوەو لای دەسەڵات و کۆمەڵگەی ئەو سەردەمە بە کوفر دادەنرا ، لە سێدارە درا . بەڵام مەحوی وا هەستدەکات کە حەللاج هەرچەند لە رووی جەستەییەوە فەوتانیان و لە ناویانبرد ، بەڵام لەبەرئەوەی لە ناو خۆیدا حەق و راستیی دۆزیبووەوەو لە پێناو دۆزینەوەی ئەو حەق و راستییەدا وازی لە هەموو شتێکی دنیا هێناو خۆی کردە قوربانی ، ئەوا بەو حەق و راستییەی ناوەوەی هەر کەسێکی نەمرە . بۆیە مەحویش ، دوای ئەو راستییە دەکەوێت کە لە ناو خۆیدایەتی و بریتییە لە بوونی رەسەنی خۆی و بەلایەوە کێشە نییە کە وەکو مەنصوور بکرێت بە داردا ، بەڵکو کێشەی مەحوی لە نەگەیشتندایە بەو بوونە رەسەنەی خۆی ، بۆیە دەڵێت :

**نەگەیمە ئەو جوانەو گەییمە پیری**

**مەدەد یا پیری پیرانی بوخارا**[2]

---

(1) د . م ، ل ٨ .

(2) د . م ، ل ٨ .

له لێکدانەوەی دێڕەکانی پێشەوەدا ئەوە دەرکەوت مەحوی دەرکی بەوە کردووە کە بوونی راستەقینەی مرۆڤ ، ئەو بوونە رەسەنەیە کە لەناو خۆیدایەتی و هیچ کەسێك و تەنانەت زەمانەش ناتوانێت بیفەوتێنێت و لە ناوی ببات . لەم دێڕەدا مەحوی بە (جوان) ناوی ئەو بوونە رەسەنەی دەبات . ناوبردنیشی بە جوان زۆر لە جێی خۆیدایەتی ، چونکە هەرچەند جوان بە مانای گەنج نایەت ، بەلام کە بە جوان ناوی برد واتە ناشیرین نییەو ئەمەش مانای وایە هەر لە تافی لاویدایەو پیر نەبووە، ئەمەش بەلگەی ئەوەیە مەحوی هەستی بەوە کردووە ئەو بوونەی ، وەك مرۆڤ نییە کە لە رووی جەستەوەو لە دەرەوەدا پیربوون رووی تێدەکات و بەرەبەرە بێهێزو لاوازی دەکات و لە ناوی دەبات . لێرەدا مەحوی هەستدەکات ماوەیەکی زۆرە وێڵی دوای ئەو بوونەی خۆی بووەو گەیشتووەتە تەمەنێك کە پیربووە ، کەچی دوای ئەو هەموو تەمەنە زۆرە ئەو بوونەی پیر نەبووەو هەر (جوان)ە واتە لە تافی لاویدایە . لێرەدا مەحوی هاوار لە دەست ئەوە دەکات کە لە رووی دەرەوە پیربووەو تەمەنی بەسەرچووە ، کەچی هێشتا لە ناوەوەیدا نەیتوانیوە بەو بوونە رەسەنەی خۆی بگات . ئەم نەگەیشتنەی بە بوونی رەسەنی خۆی وەك دووری دلدارێك وایە لە دلبەرەکەی و بووەتە مایەی خەم و خەفەت و لەڕو لاوازی کردووە ، بۆیە دەلێت :

**لەبەر زارو نەزاری بوومە وەك پووش**
**دە ئەمجا رابوێرە من بە زارا**[1]

لێرەدا رووی دەمی کردووەتە بوونە رەسەنەکەی و باسی حالی خۆی بۆ دەکات ، کە لە تاو دووریی ئەو و چاوەڕوانییەکی زۆرو نەگەیشتن پێی ، رەنگی زەرد هەلگەڕاوەو جەستەی لاوازو باریك بووە ، بۆیە داوا لە بوونەکەی دەکات کە جارێك ئەم (مەحوی )ی بە زاردا بێت . واتە جارێك یادی مەحوی بکات و خۆی بۆ دەرخات بۆ ئەوەی پێی بگات . بەلام دیارە ئەو بوونە مەحوییی هەر بە یاددا نەهاتووە ، بۆیە مەحوی حالی زۆر خراپ بووەو دەلێت:

**مەگەر تۆ عەرضی حالم کەی لە کن یار**
**قەلەم ساغی قسە من نیمە یارا**[2]

---

(1) د . م ، ل ٩ .
(2) د . م ، ل ٩ .

خراپبوونی حالّی مەحوی بەهۆی دەرنەکەوتن و نەهاتنی ئەو بوونەی و نەگەیشتنی بەو بوونەی ، گەیشتووەتە رادەیەك توانای ئەوەی نەماوە باسی حالّی خۆی بۆ (یار ـ بوون) بکات و داوا لە قەڵەمەکەی دەکات باسی حالّی ئەم بۆ یار بکات . ئەمەش مانای ئەوەیە مەحوی ئەوەی بەلاوە باشترە کە دەست لە دنیاو خۆشی و رابواردن هەڵگرێت و چاوەڕوانی هاتنی (یار ـ بوون) بێت . ئیتر ئەگەر نەهاتنی یارو چاوەڕوانیی مەحوی بۆ ئەو یارەی ، ببنە هۆی لەرو لاوازی و پیربوون و فەوتانیشی ، ئەوا ئەمەی بەلاوە باشترە لەوەی ئەو بوونەی لە بیر بکات و لە شتی دنیایی وەك پارەو سامان و دەسەڵاتدا هەست بە بوون بکات و پێیانەوە خەریکبێت و تیایاندا رۆبچێت . تەنانەت لەمە زیاتر دەڕوات و دەڵێت :

**وەرە دەستیٚ بە خونم کە نیگارین**

**خوێنی من حەلالّت بیٚ نیگارا**(1)

مەحوی پێی وایە ئەگەر دەرکەوتن و هاتنی ئەو بوونەی ببێتە هۆی کوژران و خوێن رژانی ، هەر ئامادەیەو تەنانەت خۆی داوا لە بوونەکەی دەکات کە بێت و خوێنی ئەم بڕێژێت و لە جیاتی خەنە بە خوێنی ئەم دەستی خۆی سورو رەنگاوڕەنگ بکات . ئەم داواکاریەشی لەبەرئەوەیە هەستدەکات نەهاتنی (یار ـ بوون) و دەرنەکەوتنی لەبەرئەوەیە بوونی ساختەو مەوجود ئامادەییان هەیەو جەستەی ئەم هێشتا نشینگەی ئەوانەو لەژێر دەستیاندایە ، بۆیە ئەو بوونە رەسەنەی نایەت . مەحویش داوای لیٚ دەکات کە بێت و ئەم بکوژێت و خوێنی بڕێژێت ، ئەم کوشتنەش ناکاتە کوشتنی ئەو مەحوییەی کە خاوەنی ئەو بوونە رەسەنەیە ، بەڵکو دەکاتە کوشتنی ئەو لایەنەی مەحوی کە بوونی ساختە تیایدا ئامادەیی هەیەو کوشتنی ئەو لایەنەش مانای کوشتن و فەوتانی ئەو بوونە ساختەیەو بەمەش رێگا بۆ هاتن و دەرکەوتنی بوونی رەسەن خۆش دەبێت و جەستەی لە مەوجودو بوونی ساختە بەتاڵدەبێتەوەو ئامادەی هاتن و دەرکەوتنی بوونی رەسەنی خۆی دەبێت . بەڵام ئەگەر ئەمە روونەدات ، واتە جەستەی مەحوی لە بوونی ساختە پاك نەبێتەوە ، ئەوا ئەو بوونە لە مەحوی وەردەچەرخێت ، بۆیە دەڵێت :

**زوو ئەو شۆخە لە عاشق وەردەچەرخیٚ**

**لەگەلّ کەس ، چەرخە ئەو ، ناکا مودارا**(1)

---

(1) د . م ، ل ٩.

لێرەدا مەحوی (شۆخ - یار - بوون)ی خۆی بە چەرخ چواندووە . لەو رووەوە کە چەرخی زەمانە بەرامبەر بە مرۆڤ تا سەر لەسەر یەکبار نییەو هەر رۆژەی بە جۆرێکە ، رۆژێك روو لە مرۆڤ دەکات و بەختەوەری دەکات ، رۆژێکی دی رووی لێ وەردەچەرخێنێت و بەدبەختی دەکات و توشی نەهامەتی دەکات . بوونی رەسەنی مرۆڤیش هەمان سیفەتی هەیە ، رۆژێك روو لە مرۆڤەکە دەکات و رۆژێك رووی لێ وەردەچەرخێنێت . بەڵام لێرەداو لە رووی ئەم سیفەتەوە جیاوازییەکی ریشەیی لە نێوان چەرخی زەمانەو بوونی رەسەنی مرۆڤدا هەیە : چەرخی زەمانە کە رۆژێك روو لە مرۆڤ دەکات و رۆژێکی تر رووی لێ وەردەچەرخێنێت ، ئەمە پەیوەندی بە مرۆڤەکەوە نییە ، بەڵکو پەیوەندی بە خودی چەرخی زەمانەوە هەیە کە بێ ئەباتەو دامەزراو نییەو هەر رۆژەی لەسەر بارێکە ، واتە بەرامبەر بە مرۆڤ بێوەفایە . بەڵام روو تێکردن و روو وەرچەرخاندنی بوونی رەسەن لە مرۆڤ ، لە بێوەفایی ئەو بوونە رەسەنەوە نییە بەرامبەر بە مرۆڤ ، بەڵکو پەیوەندی بە وەفاو بێوەفایی مرۆڤەکەوە هەیە بەرامبەر ئەو بوونە رەسەنەی خۆی ، ئەگەر کەسەکە وەفای بۆ ئەو بوونە رەسەنەی خۆی هەبوو و رووی لە بوونی ساختە وەرگێڕاو بەرەو بوونەکەی خۆی چوو ، ئەوا ئەو بوونەش بەرەو ئەو دەچێت . بەڵام ئەگەر کەسەکە بەرامبەر ئەم بوونەی خۆی بێوەفا بوو و رووی لێ وەرچەرخاندو بەرەو بوونی ساختەو شتی دنیایی چوو ، ئەوا ئەو بوونەش روو لەم کەسە وەردەچەرخێنێت . لێرەدا مەحوی لەوە بێئاگایە کە خۆی وەفای بۆ ئەو بوونە رەسەنەی خۆی نەبووەو بوونی ساختەو شتی دنیایی لە ناویدا هەن ، بۆیە ئەو بوونە رەسەنەی کە بەمەی زانیوە زوو لە مەحوی وەرچەرخاوە ، مەحویش وا دەزانێت ئەم روو وەرچەرخانەی بوونی رەسەن لەوەوەیە کە وەك چەرخ وایەو زوو وەردەچەرخێت . بەڵام مەحوی تا سەر لەم بێئاگاییەدا نەماوەتەوەو دواتر هەستی بەم جیاوازییە کردووە لە نێوان چەرخ و (شۆخ - یار - بوونی رەسەن )دا . ئەمەش لەم دوو دێڕەدا دەردەکەوێت کە دەڵێت :

**فەلەك هەرگا کەسێکی هەڵبڕی وەقتی هیلاکەتیە**
**کە سەر بۆ گەیینە پەت بێ پێ لە کورسی و ئەسکەمل چبکا**
**لە عوششاق و رەقیب ئەو شۆخە چاوی لوتفی وەرگێڕا**
**کە ئاسك ئادەمی یا سەگ ببینێ ، غەیری سڵ چبکا**[٢]

---

(1) د . م ، ل ١٠.
(2) د . م ، ل ١٥.

لێرەدا مەحوی بە تەواوی هەستی بەو جیاوازییەی نێوان بوونی رەسەن و چەرخ (کە لێرەدا بە فەلەك ناوی هێناوە) کردووەو جیای کردوونەتەوەو هەر یەکەیانی لە دێڕێکدا باسکردووە . کەچی پێشتر لەبەرئەوەی هەستی بەم جیاوازییە نەکردبوو هەردووکیانی لە یەك دێڕدا باس کردبوو ..

لە دێڕی یەکەمدا باسی چەرخی زەمانە (فەلەك) دەکات کە بەرامبەر بە مرۆڤ بێوەفایە ، مرۆڤ بەرز دەکاتەوەو پلەو پایەو سەروەت و سامانی دەداتێ و بەختەوەری دەکات ، مرۆڤەکەش بە تەواوی روو دەکاتە ئەو و عاشقی دەبێت ، کەچی لە ناکاو لەو مرۆڤە وەردەچەرخێت و بەدبەختی دەکات و دەیدات لە زەوی و ملی دەشکێنێت . بەڵام لە دێڕی دووەمدا باسی (شۆخ - یار - بوونی رەسەن) دەکات ، ئەو بوونە رەسەنە کاتێك روو لە عاشق وەردەچەرخێنێت ، کە دەبینێت لەناو عاشقدا رەقیب هەیە ، واتە بوونی ساختە هەیەو عاشق پێوەی خەریکە ، بۆیە چاوی لوتفی خۆی لەو عاشقەو رەقیبەکەی ناوی وەردەگێڕێت و غائیب دەبێت . بەڵام مەحوی لێرەدا نەك هەر بە بێوەفای دانانێت و گلەیی ئەوەی لێ ناکات کە رووی لەم وەرچەرخاندووە ، بەڵکو هەستدەکات بە نسبەت ئەو بوونەوە ، ئەمە شتێکی ئاساییەو حەققی خۆیەتی کە چاوی لوتفی لەم وەرگێڕاوە ،چونکە ئەم (واتە مەحوی) وەفای بۆ ئەو بوونە رەسەنەی خۆی نەبووەو رەقیبی هێناوەتە ناو خۆی ، بۆیە ئەو بوونەی رووی لێ وەرگێڕاوە . واتە هەستدەکات ئەوە بێوەفایی ئەم بووە وای لە بوونە رەسەنەکەی کردووە کە وەك چۆن ئاسك ، مرۆڤ یان سەگ دەبینێت سڵیان لێدەکاتەوە ، ئەو بوونە رەسەنەش سڵی لە عاشق (مەحوی) و رەقیب (کەدەکاتە بوونی ساختە) کردووەتەوەو چاوی لێ وەرگێڕاون و مەحویی تووشی خەم و خەفەت و دەردو ئازار کردووە ، بۆیە دەڵێت :

**بە ئاهم گەر رەقیبانت بسوتێن ئەی گوڵی رەعنا**

**مەڕەنجە توخودا شوعلە لە ئاقاری چقڵ چبکا**[1]

دووری مەحوی لە بوونە رەسەنەکەی (کە بە گوڵی رەعنا ناوی بردووە) بووەتە مایەی خەم و خەفەت و ئێش و ئازار بۆی و گەیشتووەتە حاڵەتێك کە ئاه و هەناسەی وەك ئاگری لێ هاتووە . هەستیش دەکات دووری خۆی لە (یار - بوون)و دەرنەکەوتنی ئەو یارەی بە هۆی ئەوەوەیە رەقیبەکانی (یار - بوون) لە ناویدان بۆیە یار نایەت . واتە نەهاتنی یار پەیوەندی بەوەوە هەیە بوونی ساختە (کە بە رەقیب

---

(1) د . م . ل ١٤ .

ناوی بردووه) له ناویدا هه‌یه‌و بووه‌ته هۆی ئه‌وه‌ی بوونه ره‌سه‌نه‌که‌ی نه‌یه‌ت ، بۆیه هه‌ستده‌کات ئه‌و ئاه و هه‌ناسانه‌ی که به‌هۆی دووریی یاره‌وه ئاگرین بوون ، لێره‌دا به‌که‌ڵکی دێن و ره‌قیبه‌کانی پێ ده‌سووتێنێت . سووتاندنی ره‌قیبیش مانای نه‌مانی بوونی ساخته‌یه له ناو مه‌حویدا که وه‌ك چه‌قڵ وان و رێگرن له‌به‌رده‌م هاتن و ده‌رکه‌وتنی بوونی ره‌سه‌ندا .

مه‌حوی که هه‌ستده‌کات ده‌رنه‌که‌وتنی ئه‌و بوونه ره‌سه‌نه‌ی و نه‌گه‌یشتنی ئه‌م پێی به هۆی ئه‌وه‌وه‌یه که به بوونی ساخته‌وه خه‌ریکه ، له‌م کاره‌ی په‌شیمانه‌و ده‌ڵێت:

**هه‌تا ماوه ده‌بێ ئه‌شکی نه‌دامه‌ت داوه‌رێنێ چاو**
**عه‌ره‌ق رێتن نه‌بێ شه‌خصی له کاری خۆ خه‌جڵ چبکا**[1]

لێره‌دا هه‌ست ده‌کات مادام چاوی له دنیاو شتی دنیایی و بوونی ساخته بووه‌و خۆی لێیان پاك نه‌کردووه‌ته‌وه‌و چاوه‌ڕوانی هاتنی (یار - بوون) نه‌بووه تابێت ، ده‌بێت هه‌تا ماوه شه‌رم له‌م کاره‌ی خۆی بکات و فرمێسکی په‌شیمانی و عاره‌قی شه‌رمه‌زاری برێژێت ، به‌ڵکو ئه‌م په‌شیمانی و شه‌رمه‌زارییه ببنه هۆی پاکبوونه‌وه‌ی جه‌سته‌ی له دنیاو بوونی ساخته‌و ، یار ده‌ربکه‌وێت . نه‌ك هه‌ر ئه‌مه ، ته‌نانه‌ت زۆر دوور ده‌ڕوات و ده‌ڵێت :

**سه‌فه‌ر جائیز نییه با بۆ حه‌ره‌م بێ له‌و به‌رو بوومه**
**فه‌قه‌ط مه‌جذوبی زنجیری نه‌صیبی ئاوو گڵ چبکا**[2]

مه‌به‌ستی له (به‌روبووم) ئه‌و بوونه ره‌سه‌نه‌یه که له خۆیه‌وه سه‌رچاوه ده‌گرێت و به‌رهه‌می خۆیه‌تی . واته شوێنی سه‌رهه‌ڵدانی ئه‌و بوونه ، ناوه‌وه‌ی خۆیه‌تی و پێی وایه نابێت مرۆڤ له پێناو هیچ شتێکی ده‌ره‌وه‌دا ، واز له‌م بوونه‌ی بهێنێت و لێی دوور بکه‌وێته‌وه ، ته‌نانه‌ت ئه‌گه‌ر ئه‌و شته‌ی ده‌ره‌وه شوێنێکی پیرۆزی وه‌ك که‌عبه‌ش بێت (که به حه‌ره‌م ناوی هێناوه) ، نابێت مرۆڤ واز له بوونی خۆی بهێنێت و به‌ره‌و ئه‌و بچێت . واته گه‌یشتووه‌ته ئه‌و بڕوایه‌ی که به هیچ جۆرێك چاو له‌و بوونه ره‌سه‌نه‌ی خۆی وه‌رنه‌گێڕێت و لێی دانه‌بڕێت ، ته‌نانه‌ت ئه‌گه‌ر چوون بۆ حه‌ره‌م که ده‌کاته چوون بۆ حه‌ج ببێته هۆی ئه‌وه‌ی خه‌یاڵ و بیرو هۆشی لای ئه‌م بوونه‌ی

---

(1) د . م ، ل ١٤ .
(2) د . م ، ل ١٥ .

خۆی نەمێنێت و لێی دابڕێت و بەهۆی پیرۆزیی حەرەمەوە خەیاڵ و بیرو هۆشی بگوێزرێنەوە بۆ ئەو حەرەمە ، ئەو چوونە بە جائیز نازانێت و مانەوەو ئاگابوونی لەو بوونەی خۆی بە باشتر دەزانێت لە چوون بۆ حەرەم ، چونکە هەستدەکات ئەو بوونەی خۆی وەك تۆوێکە (واتە : بوونە لە خۆیدا)و دەبێت زەمینەی بۆ خۆش بکات تا سەر دەربهێنێت و گەشە بکات و بێتە دی (واتە : ببێتە بوون بۆ خۆی) . بە جائیز نەزانینی چوونە حەرەمیشی لەبەرئەوەیە نەوەکو پیرۆزیی ئاوی زەمزەمی مەککەو خاکەکەی کە پێغەمبەری بەسەردا ڕۆیشتووەو مەزارەکەی لەوێیە ، بەرەو خۆیان رایکێشن و لە پیرۆزیی ئەو ئاو و گڵەوە ، کەسێتییەکی ئایینیی تیا دروست ببێت ( کە دەکاتە بوونێکی ساختە)و لە ئەرکی سەرەکیی خۆی دووربکەوێتەوە ، کە بەدیهێنانی بوونی رەسەنی خۆیەتی و ئەمەش ببێتە هۆی ئەوەی ئەو بوونەی بێناز ببێت و بەدی نەیەت . هەروەها لە دێڕێکی تردا دەڵێت :

**سرفراز بی نیازی از صفا و مروه گشت**

**هر که گردد جبهەسای کعبه کوی شما**[(١)]

واتە : هەرکەسێك ناوچەوانی بساوێت بە کەعبەی گەڕەك یان کۆڵانی ئێوەدا ، یاخود بەدەوری بارەگای کەعبەی کۆڵانی تۆدا بسوڕێتەوە ، سەربەرزی بێ نیازییە لە سەفاومەروە کردن . (سەفاومەروە) کەبریتییە لە هاتن و چوون لە نێوان (صفا) و (مروه)دا ، کە دوو گردۆڵکەن و یەکێکە لە روکنەکانی حەج ، مەحوی پێی وایە ئەگەر زیارەتی کۆڵانی یارەکەی بکات ، پێویست ناکات بچێتە حەج و لەوێ سەفاومەروە ئەنجام بدات . واتە لەپێناو بەدیهاتنی بوونی رەسەنی خۆیدا ئامادەیە واز لەو کەسێتییە ئایینییە بهێنێت ، کە بەرەو جێبەجێکردنی ئادابەکانی ئایین رایدەکێشێت و وای لێدەکات لە بوونی رەسەنی خۆی بێئاگابێت و لە یادی بکات . ئەم ئامادەییەی مەحوی بۆ وازهێنان لە بوونی ساختە ، وا دەکات دەمی دەرکەوتن و هاتنی یار نزیك ببێتەوە ، بۆیە دەڵێت :

**گەردی رێی هەستاوە جێ داوا دەکا**

**بەختە مالی چاوی کێ ئاوا دەکا**[(٢)]

لێرەدا هەستدەکات ئەو بوونەی جێیەك یاخود بڵێین جەستەیەکی نییە تا تیایدا نیشتەجێ ببێت و لە رێگەی ئەو جەستەوە بەدی بێت . واتە بوونەکەی ئامادەی

(1) د . م ، ل ٤٧٦ .

(2) د . م ، ل ٢٢ .

دەرکەوتن و بەدیهاتنەو جێیەکی دەوێت کە زەمینەیەکی لەبار بێت و تیایدا وەدی بێت . مەحوی هەستدەکات جێی ئەو بوونە جەستەی ئەمە ، بۆیە ئامادەیی خۆی بۆ هاتنی ئەو بوونە بۆ ناو جەستەی ، بەوە نیشاندەدات کە سەجدە بۆ ئەو بوونەی ببات ، کەچی:

**وەردەگێڕێ روو کە سەجدەی بەر دەبەم**
**مەی دەڵێ کەی نوێژی رۆژاوا دەکا**[1]

لێرەدا مەحوی هێشتا بە تەواوی وازی لە بوونی ساختەو مەوجود نەهێناوەو لە ناو خۆیدا دەری نەکردوون ، کەچی بەرەو (یار - بوون)یش دەچێت و سەجدەی بۆ دەبات . ئەویش رووی لێ وەردەگێڕێت و سەجدەکەی قبوڵ ناکات ، واتە نایەتە ناو جەستەی مەحوی ، چونکە کاتی ئەوە نەهاتووە بێتە ناو جەستەی مەحوی و هێشتا ئەو جەستەیەی مەحوی بوونی ساختەی تێدایەو سەجدەکەی لە کاتی خۆیدا نییە . مەحوی وا دەزانێت بەوەی سەیری مەوجودو بوونی ساختەو دەرەوە نەکات و تەنها سەیری ئەو بوونەی خۆی بکات ، ئیتر چاوی دەبێتە جێی ئەو بوونە ، بۆیە دەڵێت :

**چاوە جێی ئەو شۆخە بێ ، وتم و ، وتی:**
**ئەم مەلا شێخە قسەی بێ جا دەکا**[2]

بەڵام ئەو بوونە رەسەنەی بەمەش رازی نییەو ئەم بۆچوونەی مەحوی بە قسەی بێ جێ دەزانێت . لەو رووەوەش بە بێ جێی دەزانێت کە مەحوی هێشتا بە مەلایەتی و شێخایەتییەوە پابەندە ، کە پلەی کۆمەڵایەتین و بوونێکی دەرەکییانە دەدەن بە مەحوی ، واتە ئەم بوونە بوونە بۆ دەرەوەو بەمە مەحوی لای دەرەوە ئامادەیی هەیەو دەرەوەش لای ئەم ئامادەییان هەیە . بەم پێیە مەحوی هێشتا لە ناخەوە بەتەواوی لە دەرەوەو دەوروبەر دەنەبڕاوەو خۆی بۆ ئەو بوونەی یەکلایی نەکردووەتەوە ، بۆیە ئەو بوونەش هاتنە ناو چاوی مەحوی رەد دەکاتەوە ، نەک هەر ئەمە ، بەڵکو بە کوژراوێکی رێگەی بوونیش قبوڵی ناکات :

**کوشتەی ئەو چاوەم لە جەمعی کوشتەگان**
**خەنجەری موژگانی من (منها) دەکا**[3]

(1) د . م ، ل ٢٣ .
(2) د . م ، ل ٢٣ .
(3) د . م ، ل ٢٣ .

لێرەدا کە باسی کوشتن دەکرێت ، مەبەست لێی کوشتنێکی واقیعی نییە ، بەڵکو کوشتنێکی زەینییەو بریتییە لە کوشتنی ئەو مەوجودو بوونە ساختانەی کە لە مەحویدان بۆ ئەوەی لێیان پاك ببێتەوەو ناوەوەو جەستەی ببنە نشینگەیەکی ئامادە بۆ دەرکەوتن و هاتنی بوونی رەسەن . مەحوی دەیەوێت ئەم کوشتنە لە لایەن (یار ـ بوون)ەوە ئەنجام بدرێت ، بەلام ئەم کوشتنە لە لایەن بوونەوە ئەنجام نادرێت ، بەڵکو لە لایەن مەحوی خۆیەوە ئەنجام دەدرێت و بەوە دەبێت لە ناوەوەیدا بە تەواوی ئامادەی وازهێنان بێت لە بوونی ساختەو مەوجودو ئەو شتە دنیاییانەی کەبوون بە بەشێك لەو (واتە لە مەحوی) ، ئنجا ئەو کوشتنە ئەنجام دەدرێت . دیارە لێرەدا مەحوی هێشتا لە ناوەوەیدا ئامادەیی وازهێنان لەو شتانەی تێدا نییە ، بۆیە (یار ـ بوون) لە کۆمەڵی ئامادەبووان بۆ کوشتن ، جیای دەکاتەوەو بەو داخ و زامەوە بە جێی دەهێڵێت :

**زامی دڵ وێران و ماڵ ئاوا طەبیب**
**ماڵی وێرانم کە ماڵ ئاوا دەکا**(1)

کە دڵی مەحوی وێران بوو بوونی ساختەو شتی دنیایی تێدابوو ، ئەوا دڵێکی زامارەو بوونی رەسەنیش دڵی زامدار و وێرانی ناوێت تا بیکاتە ماڵی خۆی ، بەڵکو دڵێکی ساغ و ئاوەدان بە یادی خۆی دەوێت و دڵی مەحویش هێشتا لەمجۆرە دڵە نییەو ، بوونەکەی هەستدەکات ئەو دڵە هێشتا ئەو جێیە نییە کە ئەم تێیدا نیشتەجێ ببێت ، بۆیە ماڵئاوایی دەکات و دەڕوات . بەلام ئەگەر هاتوو مەحوی ماڵی خۆی وێران کرد کە دەکاتە وازهێنان لە دنیاو دەرەوە ، ئەوا ماڵی بوونەکەی (کە دەکاتە دڵی) ئاوەدان دەبێتەوەو ئەم ئاوەدانبوونەوەیەش بەوە دەبێت کە بوونەکەی حزوور پەیدا دەکات . ئەمەش وادەکات وەك چۆن بولبول روودەکاتە گوڵ مەحویش ئاوا رووبکاتە بوونەکەی :

**وەك بولبول ئەو دڵە بە گوڵی روو کە روو دەکا**
**پەروانەیە زیارەتی شەمع ئارەزوو دەکا**(2)

---

(1) د . م ، ل ٢٤ .
(2) د . م ، ل ٢٥ .

واتە وەك چۆن بولبول بەرەو گوڵ دەچێت و پەپوولە بەرەو مۆم ، دڵی مەحویش ئاوا بەرەو ئەو بوونەی خۆی چووە ، بەڵام دیارە ئەو بوونەی ئیستیجابەی بۆ ئەم نەبووە ، بۆیە دەڵێت :

**من وەصڵی ئەو بەرابەر جەننەت دەگرم و ئەو**
**دۆزەخ بە ئاهی سینەیی من رووبەڕوو دەکا**[1]

مەحوی هەستدەکات گەیشتن بەو بوونەی وەك بەهەشت وایەو لە خەم و خەفەت و ئازاری دووری رزگاری دەکات . کەچی بوونەکەی ئاهەکانی سینەی مەحوی بە دۆزەخ دەزانێت ، چونکە لە پێناو ئەمدا هەڵی نەکێشاون و بۆ شتی دنیایی و مەوجودبوون و هێشتا نەیتوانیوە خۆی لەو شتانە پاکبکاتەوە . ئەمەش وای کردووە سینەی بە نسبەت ئەو بوونەیەوە وەك دۆزەخێك بێت و بوونەکەی ئامادە نەبێت بچێتە سینەیەوە ، وەك چۆن پێشتر ئامادە نەبوو بچێتە چاویەوە . واتە جەستەی مەحوی لەم حاڵەتەدا لە بوونی ساختەو مەوجودو شتی دنیایی پاك نەبووەتەوەو هێشتا مەیلی بۆیان هەیە ، بۆیە ئەو بوونەی نایەتە ناوی . مەحوی دەرکی بەم حاڵەتەی خۆی کردووەو هەستدەکات لەم رووەوە لە سۆفییەك دەچێت کە :

**ریشێکی پان و تووکی بنا گوێ درێژو لوول**
**صۆفی لە دینی لادە بە دیمەن لە جوو دەکا**[2]

جولەکە وا مەشهوورن کە زۆر دنیاپەرستن و حەزیان لە سەروەت و سامان و پارە کۆکردنەوەیە . سۆفییەکیش کە بە رواڵەت وازی لە دنیاو سەروەت و سامان هێنابێت ، بەڵام لە ناوەوە حەزی لێیان بێت ، ئەوا وەك جولەکە وایە . مەحویش بۆئەوەی وەکو سۆفی و جوولەکەی لێ نەیەت ، حەزدەکات ئەو بوونەی بێت و ئیتر لەم جۆرە حەزو ئارەزووەی سۆفی و جوولەکە ، کە مایەی غەم و ناخۆشی و پەژارەیە رزگاری ببێت و بەیەکگەیشتنی لەگەڵ ئەو بوونە ، بۆی ببێتە بەهەشت . لە کاتێکدا نابێت مەحوی لە تاو خەم و پەژارەو ناخۆشی ، کە وەك دۆزەخ وان بۆی ، ئارەزووی لە هاتنی یار بێت بۆ ئەوەی لەو دۆزەخە رزگاری ببێت ، بەڵکو دەبێت سیفەتی عاشقی هەبێت و لە پێناو ئەو بوونەیدا بە هەموو جۆرە خەم و خەفەت و دەردو ئازارێك

(1) د . م ، ل ٢٥ .
(2) د . م ، ل ٢٥ .

رازی بێت . هەر ئەمە وایکردووە کە لەسەر زاری ، یاخوود لە روانگەی بوونە رەسەنەکەیەوە بلێت :

**گەر عاشقی لە خوونی جگەر قوم دە ، دەم مەدە**

**مەی خـوارە ، خام کارە هەتا هاو و هوو دەکا**[1]

مەحوی ئەگەر بە راستی عاشقی ئەو بوونە رەسەنەی خۆیەتی و دەیەوێت پێی بگات ، دەبێت لەم پێناوەدا بەرگەی هەموو جۆرە ئێش و ئازارو خەم و خەفەتێك بگرێت ، تەنانەت ئەگەر ئەو خەم و خەفەت و ئێش و ئازارە بووبنە هۆی ئەوەی جگەری پڕ لە خوێن بکەن ، دەبێت قوم لەو خوێنەی جگەری بدات و هیچ دەنگ و هەرایەکی لێوە نەیەت . ئەگەر ئەم ئامادەییەی نەبێت ، ئەوا هێشتا نەزان و تازە کارەو شیمانەی ئەوە هەیە واز لەو بوونەی خۆی بهێنێت و بەرەو دنیا بچێت ، چونکە دنیا مەیلی بۆ مرۆڤ هەیەو بەرەو خۆی رای دەکێشێت و لە بوونی خۆی دووری دەخاتەوە :

**دنـیـا بـە حـیـلـە مەیلی بە ئەبنای گەر ببێ**

**ئەم (دایە رێزیار)ە بە فرزەندی شوو دەکا**[2]

ئەگەر دنیا مەیلی بۆ مرۆڤ هەبوو و رووی تێکرد ، ئەوا ئەم مەیل و رووتێکردنەی راست نییەو فێلێکەو لەو کەسەی دەکات ، بۆئەوەی لە رێگەی پیشاندانی خۆشی و شادی و رابواردنی وەهمیی خۆیەوە ، ئەو کەسە بەرەو خۆی رابکێشێت و لە بوونی رەسەنی خۆی دووری بخاتەوە . دوورکەوتنەوەی مرۆڤیش لە بوونی رەسەنی خۆی ، دەکاتە لە دەستدانی ئەو بوونەو خودی خۆی و بەمە لە دنیادا رۆدەچێت و بەرواڵەت ژیانێکی خۆش و دوور لە خەم و خەفەت دەژی ، کەچی لە راستیدا ئەو جۆرە ژیانە ژیانێکی بێ مانایە ، چونکە ژیان بەو بوونە رەسەنەوە ژیانێکی راستەقینەیە کە لە ناو کەسەکە خۆیدایەو ئارامی و خۆشیی راستەقینەی لەگەڵدایەو دەبێت کەسەکە لە پێناو گەیشتن بەو بوونەدا ، ئەوەندە بەرگەی ئێش و ئازار و خەم و خەفەت بگرێت ، کە ئەگەر بەهۆی ئەو خەم و خەفەت و ئێش و ئازارەوە سینەی پارە پارە ببێت ، دەبێت هەر خۆڕاگر بێت ، چونکە ئەم خۆڕاگرییەی لە پێناو کۆمەڵە شتانێکی دنیاییدا نییە کە کاتین و زوو بەسەر دەچن و نامێنن ، بەڵکو لە پێناو

---

(1) د . م ، ل ٢٦ .

(2) د . م ، ل ٢٦.

ئەو بوونە رەسەنەی خۆیدایە کە لە دنیاو خۆشی و رابواردنەکانی بە بەهاترەو ئەم بوونە لەدەرەوەدا نییەو بۆ دەرەوەش نییە ، بەڵکو لە ناو مەحوی خۆیدایەو دەرەوەو دەوروبەر بەلایەوە گرنگ نین و نایەوێت لە پێناو دەرەوەداو بۆ دەرەوە دەربکەوێت ، هەر لەم روانگەیەوەیە دەڵێت :

**دا عەکسی جیلوە دەرنەکەوێ ، نەك لە چاکییە**

**ئەو شۆخە چاکی سینەیی (مەحوی) رفوو دەکا[1]**

واتە مەحوی لە رێگەی ئەو پارە پارە بوونانەی سینەیەوە کە بەهۆی خەفەت و ئازارچەشتن لە پێناو گەیشتن بەو بوونەدا لە سنگیدا دروستبوون ، دەیەوێت ئەو بوونەی خۆی پیشان دەرەوە بدات . بەڵام ئەو بوونەی دێت سنگی مەحوی دەدورێتەوە ، واتە تیماری سینەی لەتلەتی مەحوی دەکات و لە خەم و خەفەت و ئازار رزگاری دەکات و لە دەرەوەو دنیا دایدەبرێت و ئەو هەستەی تیا دروستدەکات کە ئەو کەسەی بە بوونی خۆیەوە وابەستەبێت ، گرنگی بەوە نادات کە لەرێگەی ئەو بوونەو بەهۆی ئەو بوونەیەوە لای دەرەوەو دەوروبەری گەورە دەربکەوێت ، چونکە ئەوەی لە دەرەوەو لای خەڵك گەورە دەردەکەوێت ، کەسێکە لە مەوجودو بوونی ساختەو دنیادا رۆچووەو زۆر شتی راگوزەری دنیایی بەدەستهێناوە . بەڵام کەسی خاوەن بوون ، ئەوەی بەلاوە گرنگ نییە لە ناو خەڵکدا دەربکەوێت و خەڵك هەستی پێ بکەن . ئەم خۆی لە خۆیدا هەیە ، ئیتر لای دەرەوە هەبێت و هەستی پێ بکرێت ، یان نەبێت و هەستی پێ نەکرێت ، هەردوو حاڵەتەکە بەلایەوە وەکو یەك وان و هیچ لە مەسەلەی بوونی ئەم ناگۆڕن . هەر لەبەرئەمەیە بوونەکەی مەحوی سینەی پارە پارە بووی مەحوی دەدورێتەوە ، بۆ ئەوەی لە دەرەوە خۆی بزر بکات و دەرکەوتنی ئەم بۆ دەرەوە ، نەبێتە هۆی لەخۆ دەرچوونی مەحوی . واتە تا ئێستا بوونی مەحوی هێشتا لە ئاستی (بوون لە خۆیدا)یەو دەرنەکەوتووەو نەکەوتووەتە ئاستی (بوون بۆ خۆی یاخود بوون بە کردە) .

---

(1) د . م ، ل ٢٧ .

## دەرکەوتنی (یار ــ بوون) لە خەودا

لەوەی تا ئێستا باسکرا ، ئەوە دەردەکەوێت کە مەحوی بەردەوام هەوڵدەدات واز لە دنیاو مەوجودو بوونی ساختەو شتی دنیایی بهێنێت و لێیان دابڕێت ، بۆئەوەی بوونی رەسەنی خۆی دەربکەوێت و پێی بگات ، کەچی هەر پێی ناگات و ئەو بوونە دەرناکەوێت . لێرەدا ئەو پرسیارە سەرهەڵدەدات کە بۆچی ئەو بوونە رەسەنەی مەحوی دەرناکەوێت ؟ ئایا سیفەتی ئەو بوونە رەسەنە ئەوەیە کە هەرگیز دەرنەکەوێت ، یان هێشتا مەحوی نەگەیشتووەتە ئەو ئاستەی کە بوونە رەسەنەکەی دەربکەوێت ؟ بە بۆچوونی ئێمە کێشەی دەرنەکەوتنی بوونی رەسەن لە خودی بوونی رەسەندا نییە ، بەڵکو لە مەحویدایە ، چونکە مەحوی هێشتا نەیتوانیوە لەناو خۆیدا زەمینەیەکی لەبار بۆ دەرکەوتنی ئەو بوونە رەسەنەی خۆی بسازێنێت ، دەیەوێت کاتێک ئەو بوونە رەسەنە دەردەکەوێت ، بەرامبەر دەرەوە لە حاڵەتی ئاگاییدا بێت و لە دەرەوە دانەبڕابێت و لەڕێگەی ئەو بوونەیەوە خۆی پیشانی دەرەوە بدات . ئەمەش مانای ئەوەیە هەرچەند وا دیارە کە مەحوی خۆی لە دەرەوە دابڕیوەو ئامادەی دەرکەوتن و هاتنی (یار ـ بوون)ە ، بەڵام مادەم دەیەوێت بەو بوونەیەوە خۆی پیشانی دەرەوە بدات ، کەواتە هێشتا نەیتوانیوە بە تەواوی خۆی لە دەرەوەو دنیا دابڕێت . بۆیە دەرکەوتنی (یار ـ بوون) بۆ مەحوی روونادات و ئەمە هۆکاری راستەقینەی دەرنەکەوتن و نەهاتنی ئەو بوونەیەتی ، بەم پێیە هەتا مەحوی لە حاڵەتی ئاگاییدابێت ئەو بوونەی دەرناکەوێت . لێرەشدا ئەو پرسیارە سەر هەڵدەدات کە مەحوی چی بکات بۆئەوەی ئەو بوونەی دەربکەوێت ؟ بۆئەوەی ئەو بوونەی دەربکەوێت دەبێت بخەوێت ، چونکە لە خەودا واقیعیەتی خۆی لە دەستدەدات و لە دنیاو دەوروبەرو کۆمەڵگە دادەبڕێت و بە تەواوی بەرەو خۆی دەگەڕێتەوەو لەم گەڕانەوە راستەقینەدا بەرەو خۆی ، کە لە حاڵەتی خەوتندا روودەدات ، گوێی لە دەنگی بوونی رەسەنی خۆی دەبێت و ئەو بوونەی دەردەکەوێت و مەحوی دەیبینێت . هەر ئەمە وای لە مەحوی کردووە بڵێت:

**خەو ئەزانیٚ نیە ، دەیوت : دەبنوو بێمە خەوت**

**نیک بەختم بە وەنەوزیٚ کە ئەی بەختە مەدەد**[1]

---

(1) د . م ، ل١١٣ .

مەحوی خەوی نایەت ، کەچی (یار - بوون) داوای لێ دەکات بخەوێت ، تا بێتە خەوی ، مەحوییش هەست دەکات ئەمە روونادات ، چونکە خەوی نییە . بەلأم بۆ خەوی نییە ، یاخود بۆ خەوی نایەت ؟ دیارە لەبەرئەوەیە بە بوونێکی ساختە یان مەوجود یان شتێکی دنیاییەوە خەریکەو خەیاڵی لای ئەو شتەیە ، ئەمە بووەتە هۆی ئەوەی کە خەوی نەیەت ، کەچی مەحوی نایەت واز لە خەریکبوون بەو شتانەوە بهێنێت و داوای وەنەوزو خەو لە بەخت دەکات ، بۆ ئەوەی بخەوێت و یار بێتە خەوی . بێگومان ئەوە ئیشی بەخت نییە وەنەوز بخاتە چاوی مەحوی بۆ ئەوەی خەوی لێ بکەوێت ، ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی خەوی لێ نەکەوێت . لە هەمان کاتدا هەر چاوەڕوانی دەرکەوتنی بوونەو لەم چاوەڕوانییەدا ئەوەی بۆ دەردەکەوێت کە لە خەودا نەبێت یار نابینێت و بە دەردی مەجنوون چووە کە لەیلا پێی دەوت لە خەودا نەبێت نامبینی ، بۆیە دەڵێت:

**شەوێ لەیلا بە مەجنوونی وەها وادەی تەماشا دا**

**دەبێ ڕۆژێ ببینی من کە تۆ ڕێ خەیتە دەشتی خەو**(1)

لێرەدا ئەوەی بۆ دەرکەوتووە کاتێك (یار - بوون) دەبینێت کە ڕێ بخاتە دەشتی خەو . ڕێخستنە دەشتی خەویش بەوە دەبێت لەو مەوجودو شتە دنیاییانە دابڕێت کە خەریکی دەکەن ، چونکە خەریکبوونی بەوانەوە وای لێ دەکەن لە (یار - بوون) دووربکەوێتەوەو ئاگای لێی نەمێنێت و لە دنیاو دەرەوەدا بتوێتەوە . ئەمەش مانای ئەوەیە دەرەوە مەشغوڵی دەکات و بواری ئەو جۆرە خەوەی نامێنێت کە تیایدا (یار - بوون) دێتە خەوی و دەیبینێت . واتە کە باسی نەخەوتن دەکرێت ، مەبەست ئەوە نییە کە مەحوی بە هیچ جۆرێك ناخەوێت و خەوی نییە ، چونکە ئەمە شتێکی ئەستەمە ، خەوتنی هەیە ، بەلأم خەوتنەکەی ئەو خەوتنە نییە کە تیایدا خەو بە (یار - بوون)ەوە ببینێت و خەوتنێکە کە تیایدا (یار - بوون) نایەتە خەوی . بۆئەوەی ئەو خەوتنە روویدات کە تیایدا (یار - بوون) دێتە خەوی و دەیبینێت ، دەبێ ناخ و ڕۆحی موقەددەس بکات :

**بلا ڕۆحت موقەددەس بێ ئەم و ئەو کردنت بەس بێ**

**هەتا ئاخر هەناسە ئەو بناسە ، هەر بنازە بەو**(2)

---

(1) د . م ، ل٢٦١ .

(2) د . م ، ل٢٦١ .

موقەددەسبوونی ناخ و رۆحی بەوە دەبێت واز لەم و لەو بهێنێت . واتە واز لە دنیاو مەوجودو بوونی ساختە بهێنێت ، کە دەبنە هۆی ئەوەی لە خۆی دابڕێت و ئاگای لە موقەددەسبوونی ناخ و رۆحی نەمێنێت . کە لەوان دابڕاو وازی لێ هێنان ، ئیتر دەبێت بەهیچ جۆرێك چاوی لەوە نەبێت جارێکی دی بەرەو روویان بچێتەوەو تا دوا هەناسە تەنها ئەو بوونەی بناسێت و ئاگای لەو بێت و شانازیی پێوە بکات . مەحوی ئەم کارەی ئەنجامداوەو ناخ و رۆحی موقەددەسبوون ، بۆیە جارێك کە خەوی لێکەوتووە ، لە خەویدا (یار - بوون) ی بینیوە:

**خودا بیدا لە هێلێکی دەدا سەیری هەیە رێکەوت**

**وەنەوزم دا نیگارم هاتە خەو ئەمشەو خەوم پێ کەوت[1]**

مەحوی وەنەوزێکی داوەو خەوی لێکەوتووە . ئەم خەوتنەی لە پێناو ئەوەدا نەبووە (یار - بوون) بێتە خەوی و بیبینێت ، بەڵکو ویستوویەتی خەوتنێکی ئاسایی بخەوێت ، بەڵام کە خەوی لێکەوتووە (یار- بوون) هاتووەتە خەوی و خۆی بۆ دەرخستووەو بینیویەتی . کە لەخەو هەڵساوە باسی ئەو بینینە دەکات و هەستدەکات ئەو خەوتنەی پێکەوتووەو واش دەزانێت ئەمە بە رێکەوت روویداوە کە خەوتووەو لە خەودا (یار - بوون)ی بینیوە . بەڵام لە راستیدا ئەمە رێکەوت نەبووە ، ئەمە دوای ئەوە رووی داوە کە مەحوی ئامادەی دەرکەوتنی (یار - بوون) بووەو لە ناوخۆیدا زەمینەی خۆشکردووە بۆ دەرکەوتن و هاتنی یار ، بەوەی وازی لە دنیاو مەوجودو بوونی ساختە هێناوەو جەستەو ناخ و رۆحی موقەددەسبوون . ئەمە بووەتە هۆی ئەوەی لە خەودا (یار - بوون) ببینێت ، نەك رێکەوت ، ئەوەی بە رێکەوت دەست مرۆڤ دەکەوێت ، شتێکی دنیایی وەك کوپە زێڕێکە کە جوتیارێك لە کاتی کێڵانی زەویدا بە رێکەوت لە هێڵێکدا دەیدۆزێتەوەو دەبێتە خاوەنی . بەڵام بوونی رەسەن بەم جۆرە بۆ مرۆڤ دەرناکەوێت ، ئەگەر مرۆڤ هەوڵی بۆ نەدابێت و لە پێناویدا ماندووبوونی نەچەشتبێت و لەناو خۆیدا زەمینەیەکی لەباری بۆ دەرکەوتنی نەسازاندبێت ، دەرناکەوێت و پێی ناگات . مەحوی لە خەودا (یار - بوون)ی بینیوەو گەورەیی و شان و شکۆو جوانیی ئەو (یار - بوون)ەی بۆ دەرکەوتووەو ، دەزانێت مرۆڤ بەم بوونەوە دەبێت بەچی ، بۆیە روودەکاتە مەجنوون کە لە پێناو لەیلادا خۆی فەوتاند و دەڵێت :

---

(1) د . م ، ل٨٤ .

## بە لەیلاوە وەرە بەر قاپی ئەم لەیلایە ئەی مەجنوون
## شەهێکە صەد سەری شیرین و فەرهادی لەبەر پێ کەوت[1]

مەجنوون لە لەیلادا هەستی بە بوونی خۆی دەکرد ، بۆیە وازی لە دنیاو سەروەت و سامان و ژیانی خۆی هێناو تەنها هەستی بە لەیلا دەکرد . فەرهادیش بە هەمانشێوە بوونی خۆی لە شیریندا دەبینییەوە ، بۆیە کە هەستیکرد شیرینی بۆ نابێت ، خۆی کوشت . واتە مەجنوون و فەرهاد ، لەدەرەوەی خۆیان بە دوای بوونیاندا گەڕاون ، بەڵام نەیانتوانیوە پێی بگەن و بەدەستی بهێنن ، چونکە بوونی رەسەن و راستەقینەی مرۆڤ لە دەرەوەی خۆیدا نییە ، بەڵکو لەناو خۆیدایەو پێویستە لەناو خۆیدا بۆی بگەڕێت و هەستی پێ بکات . مەحوی لە ناو خۆیدا بۆ ئەو بوونەی دەگەڕێت و وازی لە دنیا هێناوە بۆی و ئەوەی بۆ دەرکەوتووە ، ئەوەی نە مەجنوون و نە فەرهاد نەیانتوانی لە (لەیلا و شیرین)دا پێی بگەن و بە دەستی بهێنن ، ئەم لە ناو خۆیدا پێی دەگات و بەدەستی دەهێنێت . مەحوی وەسفی ئەم (یار ـ بوون)ەی خۆی دەکات و داوا لە مەجنوون دەکات کە بێت و (یار ـ بوون)ەکەی ئەم ببینێت و لەگەڵ لەیلادا بەراوردی بکات و لە چاو ئەمدا بێ بایەخی لەیلای بۆ دەربکەوێت و بزانێت ئەوەی کە ئەو ژیانی خۆی لە پێناودا بەسەربرد ، لە راستیدا شایەنی ئەوە نەبوو ، بەڵکو ئەو بوونەی مرۆڤ کە-لە ناو خۆیدایە شایەنی ئەوەیە مرۆڤ هەموو ژیانی لە پێناو گەیشتن پێیدا سەرف بکات ، چونکە ئەو بوونە نەك هەر یارێکی ئاسایی وەك لەیلا نییە کە دەوارنشینێکی عەرەببووە ، بەڵکو وەك شایەکە کە لە شانوشکۆو جوانی و گەورەییدا سەدی وەك شیرین و فەرهاد لەبەر پێیدا کەوتوون . واتە هەستدەکات دەبێت لەیلاو مەجنوون لەبەر دەرگای (یار)ەکەی ئەمدا بکەون و شیرین و فەرهادیش لەبەر پێیدا بن ، چونکە ئەو بوونەی مەجنوون و فەرهاد لە لەیلاو شیرینەوە بەدەستیان هێنابوو دەرەکی و ساختە بوو .

---

(١) د . م ، ل٨٥ .

## دەرکەوتنێکی کورتی بوون لە ئاگاییدا

مەحوی کە چەندجارێك لە خەودا (یار ـ بوون) دەبینێت و مەزنی و شان و شکۆی ئەو بوونەی بۆ دەردەکەوێت ، ئیتر زیاتر تامەزرۆی دەرکەوتن و بینینی دەبێت . بۆیە دەکەوێتە چاوەڕوانییەکی قووڵ و دوورو درێژی دەرکەوتن و هاتنی (یار ـ بوون)و لەم حاڵەتی چاوەڕوانیەدایە کە دەڵێت :

**دڵم دەرهات و تۆ هەر دەرنەهاتی**

**نەهاتی هەر نەهاتی هەر نەهاتی**(1)

لەم دێڕەدا تەعبیر لە حاڵەتی چاوەڕوانی خۆی دەکات کە دەیەوێت (یار ـ بوون) دەر بکەوێت یاخود بێت و بیبینێت . بەڵام نەهاتنی ئەو بوونەی بووەتە هۆی ئەوەی کە خەریکە دڵی دەربێت ، تەنانەت نەك خەریکە بەڵکو هەستدەکات بەهۆی خەم و خەفەتی چاوەڕوانی دەرکەوتنی (یار ـ بوون)ەوە دڵی دەرهاتووە . لەم دێڕەدا ئەوەی سەرنج رادەکێشێت ئەوەیە کە بە (یار ـ بوون)ەکەی ناڵێت (نەهاتی) بەڵکو دەڵێت (دەرنەهاتی)(2)، ئەمەش مانای ئەوەیە ئەو (یار ـ دلبەر ـ شۆخ)ەی کە مەحوی چاوەڕوانی دەرکەوتنیەتی ، لە دەرەوەی خۆیدا نییە ، بەڵکو لە ناو خۆیدایەتی ، چونکە دەرنەهاتن بۆ شتێك ناوترێت کە لە دەرەوەدا بێت . لێرەدا ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ وشەی (بوون ـ Existance) کە وشەکە «لەفرمانی لاتینی (Ex-sistere)ەوە وەرگیراوە کە لە بنەڕەتدا بە مانای دەردەکەوێ (stand out) یان دێتە دەرێ (emerge) هاتووە»(3)، کەواتە یەکێك لە واتاکانی بوون (دێتە دەرێ) یە ، کە واتای هاتنەدەرەوەش دەگەیەنێت و مەحویش لەم دێڕەدا دەڵێت (دەرنەهاتی) و ئەم دەرنەهاتنەش بۆ ئەو بوونەی دەبێت کە لە ناو خۆیدایەتی و بەڵام دەرنایەت . دەرنەهاتنیشی دوو هۆکاری هەیە : یان بەهۆی ئەوەوەیە هێشتا مەحوی بە تەواوی لە بوونی ساختەو دەرەوە دانەبڕاوە ، تا ئەو بوونە رەسەنەی کە وەك ئیمکانێکەو لە ناویدایە دەربێت یاخود دەربکەوێت و بەدیبێت . یان بەهۆی ئەوەوەیە کە هەرچەند توانیویەتی خۆی لە بوونی ساختەو دەرەوە دابڕێت ، بەڵام هێشتا توانای بینین و

---

(1) د . م ، ل٢٩٧ .

(2) بە بۆچوونی ئێمە هەر سێ (نەهاتی)یەکەی نیوەی دووەمیش هەر (دەرنەهاتی)ن ، بەڵام مەحوی لەبەر لەنگ نەبوونی کێشی شیعرەکە(دەر)ەکانی لابردووە ، چونکە ئەگەر ئەو سێ (دەر)ە هەبن ئەوا نیوەی دووەم سێ بڕگەی لە نیوەی یەکەم زیاتر دەبێت و بەمە کێشی شیعرەکە تێك دەچێت .

(3) فەلسەفەی بوونگەرایی ، ل ٧٣ .

دەرکـکـردنـی ئـەو بـوونـەی نـیـیـە ، بۆیە لەم حاڵەتـەدا ئەگـەر (یـار - بـوون) دەریش بکەوێت ، لەبەرئەوەی مەحوی ناتوانێت بیبینێت و دەرکی بکات ، ناوکەوت دەکاتەوەو بزر دەبێت . ئـەوەش کـە بـەهۆی دەرنەکـەوتن و دەرنـەهاتنی ئـەو (یـار - بـوون)ەوە خـەریـکـە دڵـی دەردێـت ، لـەبـەرئـەوەیـە لـە خـەودا بـیـنـیـویـەتـی و دەزانـێـت ئـەو (یار - بوون)ەی چییەو چۆنە ، بۆیە لە وەسفیدا دەڵێت :

**کە ئەم خەندەو قسەو لێوەت هەیە تۆ**

**لـەبـاتـی شـەککەر و نوقڵ و نـەباتی[1]**

شەکرو نوقڵ و نەبات شیرین و خۆشن و مرۆڤ حـەز بـە تامکردنیـان دەکـات ، بەڵام مەحوی هەستدەکات شیرینی و تـامی خۆشی ئەوانـە کـاتی و راگـوزەرەو لەچـاو شیرینی و تـامی خەنـدەو قسەو لێـوی (یـار - بـوون) هـیچ نـین . ئـەو خەنـدەو قسەو شیرینیەی لە لێوی (یار - بوون)دا هەیە ، ئەوە دەهێنێت ئەگـەر مرۆڤ خـۆی بـە دنیـاو دەرەوە خـەریککردبێت ، ئامادەبێـت بـۆ کوشـتن خـۆی بخاتـە بەردەسـتی یـار ، تـا بیکوژێـت و بـەم کوشـتنە دنیـاو دەرەوە تیایـدا نـەمێنن و یـار دەرکـەوێت و بـەم دەرکەوتنەی لە کەسەکەدا ، زیندووی بکاتەوە . کەچی یار ئەم کوشتنە ئـەنجام نـادات تا خۆی دەربکەوێت ، ئەمەش وای لە مەحوی کردووە بڵێت :

**دەدەی وادەم بە قەتڵ ئەمڕۆ سبەی هیچ**

**ئـەتـۆ شـاهـی چـیـە وا بـێ ئـەبـاتـی[2]**

هەموو جارێك کە مەحوی داوا لە (یار - بوون) دەکات بیکوژێت ، تـا لـە دنیـاو دەرەوە دابـبـڕێت و (یـار - بـوون) خـۆی بێتـە نـاوی و زیندوویـەتی و نـەمریی پـێ ببەخشێت ، یار بـەڵێنی کوشـتنی پـێ دەدات ، کەچـی دوایـی نایکوژێـت و بەڵێنەکـەی ناباتە سەر . مەحوی سەری لەوە سوورِدەمێنێت کە ئەم (یار - بوون)ەی ئـەو وەك شـا گەورەو بەشکۆیەو دەبێ کە بەڵێنێکی دا بیباتەسەر ، کەچی بەڵێنی کوشـتنی مـەحوی ناباتەسەرو نایکوژێت . دیارە مەحوی لە هۆی ئەو نەکوشتنەی بە دەستی (یار - بوون) بێئاگایە ، چـونـکـە هۆکـەی ئەوەیـە کـاتێ (یـار - بـوون) بـەڵێن بـە مـەحوی دەدات بیکوژێت ، لەو کاتەدا مـەحوی ئامـادەیی ئـەوەی تیایە واز لـە دەرەوەو دنیـاو بـوونی سـاخـتە بهێنێت ، تا یار بەو کوشتنە لەوانە رزگاری بکـات . بـەڵام دوای ئـەو بەڵێنـەی

---

(1) د . م ، ل٢٩٧ .

(2) د . م ، ل٢٩٧ .

(یـار - بـوون) ، مـەحوی کـە دەزانێـت یـار بـەو هـەموو گـەورەیی و شـان و شـکۆوە دەردەکەوێت و جەستەی ئەم دەکاتە نشینگەی خۆی ، لەخۆی بایی دەبێت یاخود بڵێین لە خۆی دەردەچێت و دەیەوێت دەرەوەو کەسانی دەوروبەری بەم کوشتن و هاتنەی یار بزانن و ، بەمە دەرەوەش هەست بە گەورەیی مەحوی بکەن . لەم بارەشدا بێگانە یاخود دەرەوە لای مەحوی حزوور پەیدا دەکەن ، کە (یار - بوون)یش بەمە دەزانێت نایەت و مەحویٚ ناکوژێت ، تا خۆی تیایدا دەربکەوێت و بەدیبێت ، چونکە لەناو مەحویدا نەیارو رەقیب ئامادەییان هەیە . لەم دێڕەدا زیاتر ئەم مەسەلەیە روون دەبێتەوە کە دەڵێت:

**سبەینێ وەرنە سەیری کوشتنم وادەم چەها داوە**

**لەسەر وادەی درۆی ئەو نادەم ئیتر وادە ، قەت نادەم**[1]

لێرەدا ئەو ئامادەییەی دەرەوەو خەڵك لای مەحوی بە ئاشکرا دیارە . ئەوەتە چەندەها جار پەیمان بە خەڵك دەدات کە سبەینێ (یار - بوون)ەکەی دەیکوژێت و داوایان لێدەکات بێنە سەیری کوشتنی . ئەم کارەش بۆ ئەوە دەکات تا ئەوان هەست بە گەورەیی ئەم بکەن ، بەوەی کە یار دەیکوژێت و دێتە ناوی و زیندووی دەکاتەوەو دەیکاتە کەسێکی گەورەو نەمر . بەلاٚم کە سبەینێ خەڵك بۆ تەماشاکردنی کوشتنی مەحوی کۆدەبنەوە ، (یار- بوون) نایەت و مەحوی ناکوژێت . ئەمەش مەحوی لای خەڵك شەرمەزار دەکات ، چونکە ئەوەی ئەو بەڵێنی بەخەڵك دابوو کە بێنە سەیری ، روونادات . ئەمەش وا لە مەحوی دەکات کە جارێکی تر لەسەر وادەی درۆی ئەو وادە بە خەڵك نەدات کە بێنە سەیری کوشتنی ، چونکە هەستدەکات وادەکانی (یار - بوون) نادەمن ، واتە ناوەختن و لە کاتی خۆیدا نین . بەلاٚم ئەم ناوەختیەی بەڵێنەکانی (یار - بوون) پەیوەندی بە بێ وادەیی یارەوە نییە ، بەڵکو پەیوەندی بە بێ وادەیی یاخود بێ پەیمانی مەحوییەوە هەیە . بێ پەیمانیەکەشی لەوەدایە کە پەیمان بە (یار - بوون) دەدات خۆی لە دەرەوەو خەڵك دابڕێت و روو بکاتە (یار - بوون) . یاریش پەیمان بە مەحوی دەدات ئەو لایەنەی دەکوژێت کە پەیوەستە بە خەڵکەوەو خۆی دێتە جێی . کەچی دوای ئەم پەیمانە ، دیسان مەحوی روو لە دەرەوەو خەڵك دەکاتەوەو داوایان لێدەکات بێن سەیری کوشتنی بکەن بە دەستی یار . ئەم داوایەش خۆی لە خۆیدا مانای دانەبڕانی مەحوییە لە دەرەوەو

---

(1) د . م ، ل٢٢٨ .

کەسانی دەوروبەری . بەمە یار هەست دەکات هێشتا وەختی ئەم کوشتنە نییە ، بۆیە نایەت و ئەو کوشتنە ئەنجام نادات . کاتێکیش مەحوی دەگاتە ئەوەی کە ئیتر بەڵێن بەخەڵك نەدات و داوایان لێنەکات بێنە سەیری کوشتنی ، بەمە لە خەڵك دادەبڕێت و دەرەوەو خەڵك ئامادەییان نامێنێت لای . ئەمەش زەمینە لەباربوونە بۆ دەرکەوتنی (یار - بوون) و ئامادەشە کە (یار - بوون) دەرکەوت بەسەر بە پیریەوە بچێت :

**سەرت پێ لازمە مەیبازە مەحوی**

**دەبێ دولبەر کە هات ئێمە بەسەر چین**[1]

لێرەدا مەحوی بە تەواوی لە دنیاو مەوجودو بوونی ساختە دابڕاوەو لێیان پاکبووەتەوەو جەستەو ناوەوەی بونەتە نشینگەیەکی ئامادە بۆ دەرکەوتن و هاتنی (یار - بوون) . هەستدەکات کە (یار - بوون) هات ئەم ئەوەندە پێی خۆشە بەسەر بە پیریەوە دەچێت ، ئەمەش نیشانەی ئەوەیە ئەو بوونە لای ئەم زۆر پایەدارو بەشکۆیە . لێرەدا مەحوی گەیشتووەتە ئاستێك و لە حاڵەتێکدایە کە بە تەواوی ئامادەی دەرکەوتنی بوونەو کاتی ئەوە هاتووە کە ئەو بوونەش دەربکەوێت و مەحوی لەم چاوەڕوانیە رزگاری ببێت . بەڵام ئایا ئەم دەرکەوتن و هاتنەی بوون روویداوە؟ مەحوی لەم دێڕە شیعرەدا وەڵامی ئەم پرسیارە دەداتەوە :

**بە پیر ئەو مامەوە چووم و بەسەر چووم**

**پەری بوو ئەو نەبوو ، شەو بوو بەسەر چووم**[2]

بەپێی ئەم دێڕە شیعرە (یار - بوون) دەرکەوتووەو مەحوییش بە سەر نەك بە پێ ، بەپیریەوە چووە . مەحوی وای زانیوە ئەو (یار - بوون)ەی وەك یارێکی دەرەکی و بەرجەستە وایەو لەم روانگەیەوە بەرەو ئەو (یار - بوون)ەی چووە . کەچی ئەو (یار - بوون)ە وەك شتێکی بەرجەستەو دیار نەبووەو لەبەرئەوەی مەحوی بەم چاوە سەیری کردووە ، نەیبینیوەو وای زانیوە چوونەکەی هەڵەبووەو ئەوەی ئەو بەرەو رووی چووە ئەو (واتە یار - بوون) نەبووەو شتێکی تر بووە (کە بە پەری ناوی بردووە) . جگەلەمە هەستدەکات کاتەکەش شەو بووە ، ئەم بە شەو زانینی کات و حاڵەتەکەش لەوەوەیە مەحوی ویستوویەتی ، بە چاوی سەر نەك بە چاوی دڵ ، یار ببینێت ، یاریش بە چاوی سەر نابینرێت . بۆیە مەحوی بارودۆخەکەی

---

(1) د . م ، ل٢٥٠ .

(2) د . م ، ل٢٢٤ .

وەك شەو هاتووەتە بەرچاو ، کە تاریکبووە و هیچی نەبینیوە . کەچی لە ڕاستیدا ئەوەی کە دەرکەوتووەو هاتووە ، ئەو (یار ـ بوون)ە بووە کە مەحوی سەردەمێکی زۆر چاوەڕێی دەرکەوتنی بووە ، بەڵام لەبەرئەوەی مەحوی بە چاوی دڵ یاخود بە چاوی ناوەوە بۆی نەڕوانیوە ، نەیتوانیوە بیبینێت و دەرکی بکات ، بۆیە ماوەی دەرکەوتنی ئەو (یار ـ بوون)ە لە ناو مەحویدا کەمبووەو زوو بەسەرچووە . دەرککردن بەمە وای لە مەحوی کردووە حیرەت بیگرێت و بڵێت :

**تەڵیّ نێرگسم و باغی حیرەتم پیّ**

**بەفەڕ هات و وەکو گوڵ زوو بەسەر چووم**(١)

تەمەنی دەرکەوتنی (یار ـ بوون) لە ناو مەحویدا بەقەد تەمەنی نێرگز یاخود گوڵێك بووە کە ماوەیەکی کەمەو زوو بەسەردەچێت . چواندنی ماوەی ئەو دەرکەوتنەی (یار ـ بوون) بە دەرکەوتنی نێرگزو گوڵ ، ئەوەش دەگەیەنێت وەك چۆن نێرگزو گوڵ ئەو شوێنە دەڕازێننەوە کە تێیدا دەڕوێن ، مەحویش بەو دەرکەوتنەی (یار ـ بوون) ئاوا ڕازاوەو جوان بووە . بەڵام تا بوونەکەی نەکشاوەتەوە هەستی بەو جوانی و ڕازاوەییەی خۆی نەکردووە کە بەهۆی دەرکەوتنی (یار ـ بوون)ەوە تیایدا دروستبووە . دوای ئەو دەرکەوتنەی یار کە مەحوی بە سەر بەپیریەوە چووە پێیەکانی گلەیی لێدەکەن :

**گلەی پێشم لەسەر سەر هەم بووە بار**

**کە دی من دلبەرم هات و بەسەر چووم**(٢)

گلەیی پێیەکانی مەحوی لەوەوەیە کە بەوان بەپیر یارەوە نەچووەو بەسەر بە پیریەوە چووە . ئەمەش مانای ئەوەیە شەرەفی بە پیرەوە چوونی (یار ـ بوون)ی لەوان سەندووەتەوەو داویەتی بە (سەر)ی . ئەوەی لە پشت مانای ئەم دێڕەوە پەنهانە سەلماندنی ئەو ڕاستیەیە کە (یار ـ بوون) دەرکەوتووەو مەحوی بە پیریەوە چووەو پێی گەیشتووە ، بەڵام لەبەرئەوەی مەحوی نەیزانیوە بە چ چاوێك و چۆن سەیری بکات ، لە مەحوی کشاوەتەوەو کەوتووەتەوە حاڵەتی غیابەوە . بۆ یەکەم جاریشە کەوتنە حاڵەتی غیابی ئەو بوونە ڕەسەنە بەهۆی ئەوەوە نییە کە مەحوی بە بوونی ساختەو مەوجودو شتی دنیاییەوە خەریکە ، بەڵکو بەهۆی ئەوەوەیە کە مەحوی

---

(1) د . م ، ل٢٢٥ .

(2) د . م ، ل٢٢٥ .

نەیزانیوە بە چ چاوێك سەیری بكات و چۆن مامەڵەی لەگەڵدا بكات . واتە لە جیاتی ئەوەی بە چاوی دڵ بۆی بڕوانێت ، چونكە لە دەرەوە نییەو لە ناوەوەی خۆیدایە ، وەك شتێكی بەرجەستەو دەرەكی بۆی ڕوانیوەو بە چاوی سەر سەیری كردووە ، بۆیە هەرچەند ئەو ئامادەبووە ، بەڵام ئەم (واتە مەحوی) نەیتوانیوە ببینێت و پێوەی خەریكبێت و ڕێگەی بەدیهاتنی بۆ خۆش بكات . بە دەربڕینێكی هیگڵیانە ئەو بوونە بەهۆی دەركەوتنی لە ناو مەحویدا ، لە ئاستی (بوون بە هێزەوە) كەوتووەتە ئاستی (بوون بە كردە) ، بەڵام لەبەرئەوەی مەحوی دەركی بەمە نەكردووە ، ئەو بوونە هەستی كردووە هێشتا مەحوی نەگەیشتووەتە ئەو قۆناغەی كە ئەو تێیدا بكەوێتە (ئاستی بوون بەكردە) ، بۆیە كشاوەتەوەو كەوتووەتەوە ئاستی (بوون بە هێز)و دیار نەماوە . ئەم كشانەوەو دیار نەمانەش وەك ئەوەیە (یار - بوون) سەفەری كردبێت و ڕۆیشتبێت ، بۆیە دەڵێت :

**بە ئۆغر كردنی من بوومە قەقنەس**

**كە ئەو چوو بۆ سەفەر ، من بۆ سەقەر چووم**[1]

ڕۆیشتنی یار بە نسبەت مەحوییەوە ئەوەندە گرانە وەك ئەوەیە ئاگری تێبەر ببێت و وەك قەقنەس بسووتێت . واتە مەحوی گەیشتووەتە ئەو قەناعەتەی كە مانەوەو بەردەوامیی ئەو ، بەهۆی ئامادەیی (یار - بوون)ەوەیە ، كە ئەو نەماو ڕۆیشت ، ئیتر ئەمیش بۆ سەقەر دەچێت و دەفەوتێت . بۆیە وا دەزانێت مادەم (یار - بوون) نایەت دەبێت ئەم بەرەو ڕووی بچێت :

**وتی ، قەت وا مەیە من واوە هەر دێم**

**نەهات ئەو وا قەت و من واوە هەر چووم**[2]

كە مەحوی بڕیاری داوە بەرەو (یار - بوون) بچێت ، ئەو پێی وتووە تۆ واوە مەیە . واتە نابێت مەحوی بەرەو (یار - بوون) بچێت ، بەڵكو دەبێ خۆی لە دەرەوە دابڕێت و چاوەڕوانی دەركەوتنی (یار - بوون) بێ بۆ ئەوەی بێت . بەڵام تامەزرۆیی مەحوی بۆ دەركەوتنی (یار - بوون) و گەیشتن پێی ، وای كردووە تووشی هەڵە ببێت . هەڵەكەش ئەوەیە لە جیاتی ئەوەی دوای وازهێنان لە دنیاو مەوجودو بوونی ساختە ، چاوەڕوانی دەركەوتنی (یار - بوون) بێت و لەم چاوەڕوانیەدا خۆی پێبگەیەنێت و خۆی

---

(1) د . م ، ل٢٢٦ .

(2) د . م ، ل٢٢٦ .

بگەیەنێتە ئەو ئاستەی کە (یار - بوون) دەرکەوت ، بزانێت بە چ چاوێك سەیری بکات و چۆن زەمینە بسازێنێت بۆ بەدیهاتنی ، بەرەو بوونەکەی چووەو ئەم چوونەشی بێ ئەنجام بووە ، چونکە ئەو بوونە لە شوێنێکی دەرەکی و دوور نییە ، تا مەحوی بۆی بچێت و پێی بگات ، بەڵکو لەناو خۆیدایەتی و کە مەحوی ئامادەی دەرکەوتنی بوو ، دەردەکەوێت و دەست بە بەدیهاتن دەکات و لە (بوون بە هێزەوە) دەبێتە (بوون بە کردە) . چوونی مەحوی بە دوای ئەو بوونەیدا مانای وایە وەك یارێکی بەرجەستەو دەرەکی سەیری کردووەو لە دەرەوە بە دوایدا گەڕاوەو بەمە لە خۆی دابڕاوە . لەم دابڕانەدا ، بە دنیاو مەوجودو شتی دنیاییەوە خەریك نابێت ، بەڵکو هەر بەدوای ئەو بوونەیدا دەگەڕێت و دەیەوێت دەریبکەوێت و پێی بگات . بەڵام جگە لەو ماوە کەمەی کە (یار - بوون) دەرکەوت و مەحوی نەیتوانی بیبینێت ، ئیتر دەرکەوتنی (یار - بوون)و گەیشتنی مەحوی پێی رووی نەداوەو مەحوی هەر لەحاڵەتی چاوەڕوانیدا بووە . بەم پێیە مەحوی لە بەرامبەر (یار - بوون)دا کەوتووەتە حاڵەتی عیشقەوە ، واتە لە عیشقی ئەو (یار - بوون)ەی خۆیدایە .

# عیشـق لای ئەفلاتوون

بۆئـەوەی بـزانـیـن عیـشق چییەو لـە شـیعرەکانی مەحویـدا چـۆن رەنگـی داوەتەوە ، پێویستمان بـە بۆچـوونەکانی ئەفلاتوونـە لـە بارەی عیـشقەوە ، تـا ببنـە دەروازەیەك و لەرێگەیانەوە بچینە سەر عیشق لە شیعرەکانی مەحویدا .

ئەفلاتوون پێی وایە عیشق خێرو بەرەکەتی زۆر بـە مـرۆڤ دەبەخـشێت و هـیچ شتێك لەوە بە سـوودتر نییـە بۆ مـرۆڤ ، کـە مەعـشووقێکی شایستەو شـایان بـەخۆی بدۆزێتـەوە . سوودەکەشـی لەوەدایـە ، وا لـەو کەسـە دەکـات وەك مرۆڤێکـی بـەرز و شـکۆدار بژی ، چونکە ئـەوەی دەیـەوێت ژیـانێکی شـکۆمەندانەو وەجاخزادانـە بـژی ، نابێت چاوەڕێی ئەوە بکـات ئـەم جۆرە ژیانـەی لـە بنەماڵـە ، یـان لـە پـارەو سـامانی زۆرەوە ، یاخود لە پلەو پایەی بەرزەوە دەست بکەوێت . بەڵکو پێویستە عاشق بێت ، تا لە رێگەی عیـشقەوە ئـەوەی دەست بکـەوێت کـە کەسـێکی پایـەداربێت و ژیـانێکی سەربەرزو شەرەفمەندانە بژی[1] . عیشق خاوەنی سـوڵتانێکی فـراوان و هـەمـەلایەنە ، ئامانجێکی بەرزو باڵای هەیەو بـەدیهێنانی ئـەو ئامانجـەی فەزیلـەت و شـکۆمەندی بـە مـرۆڤ دەبەخـشێت . سـوڵتان و هێـزو توانـای عیـشق لـە بـان هـەموو سـوڵتان و هێـزو توانایەکەوەیـەو سەرچـاوەی هـەموو بـەختیاری و چـاکەیەکەو ئـەو بـوارە بـۆ مـرۆڤ دەڕەخسێنێت بە تەبایی و گونجاوی لەگەڵ جگە لە خۆیدا بـژی[2]، ئیتر ئەو جگە لـە خـۆیـە ، کۆمەڵگەو کـەسانی دەوروبـەری بـن ، یـان سروشـت و ژینگـەی چـواردەوری بێت .

ئەفلاتوون پێی وایە کەسی عاشق سەربەستە لـەوەی چـۆن رەفتـار دەکـات . ئەگـەر کەسـێك عاشـق ببێـت و زۆر بـە زیادەڕەوییـەوە دوای ئـەو مەعـشووقەی خـۆی بکەوێت ، ئەوا نەك هەر سەرزەنشت ناکرێت ، بەڵکو شـایانی پیاهـەڵگوتن و ستایـشە . بەڵام ئەم زیادەڕەوییە لە هەوڵدان بە دوای ئامانجێکی تری جگە لەم ئامانجەدا کارێکی باش نییەو پەسەند ناکرێت . بۆنمونە ئەگەر کەسێك ئارەزووی لە بەدەستهێنانی پارەو سامان ، یان پلەو پایەیەك بێت و چۆن عاشقێك رێگـەی مەعـشووقەکەی دەگرێتەبـەرو دوای دەکەوێت ، ئـەمـیش ئـاوا دوای بەدەسـتهێنانی پـارە یـان پلـەو پایـە بکـەوێت و بپاڕێتەوەو ملی کەچ بکات ، بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکەی کە پارە یان پلەو پایەیـە ،

---

(1) بڕوانە : المأدبة (فلسفة الحب) ، افلاطون ، ت : د. وليم الميري ، دار المعارف بمصر ، ط ١ ، س ١٩٧٠ ، ص ٣١ .

(2) بڕوانە : هـ . س ، ل ٤١ .

بەوە رازی بێت بەندایەتی بکات . ئەم جۆرە کەسە دۆست و دوژمن لۆمەی دەکەن و ئەو کارەی بە باش نازانن و دەیانەوێت دووری خەنەوە لێی . دوژمنەکانی بە کەم سەیری دەکەن و بەو سەرشۆڕی و هەژارییە رۆحییەی ئەو رازی نابن ، دۆستەکانیشی بەم کارەی ئەو شەرمەزار دەبن و ئامۆژگاری دەکەن و داوای لێدەکەن ئەو کارە نەکات و وازی لێ بهێنێت . بەڵام ئەگەر عاشقێکی راستەقینە لە پێناو مەعشووقەکەیدا رێگەیەکی وای گرتەبەرو کارێکی لەم جۆرەی کرد ، ئەوا بە گەورە سەیری دەکەین و پێی سەرسام دەبین ، چونکە ئاگامان لەو ئامانجە باڵایە کە ئەو هەوڵی بۆ دەدات[1].

واتە بەلای ئەفلاتوونەوە مرۆڤ ئەگەر عاشقی شتێکی باڵاو گەورە ببێت ، کارێکی پەسەندەو ئەوە دەهێنێت مرۆڤ لە پێناو بەدەستهێنانی ئەو ئامانجە باڵایەدا دەردی سەری و هەژاری و ملکەچی و پاڕانەوە قبوڵ بکات و ئەمانە بە شوورەیی دانانرێن . بەڵام قبوڵکردنی ملکەچی و پاڕانەوە لە پێناو پارەو سامان و پلە پایەو شتی دنیاییدا شەرمەزارییەو نابێت مرۆڤ کاری لەم جۆرە بکات ...

## عیشق و ناوەندگیری

عیشق لای ئەفلاتوون بریتییە لە خۆشەویستی شتێك . وەك چۆن کە دەوترێت باوك واتە ئەو باوکە باوکی کەسێکە ، کە دەوترێت دایك ئەو دایکە دایکی کەسێکەو کە دەوترێت برا ، برای یەکێکەو خوشکیش بەهەمانشێوە . بەم پێیە کە وترا عیشق ، واتە عیشق یاخود خۆشەویستیی شتێك . عیشق خوازیاری ئەو شتەیە کە عاشقی بووەو دەیەوێت دەستی بکەوێت . واتە عیشقی شتێك لە بارێکدایە کە کەسەکە ئەو شتەی نەبێت و بیەوێت بە دەستی بهێنێت و ببێتە خاوەنی - مرۆڤ ئەگەر شتێکی هەبێت ، ئەوا عاشقی ئەو شتە نابێت و هەوڵی بەدەستهێنانی نادات ، چونکە ئەمە وەك ئەوەیە کەسێك خۆی گەورەبێت ، کەچی هەوڵی بەدەستهێنانی گەورەیی بدات . یان کەسێك خۆی بەهێزبێت ، کەچی بە دوای بەهێزیدا بگەڕێت و بیەوێت بە دەستی بهێنێت[2]. ئەمەش نابێت ، چونکە ئەو کەسانە خۆیان خاوەنی گەورەیی و هێزن و ئەوە رێی تێناچێت کە عاشقی گەورەیی و هێز بن و هەوڵی بەدەستهێنانیان بدەن . واتە پێویست ناکات هەوڵی بەدەستهێنانی ئەو سیفەتانە بدەن ، چونکە خۆیان

---

(1) بڕوانە : هـ . س ، ل ٣٦ .

(2) بڕوانە: هـ . س ، هـ . ل .

خاوەنی ئەو سیفەتانەن . بەم پێیە مرۆڤ عاشقی ئەو شتە دەبێت کە لە توانایدا نییە یاخود نییەتی و دەیەوێت بەدەستی بهێنێت ، واتە مرۆڤ ((حەزی لەو شتەیەو ئارەزووی ئەو شتە دەکات کە لەئێستادا نییەتی و لێی بێ بەشە))[1] . کەواتە خۆشەویستی یاخود عیشق ، بەرامبەر شتێکی دیاریکراوەو کەسەکە ئەو شتەی نییەو پێویستی پێیەتی و دەیەوێت بەدەستی بهێنێت ، بۆیە عاشقی بووە .

لای ئەفلاتوون عیشق پەیوەستە بە جوانییەوەو دەڵێت ((عیشق بریتییە لە عیشقی جوانی ، نەك ناشیرینی))[2] . بەپێی ئەو ئەنجامەی سەرەوەش عیشق عاشقی ئەو شتەیە کە نییەتی و مادەم عیشق بریتیە لە عیشقی جوانی ، کەواتە عیشق خاوەنی جوانی نییە ، واتە عیشق جوان نییە ، بۆیە عاشقی جوانی بووەو دەیەوێت بە دەستی بهێنێت . جگە لەمە ، ئەفلاتوون باوەڕی وایە کە ئەوەی چاکبێت ئەوا خۆی لە خۆیدا جوانیشە ، بەم پێیە عیشق مادەم جوان نییەو ئەوەی چاك بێت ئەوا جوانە ، کەواتە عیشق چاکیش نییە ، کەواتە عیشق ناشیرین و خراپە[3] . بەڵام هەر ئەفلاتوون خۆی لەگەڵ ئەم ئەنجامگیرییەدا نییەو عیشق بە ناشیرین و خراپ نازانێت ، چونکە مەرج نییە هەر چییەك جوان نەبوو ناشیرین بێت ، هەروەك چۆن مەرج نییە هەر کەسێك زانا نەبوو نەزان بێت . بۆنمونە کەسێك خاوەنی بیروباوەڕو بۆچوونێکی راستە ، بەڵام ناتوانێت بەبەڵگە راستیی بیروباوەڕەکەی بسەلمێنێت . لێرەدا ئەم حاڵەتە بە زانین ناو نابرێت ، چونکە شتێك نەتوانرێت بەڵگەی بۆ بهێنرێتەوە بە زانین دانانرێت . بەڵام لە هەمان کاتدا ناشکرێت ئەم حاڵەتە بە نەزانین لە قەڵەم بدرێت ، چونکە عەقڵ دەتوانێت ئەم حاڵەتە بگەیەنێتە حەقیقەت[4] . با ئەم نمونەیە ئاسانترو روونتر بکەینەوە : کەسێك کۆمەڵێك زانین و بیرو بۆچوون لە مێشکیدا هەیە ، بەڵام هێشتا نەگەیشتووەتە ئەو ئاستەی یاخود بڵێین هێشتا توانای ئەوەی نییە ئەو زانین و بیرو بۆچوونەی دەرببڕێت ، لێرەدا ئەو کەسە بە زانا دانانرێت ، چونکە نەیتوانیووە لە رێگەی ئەو زانین و بیرو بۆچوونانەی کە هەیەتی ، زانایی خۆی بسەلمێنێت ، بەڵام لە هەمان کاتدا بە نەزانیش دانانرێت ، چونکە لە راستیدا ئەو کەسە زانین وزانیاری

---

(1) هـ . س ، ل ٥٧ .

(2) هـ . س ، هـ . ل .

(3) بڕوانە : هـ . س ، ل ٥٨ .

(4) بڕوانە : هـ . س ، ل ٥٩ .

هەیە ، لێرەدا ئەم کەسە لە حاڵەتێکدایە لە نێوان زانایی و نەزانیدا . کەواتە ((عیشقیش حاڵەتێکە لە نێوان (جوانی و چاکە) و (ناشیرینی و خراپە)دا))[1].

لێرەدا ئەفلاتوون وەك بابەتێکی سەربەخۆ لە عیشقی روانیوەو لەو کەسەی دابڕیوە کە بەهۆی ئەم عیشقەوە دەبێتە عاشق ، واتە وەك کەس تەماشای عیشقی کردووەو لە نێوان (جوانی و چاکە) و (ناشیرینی و خراپە)دا دایناوە . تەنانەت عیشقی بە رۆڵەی خواوەندی دەوڵەمەندی و هەژاری داناوە ، بەیەکگەیشتنیشیان لە شەوی لە دایکبوونی (ئەفرۆدیت)دا بووە ، کە خواوەندەکان لەو شەوەدا بە بۆنەی لە دایکبوونی (ئەفرۆدیت)ەوە ئاهەنگێکیان سازکردووە ، خواوەندی دەوڵەمەندی لەو ئاهەنگەدا بەشدار بووە ، هەژارییش هاتووەو لە دەرگاکەدا وەستاوە بۆئەوەی لە خێرو بێری ئەو ئاهەنگە شتێکی دەست بکەوێت . خواوەندی دەوڵەمەندی بە هۆی شەرابی خواییەوە مەستبووەو چووەتە دەرەوەو لە باخچەکەی (زیۆس)دا خەوی لێکەوتووە . هەژارییش بیری لەوە کردووەتەوە بۆ رزگاربوون لە نەبوونی ، هەوڵ بدات لە خواوەندی دەوڵەمەندی سکی پڕ ببێت ، بۆیە لەگەڵی نوستووەو سکی لێی پڕبووەو سکەکەی عیشق بووە[2]. کەواتە عیشق مادەم دایکی هەژارییەو باوکی دەوڵەمەندییە ، لە نێوان کۆمەڵێك سیفەتی لێکدژدایە : لەبەرئەوەی باوکی ، خواوەندی دەوڵەمەندییە هەمیشە هەوڵی بەدەستهێنانی جوانی و چاکە دەدات و خاوەنی هێزو توانایەو داوای حیکمەت و دانایی دەکات . بەڵام هەژارو نەبووەو ناسك و جوان نییەو پێی پەتییەو شوێنی حەوانەوەی نییە ، لەسەر زەویی رەق و سەر رێگا دەنوێت ، هەموو ئەمانەی لە دایکییەوە بۆ ماوەتەوە . واتە عیشق لە حاڵەتێکدایە ((ئەوەی ئەمڕۆ دەستی دەکەوێت سبەینێ لە دەستی دەدات ، نە دەوڵەمەندەو نە هەژارە ، نە زانایەو نە نەزانە))[3].

لێرەداو لە روانگەی ئەم سیفەتانەوە عیشق وەك مرۆڤێك تەماشاکراو، کە لە ناوەندگیرییەکدایە ، ئەو ناوەندگیرییە بریتییە لەو بوارەی کە دەکەوێتە نێوان عیشقەکە خۆی و ئەو شتەی کە دەیەوێت بەدەستی بهێنێت . واتە عیشق مەسافەی نێوان دوو شتە ، ئەو مەسافەیە لە خودی عیشقەکەو، دەست پێدەکات ، تا ئەو شتەی کە عاشقی بووەو دەیەوێت بە دەستی بهێنێت ، بەم پێیە عیشق بریتییە لە قۆناغی پێش بەدەستهێنانی ئەو شتەی کە عیشق عاشقی بووە . ئەگەر بمانەوێت بە

---

(1) هـ . س ، هـ . ل .

(2) بڕوانە : هـ . س ، ل ٦٠ .

(3) هـ . س ، ل ٦١ .

نموونەیەکی واقیعی ئەم مەسەلەیە زیاتر روون بکەینەوە . ئەوا مەسەلەی خۆشەویستی کوڕ بەرامبەر بە کچ بە نموونە دەهێنینەوە : کوڕ کاتێك دەگاتە تەمەنی گەنجی ئامادەیی ئەوەی تێدایە ئەگەر کچێك ببینێت و هەست بکات ئەو کچە (جوان و بەڕەوشت و... هتد)ە ، ئەوا عاشقی دەبێت ، واتە لە بەرامبەر ئەو کچەدا دەکەوێتە حاڵەتی عیشقەوە . لێرەدا ئەو کوڕە بۆیە لە حاڵەتی عیشقدایە چونکە هێشتا ئەو کچەی بۆ نەبووەو نەبووەتە هاوسەری . تا ئەو کچە لەم کوڕە دووربێت و پێکەوە نەبن ، ئەوا کوڕەکە بەرامبەر ئەو کچە لە حاڵەتی عیشقدایە . بەلاّم ئەگەر لەگەڵ کچەکە قسەی کردو کچەکە رازیبوو لەگەڵیدا ببێتە هاوسەرو پێکەوە بژین . ئەمە وەك ئەوە وایە کوڕەکە کچەکەی بە دەستهێنابێت و بووبێتە خاوەنی ، بەمە ئەو کوڕە لەبەرامبەر کچەکەدا لە حاڵەتی عیشقدا نامێنێت ، چونکە بە پێی بۆچوونی ئەفلاتوون عیشق حاڵەتی پێش بەدەستهێنانی بابەتەکەیە ، لێرەشدا حاڵەتی عیشق لای کوڕەکە ئەو کاتەیە کە هێشتا بەکچەکە نەگەیشتووەو نەبووەتە هاوسەری ، کە پێی گەیشت و بوونە هاوسەر ، ئەوا کوڕەکە لە حاڵەتی عیشقدا نامێنێت .

## عیشق لای مەحوی

ئەوەی باسکرا عیشق بوو لای ئەفلاتوون و گەیشتینە ئەو ئەنجامەی کە عیشق بریتییە لە ناوەندگیرییەك لە نێوان خودی عیشقەکەو ئەو شتەی کە عاشقی بووەو دەیەوێت بە دەستی بهێنێت . لای مەحویش عیشق بە هەمانشێوە بریتییە لە ناوەندگیرییەك . بەلاّم ئەم ناوەندگیرییەی عیشق کە لە شیعری مەحویدا هەستی پێ دەکرێت ، جیاوازە لەوەی لای ئەفلاتوون هەیە . لای ئەفلاتوون لە عیشقدا دوو لایەن هەیە : خودی عیشقەکەو ئەو شتەی کە عیشقەکە عاشقی بووە ، بەلاّم لای مەحوی لە عیشقدا سێ لایەن هەیە کە لە شیعرەکانیدا هەستیان پێ دەکرێت ، ئەوانیش بریتین لە {عاشق (کە مەحوییە) ـ عیشق ـ مەعشووق(کە بوونی خۆیەتی)} . واتە راستە لای مەحویش عیشق ناوەندگیریەکەیە . بەلاّم ئەم ناوەندگیرییەی عیشق لە نێوان عیشق و مەعشووقدا نییە ، بەڵکو لە نێوان عاشق (واتە مەحوی)و مەعشووقدایە کە دەکاتە ئەوەی مەحوی عاشقی بووە . بەم پێیە دەتوانین لە شیعری مەحویدا عیشق بەم جۆرە روون بکەینەوە : مەحوی (بوونێکی رەسەنی) هەیە (کە وەکو یار ، یاخود مەعشووق مامەڵەی لەگەڵدا کردووە) ، بەلاّم هێشتا پێی نەگەیشتووەو بە دیی

نەهێناوە . لەم بارەدا ناتوانرێت بوترێت مەحوی ئەو بوونەی هەیە ، چونکە هێشتا پێی نەگەیشتووەو بەدەستی نەهێناوە . لەهەمان کاتدا ناشتوانرێت بوترێت ئەو بوونەی نییە ، چونکە لە راستیدا وەك وتمان ئەو بوونەی هەیە ، بەلام هێشتا بەدیی نەهێناوەو بۆی هەیە بەدیی بهێنێت . واتە دەتوانین بڵێین : مەحوی نە ئەو بوونەرەسەنەی هەیەو نە نییەتی و لەو نێوانەدایە ، واتە لەوێدایە کە وازی لە بوونی ساختەو مەوجود هێناوەو لێیان دابڕاوەو عاشقی بوونی رەسەنی خۆی بووە ، بەلام هێشتا بەو بوونە رەسەنەی خۆی نەگەیشتووەو بە دیی نەهێناوە ، ئەم بارە یاخود ئەم ناوەندگیرییە لای مەحوی بریتییە لە عیشق . کەواتە عیشق لای مەحوی و لە شیعری مەحویدا حاڵەتی گەڕانە بە دوای بوونی رەسەن و هەوڵدانە بۆ دۆزینەوەو بەدیهێنانی ئەو بوونە رەسەنە . واتە لە حاڵەتی عیشقدا مەحوی لە بارێکدایە کە بەگڕی ئەم عیشقە جەستەی سووتاوە ، بەم سووتانە جەستەی نافەوتێت و لەناو ناچێت ، بەڵکو لە بوونی ساختەو مەوجودو حەزکردن لە شتی دنیایی وەك پارە و سامان و... هتد پاك دەبێتەوە . بە پاکبوونەوەی لەمانە بەرەو بوونی رەسەنی خۆی دەچێت . بەم پێیە عیشق حاڵەتێکە ، کە تیایدا مەحوی لە نێوان بوونی ساختە (یان مەوجود)و بوونی رەسەندایە . واتە لە مەوجودو بوونی ساختەو دنیا دابڕاوە ، بەلام هێشتا بە بوونی رەسەنی خۆی نەگەیشتووە . واتە عیشق لای مەحوی بریتییە لە قۆناغی دوای وازهێنان لە بوونی ساختەو مەوجودو ، قۆناغی پێش گەیشتن بە بوونی رەسەن و بەدیهێنانی ئەو بوونە . عیشقەکەش عاشق بوونی ئەو بوونە رەسەنەی خۆیەتی کە هێشتا پێی نەگەیشتووەو بەدیی نەهێناوەو لە زۆر شوێندا بە (یار ، شۆخ ، دولبەر ... هتد) ناوی بردووە . کە بەو بوونە رەسەنەی خۆی گەیشت و بەدیی هێنا، ئەوا حاڵەتی عیشق کۆتایی دێت و دەکەوێتە بارێکی ترەوە کە تەحقیقکردنی تواناو ئیمکانەکانی بوونی خۆیەتی . واتە دەکەوێتە ئاستی (بوون بۆ خۆی)و تواناو ئیمکانەکانی بوونەکەی دەبن بە کردەو بەدی دێن و بوونەکەی دەردەکەوێت . ئەم دەرکەوتنەشی بۆ خۆیەتی نەك بۆ دەرەوە .

## ڕەنگدانەوەی عیشق لە شیعری مەحویدا

مەحوی تا عاشقی ئەو بوونە ڕەسەنەی خۆی نەبێت و لە بەرامبەریدا نەکەوێتە حاڵەتی عیشقەوە ناتوانێت پێی بگات . تا بە دنیاو مەوجودو بوونی ساختەشەوە خەریك بێت لە نووری عیشق بێبەش دەبێت ، ئەوەتە دەڵێت :

**تا ظولمەتی وجودە ، تەریکی لە نووری عیشق**
**سێبەر نەما هەتاوە ، کە مەحوی نەما خودا**(1)

لێرەدا وشەی (وجود) هاتووە کە مانای وشەکە دەکاتە (بوون) . بەڵام بە پێی سیاق و واتای گشتیی دێڕەکە ، وشەی (وجود) لێرەدا ، ئەو چەمکە ناگەیەنێت کە ئێمە بۆ وشەی بوون (وجود) بەکارمان هێناوە . لەم دێڕەدا لە نێوان (زوڵمەتی وجود، نووری عیشق) و (سێبەر ، هەتاو)دا پێچەوپەخشی ڕێك هەیە ، کەواتە (زوڵمەتی وجود) و (سێبەر) بۆ یەك دەگەڕێنەوە ، بە هەمانشێوە (نووری عیشق) و (هەتاو)یش بۆ یەك دەگەڕێنەوە، بەم پێیە زوڵمەتی وجود مانای سێبەرو نووری عیشق مانای هەتاو دەگەیەنێت . لێرەدا ئەو پرسیارە سەر هەڵدەدات کە مەحوی مەبەستی لە زوڵمەتی وجودو نووری عیشق و هەروەها سێبەرو هەتاو چییەو ئەم زاراوانە چی دەگەیەنن؟ مەحوی سەبارەت بەخۆی ئەو ڕاستییە دەردەبڕێت کە تا لە زوڵمەتی وجوددا نەیەتە دەرەوە ، ناکەوێتە ناو نووری عیشقەوە . کەواتە مەبەستی لە زوڵمەتی وجود ، بوونی ساختەیە کە دێتە جەستەیەوەو دەیکاتە نشینگەی خۆی و تیایدا بەدی دێت . بەدیهاتنی ئەو بوونە ساختەیەو دەرکەوتنی لەناو کەسەکەدا وەك زوڵمەت و تاریکی وایەو دەبێتە هۆی داپۆشین و شاردنەوەی بوونی ڕەسەن ، کە ئەو بوونە ڕەسەنەش لە مرۆڤدا شاردرایەوەو داپۆشرا ، ئەو کەسە هەستی پێ ناکات و عاشقی نابێت ، بەمە لە نووری عیشق بێبەش دەبێت . بەم پێیە زوڵمەتی وجود کە دەکاتە بوونی ساختە ، وەك سێبەرەو نووری عیشقیش ( کە ڕێگای چوونە بەرەو بوونی ڕەسەن) وەك هەتاوە . لێرەدا ئەم هاوکێشەیە دروست دەبێت :

زوڵمەتی وجود ⟵ سێبەر ⟵ بوونی ساختە
نووری عیشق ⟵ هەتاو ⟵ بوونی ڕەسەن

---

(1) د. م ، ل ٥.

ئەو سێبەرو هەتاوەی لەم دێڕەدا هەن وەك سێبەر و هـەتاوی سروشت نـین ، کـاتـێـك کـە شـوێنێك سـێبەربوو دوای ماوەیـەك هـەتاوی لێ هەڵدێت و ئـەو سـێبەرە ناهێڵێت و رووناکی دەکاتەوە . لێرەدا ئامادەیی سێبەر ، یان دەرکـەوتنی هـەتاو ، لـە دەسـت مرۆڤەکەدایـە ، ئەگـەر بـیرو هـۆش و خـەیاڵی لای سـێبەرەکە بـوو و پێیـەوە خەریکبوو ، ئەوا سێبەرەکە ئامادەیی دەبێت و هەتا کەسەکە لەم بارەدا بێـت بـە هـیچ جۆرێك هەتاوەکە هەڵنایەت و هەر سێبەرەکە حزووری دەبێت . بـەڵام ئەگـەر کەسـەکە وازی لـە سـێبـەرەکە هێناو پشت گوێی خست و بـیرو هـۆش و خـەیاڵی لای هەتاوەکـە بوو ، ئەوا هەتاوەکە دەردەکەوێت و سێبەرەکە نامێنێـت . هـەتا کەسـەکە لـەم بـارەدا بێت هەتاوەکە ئامادەیی هەیەو بەهیچ جۆرێك سێبەرەکە حـزوور پـەیـدا ناکاتـەوە . بـە پێی ئەم یاسایە ئەگەر مەحوی بەرەو دنیاو کۆمەڵگە بچێت ، ئەوا لە رێگـەی ئەوانـەوە بـوونێکی سـاختەی تیـادا دروسـت دەبێـت و پێیـەوە خـەریك دەبێـت . کـە بـە بـوونی ساختەوە خەریك بوو ئەوا بوونی رەسەنی خۆی لە بیردەکات و لە عیشقی ئەو بوونەی خۆی دوور دەبێت . بۆیە ئەگەر بیەوێت ، بە بوونی رەسەنی خـۆی بگـات ، دەبێـت لـە بەرامبەر ئەو بوونەیدا بکەوێتـە حاڵـەتی عیـشقەوە . کەوتنـە حاڵـەتی عیـشقیش بـەوە دەبێت (خود ـ ئا)یی نەکات و واز لەو خودە بهێنێت کە لە رێگـەی دەرەوەو کۆمـەڵگاو بەهۆی ئەو بوونە ساختەوە کە ئەوان ناردوویانەتە ناویەوە ، تیایدا دروست بووە ، کـە ئەم مەحوییە یاخود ئەم خودە نەما کە دەرەوە دروستیان کردووەو بوونێکی ساختەی هەیە ، ئەوا بوونە رەسەنەکە دەردەکەوێت . دەرکەوتنی ئـەم بوونـە رەسـەنەش بـەوە دەبێت کە زنجیری موقەددەسی عیشق بکاتە پێی خۆی :

**لە پێ حەرامە زنجیرەی سیلسیلەی موقەددەسی عیشق**
**ببـی بـە شـێر و مـەگـەر هـەڵگری لـە دنـیـا دەست**[1]

زنـجیـری پـیرۆزی عیشق ، زنجیرێـك نییـە بـە ئاسـانی بکرێتـە پێـی هـەموو کەسێك و ئەو کەسە بەم زنجیرە ببەسترێتەوەو پابەندی ئەم عیشقە بێت . ئەم زنجیرە دەکرێتە پێی کەسێك کە بەقەد شێر ئازابێـت و ئـەم ئازایەتیـەی وای لێ بکـات بتوانێـت دەست لە دنیا هەڵبگرێت . لێرەدا ئەوە دەردەکەوێت کە دەسـت هـەڵگرتن و وازهێنـان لە دنیا کارێکی قورس و پڕ مەترسیەو بـە هـەموو کـەس ئـەنجام نادرێـت ، تـەنها ئـەو کەسە دەتوانێ ئـەم کـارە بکـات کـە هێنـدەی شـێر ئـازا بێـت . لێـرەدا ئـەو پرسـیارە

(1) د . م ، ل ٧٠ .

سەرهەڵدەدات کە بۆچی دەست هەڵگرتن لە دنیا کارێکی قورس و مەترسیدارەو بە هەموو کەس ئەنجام نادرێت ؟ بێگومان مرۆڤ کە لە دایك دەبیّ و دێتە دنیاوە ، بە گەورەبوون و ژیان لە ناو کۆمەڵگەو خەڵکدا ، لای ئەوان کەسێتییەك بۆ خۆی پەیدا دەکات و ئەم کەسێتیەش بەو ڕێورەسم و دابونەریت و بیرکردنەوەو بۆچوونانەوە پابەندە کە کۆمەڵگەو خەڵك هەیانەو لە ڕێگەیانەوە ژیانی خۆیان ڕێك دەخەن و بژێوی ژیان (چ مادی بیّ یان مەعنەوی) دەستەبەر دەکەن و دەژین . ئەم کەسێتیەی کە مرۆڤەکە لای دەرەوە هەیەتی ، لە خۆیەوە سەرچاوەی نەگرتووە ، بەڵکو لە دەرەوە سەرچاوەی گرتووە ، واتە لە پابەندبوون بە کۆمەڵگەو (یاسا و دابونەریت و... هتد)ی کۆمەڵگەوە ئەو کەسێتیەی بۆ دروستبووە. بەم پێیە ئەم کەسە بوونێکی ساختە تیایدا باڵادەستە کە لە دەرەوە هاتووەتە ناوی و دەیجوڵێنێت و هەڵسوکەوتی پیّ دەکات و لە ڕێگەی ئەم کەسەوە بەدی دێت . بەمەش ئەو کەسە لە بوونی ڕەسەنی خۆی دادەبڕێت و ئاگای لێی نابێت ، کە لێی بێئاگا بوو مانای وایە عاشقیشی نابێت و لە عیشقی ئەو بوونەی بێبەش دەبێت . ئەگەر بیەوێت بەرەو ئەم بوونە ڕەسەنەی خۆی بگەڕێتەوەو عاشقی ببێت ، دەبێت دەست لە دنیا هەڵبگرێت ، واتە دەبێت واز لەو کەسێتییەی بهێنێت کە لای دەرەوەو کۆمەڵگە هەیەتی ، نەك هەر ئەمە بەڵکو دەبێت واز لە کۆمەڵگەو خەڵکیش بهێنێت و لێیان دابڕێت . بێگومان ئەمەش کارێکی قورس و مەترسیدارە ، چونکە کە وازی لە کۆمەڵگەو خەڵك و ئەو کەسێتییەی هێنا کە لای ئەوان هەیەتی ، ئەوا کۆمەڵگەش ئەم فڕیّ دەداتە دەرەوەی خۆی و هەموو پەیوەندییەکی لەگەڵدا دەپچڕێنێت ، بەمە ئەو ترسە دەخەنە دڵی کەسەکەوە کە ژیانی ئەم بەستراوە بەوانەوەو بیّ ئەوان ناتوانێت لە ژیان بەردەوام بێت و لەناو دەچێت . ئەگەر کەسەکە ئازاو بەجەرگ بێت ، ئەم ترسەی کۆمەڵگەو خەڵك کاری لیّ ناکات و ئامادەیە لێیان دابڕێت و ڕوو لە بوونی ڕەسەنی خۆی بکات ، با ئەم دابڕان و دەستهەڵگرتنە ببێتە هۆی لەناوچوونیشی . کە مەحوی ئامادەی ئەنجامدانی ئەم کارە بوو مانای وایە کەسێکی ئازایەو شایەنی ئەوەیە زنجیری عیشقی بکرێتە پیّ . ئەم زنجیر کردنە پێیەش بە ڕواڵەت وەکو بەستنەوەو دیلی وایە ، بەڵام ئەم بەستنەوەیە لە بەرامبەر دنیاو بوونی ساختەدایەو بەرەو ئەوان ناچێت ، ئەگینا لە بەرامبەر بوونی خۆیدا سەربەستییەکی تەواوی هەیەو ئەو زنجیر کردنە پێیە دەبێتە جوانی و زینەت بۆی :

**شێرێکی پێ لە سیلسیلەدایە ئەسیری عیشق**

**مەردی ، بزانە زینەتی مەردانە تەوق و رەوق**[1]

ئەو کەسەی دەرکی بە بوونی رەسەنی خۆی کردو کەوتە عیشقی ئەو بوونە رەسەنەی خۆیەوە ، ئامادەیە ببێتە ئەسیری ئەم عیشقە کە دەکاتە پابەندبوون بەم عیشقەوەو وازهێنان لە دنیا ، چونکە لەم عیشقەوە بەو بوونەی دەگات و دەبێتە کەسێکی پێگەیشتوو . ئەم کەوتنە حاڵەتی عیشقەش وەك ئەوەیە لەلایەن ئەو عیشقەوە زنجیری کرابێتە پێ و بەستراببێتەوە . بەڵام مەحوی هەستدەکات هەر کەسێك زنجیری عیشقی کرایە پێ ئەوا کەسێکی ئازایەو وەکو شێر وایەو ئەو زنجیر کرانە پێیەش نەك هەر ناشیرین نییە ، بەڵکو زینەت و جوانییەو مەحوی شانازیی پێوە دەکات ، چونکە نیشانەی ئەوەیە توانیویەتی لە پێناو عیشقی ئەو بوونەیدا دەست لە پارەو سامان و کۆمەڵگەو هەموو دنیا هەڵبگرێت ، کە ئەمەش کارێکی قورسەو بە هەموو کەس ئەنجام نادرێت ، بەڵام ئەم لە پێناو عیشقی ئەو بوونەیدا ئەنجامی داوە . قورسیی ئەم کارە وا دەکات عیشقیش کارێکی گەورەو قورس بێت ، بۆیە دەڵێت :

**خودا گرتوو دڵم چۆتن بە گژ شۆڕ و شەڕی عیشقا**

**بە نەصصی ئایە ئەفلاك و زەمین ئەم بارە ناکێشیٚ**[2]

لێرەدا مەحوی عیشقی بە کارێکی قورس و پڕ مەترسی داناوە ، چونکە دەبێت کەسی عاشق ئامادەبێت جگە لە (مەعشووق - بوون) ، واز لە هەموو شتێك و لە دنیاو دەرەوە بهێنێت . ئەمەش بە نسبەت مرۆڤەوە کارێکی قورسەو لە قورسیدا مەحوی بەو ئەمانەتەی چواندووە کە کاتی خۆی خوا ویستوویەتی بیدات بەسەر ئاسمان و زەویدا ، بەڵام ئەوان لەبەر قورسیی ئەمانەتەکە نەیانتوانی ئەو ئەمانەتە هەڵگرن و ترسان لێی ، کەچی مرۆڤ ئەو بارەی خستە سەرشانی خۆی و ئەو ئەمانەتە قورسەی هەڵگرت . لێرەشدا مەحوی هەستدەکات ئەم عیشقەی بەرامبەر (یار - بوون) هەیەتی ئەمانەتێکی قورس و مەترسیدارەو وا دەرد،کەوێت کە مەحوی وەکو کەس و وەکو ئەوەی کە بە عەقڵ و وەك ئەهلی دنیا بیری لە قورسی عیشق کردووەتەوە ، ئامادە نەبووە بە گژ شۆڕ و شەڕی عیشقدا بچێت . بەڵام لەبەرئەوەی پێش کەوتنە حاڵەتی عیشق ئەوەی بۆ دەرکەوتووە شتی دنیایی وەك پارە و سامان و دەسەڵات و

---

(1) د . م ، ل ١٨٤ .

(2) د . م ، ل ٣٠٣ .

تەنانەت خودی دنیا کاتێن و تاسەر بۆ مرۆڤ نابن ، چونکە سروشتی دنیا وایە کە ڕۆژێك ڕوو لە مرۆڤ دەکات و بەرزی دەکاتەوەو پایەداری دەکات ، ڕۆژێکی تر ڕووی لێ وەردەچەرخێنێت و پشتی دەشکێنێت و دەیدات لە زەوی . ئەم بێ ئەباتیەی دنیاو شتی دنیایی وایان لێکردووە کە هەست بکات نابێت مرۆڤ ڕوو لە دنیاو شتی دنیایی بکات و چاوەڕوانی ئەوە بێت لە ڕێگەی ئەوانەوە بوونی خۆی بە دەست بهێنێت ، چونکە بوونی ڕەسەنی مرۆڤ لە دنیاو شتی دنیاییەوە بەدەست نایەت . ئەمە وای لێکردووە واز لە دنیاو شتی دنیایی بهێنێت . بەم وازهێنانەی لە دنیا ، بووەتە ئەهلی دڵ ، کە بوو بە ئەهلی دڵ ، ویستی کەسی لە دەست دەدات و دەکەوێتە ژێر ویست و دەسەڵاتی دڵەوە . دڵیشی وای لێکردووە ، جارێکی تر چاوی لەوە نەبێت بەرەو دنیا بچێتەوەو بەرەو عیشقی (یار - بوون) ی بردووەو خستویەتیە بیابانی عیشقەوە . مەحوی هەست بەوە دەکات ئەم بیابانە پڕ مەترسییەو نازانێت تیایدا سەر دەردەکات یان نا ، بۆیە دەڵێت :

**دەزانم بادیەی عیشقە خەتەرناك**
**کەچی هەر چووم ، ئەگەر مام و ئەگەر چووم**[1]

مەحوی بە تەواوی ئەو ڕاستییەی بۆ دەرکەوتووە کە بیابانی عیشق مەترسیدارە ، مەترسیداریەکەشی لە دوو ڕووەوەیە : ڕوویەکیان ئەوەیە لەوانەیە بەرگەی دابڕان و وازهێنان لە کۆمەڵگەو دەوروبەرو دنیا نەگرێت و لەو تەنیاییەی بیابانی عیشقدا ئیرادەی لاواز ببێت و هێزو توانای دنیاو کۆمەڵگەو دەوروبەر ئەوەندە زۆر بێت ، جارێکی تر ئەم بەرەو خۆیان ڕاکێشنەوەو بەخۆیانەوە خەریکی بکەن . بەمە لەو ئازادییەی لەوان بەدەستی هێناوە بێبەش ببێت و جارێکی تر ببێتەوە بە دیلی دنیاو ژیانێکی بێماناو دوور لە عیشق بژی کە ئەمە وەك مردنی ڕۆحی وایە . ڕووەکەی تریش ئەوەیە : ئەگەر بە تەواوی لەو عیشقەدا ڕۆ بچێت و لەسەری بەردەوام بێت ، لەوانەیە بەهۆی دابڕانی لە دنیاو ڕۆچوونی لە عیشقدا لە ڕووی جەستەییەوە بفەوتێت و لەناو بچێت ، کە ئەمەشیان هەر جۆرە مردنێکە . بەڵام سەرەڕای ئەو مەترسییانەی کە لە ڕێگەیدان و سەرەڕای ئەوەی نازانێت سەر دەردەکات یان نا ، سڵ ناکاتەوەو ڕێگەی عیشق دەگرێتەبەر . ئەمەش مانای وایە بووە بە شێرو دەستی لە دنیا هەڵگرتووەو سیلسیلەی موقەددەسی عیشقی لە پێدایە . بۆیە هەستدەکات

---

(١) د . م ، ل ٢٢٥ .

گرتنەبەری ئەو ڕێگەیەو تیاچوون لە پێناویدا باشترە لەوەی ئەو ڕێگەیە نەگرێتەبەرو ژیانێکی دوور لە عیشق بژی ، کە ئەمە خۆی لە خۆیدا مردنە . ئەمەش لەم دێڕەدا دەردەکەوێت کە دەڵێت :

**جان سەختە یان لە دەعوییی عیشقا درۆزنە**
**ئەو زیندە ماوە تا لە سەفەر یاری دێتەوە**(1)

لەم حاڵەتەدا یارەکەی سەفەری کردووەو لەوەش دڵنیایە کە لەو سەفەرە دەگەڕێتەوە ، کەچی سەرەڕای ئەمە هەستدەکات یان گیانی سەختە ، ئەگەر نا دەبوایە لە تاو ئەو سەفەرەی یار دەربچووایەو بمردایە ، یان لەوەدا کە خۆی بە عاشق دادەنێت ڕاست ناکات و هەر بە قسە عاشقەو بە کردە عاشق نییە ، بۆیە لە تاو ئەو سەفەرەی یار نامرێت . ئەگەر بەهۆی سەفەرێکی یارەوە کە گەڕانەوەیشی لە دوایە مەحوی خەریك بێ گیانی دەربچێت ، بێگومان بە دابڕان و دوورکەوتنەوەی یەکجاریی لە یارو نەمانی عیشقەکەی بەرامبەر بە (یار ـ بوون) ، هەست بە ژیان ناکات و وەك مردبێت وایە . بەڵام ئەگەر لە عیشقدا بێت ئەوا زیندووەو لە مەرگ ناترسێت . ئەم ڕاستییەش لەم دێڕەدا دەردەکەوێت کە دەڵێت :

**دڵ زیندووە بە عیشق و بژی تۆ لە مەرگ ئەمین**
**بەم دەردە بمرە تا ببیە (حيٌّ لا يموت)**(2)

مەحوی هەستدەکات ئەگەر بیەوێت نەمرێت و دڵی زیندوو بێت ، دەبێ لە عیشقدا بێت ، چونکە زیندوویەتیی دڵ بە عیشقەوەیەو بەمە لە مەرگ ئەمین دەبێت. تەنانەت ئەگەر بەهۆی ئەم عیشقەوە بمرێت و لەناو بچێت ، ئەوا هەر زیندوو و نەمرە ، چونکە مردن ئەوەیە کە لە عیشق دووربێت و عاشقی ئەو بوونەی خۆی نەبێت . بەم پێیە چەمکی مردن و ژیان لای مەحوی گۆڕاون و لەو مردن و ژیانە جیاوازن کە لەناو کۆمەڵگە و خەڵك و لە دنیادا هەن . ئەم مادەم لە خەڵك و کۆمەڵگەو دنیا دابڕاوە ، لە ڕووی تێڕوانینیشەوە بۆ مردن و ژیان ، لەوان دابڕاوەو بە جۆرێکی تر لە چەمکی مردن و ژیان دەڕوانێت : مردن ئەوەیە لە عیشقدا نەبێت و ژیان ئەوەیە لە عیشقدا بێت . ئەگەر بەو چەمکەی مردن کە لای دەرەوە هەیە ، لە پێناو ئەم عیشقەدا بمرێت ئەوا هەستدەکات زیندووە ، چونکە لە عیشقدا هەست بە ژیان دەکات . بە

---

(1) د . م ، ل ٢٨٦ .
(2) د . م ، ل ٨٣ .

پێچەوانەشەوە ئەگەر لە عیشقدا نەبێت و لەناو کۆمەڵگەو دنیادا بێت و بە پێوەری ئەوان خۆشترین ژیان بژی ، بەلای خۆیەوە هەستدەکات مردووە ، چونکە لە عیشقدا نییە. مەحوی هەستدەکات دەبێت دەرککردن بەم راستییە لە بارەی چەمکی مردن و ژیان لە روانگەی عیشقەوە ، لەناو خەڵکدا بڵاو بکاتەوەو وا لە خەڵك بکات لەم روانگەوە لە مردن و ژیان بڕوانن . بەڵام لەبەرئەوەی خەڵك لە دنیادا رۆچوون و پێوەی خەریکن ، ئەربابی دنیان و لەم حەقیقەتە تێ ناگەن ، هەر لەم روانگەوەیە دەڵێت :

**لە بۆ ئەربابی دنیا مەدە بەسط و بەیانی عیشق**

**کە (مەحوی) شەرحی نوکتەی جانفزا بۆ مردووە ضایع**(1)

مەحوی هەستدەکات بەو جۆرەی ئەم لە عیشق تێگەیشتووەو لە روانگەی عیشقەوە دەڕوانێتە مردن و ژیان ، خەڵك وا تەماشای عیشق و مردن و ژیان ناکەن ، چونکە ئەوان لە عیشقدا نین و لە دنیادان . واتە خەڵك ئەهلی دنیان و تیایدا رۆچوون و پێوەی خەریکن و لە دنیاو بەدوستهێنانی شتی دنیایی وەك (پارە و سامان و دەسەڵات و...هتد)دا هەست بە بوونی خۆیان دەکەن . بێگومان ئەم بوونەی ئەوان بوونێکی ساختەیەو کەسێکیش بوونی ساختە تیایدا باڵادەست بێت ، لە بوونی رەسەنی خۆی بێئاگایەو عاشقی نابێت و هەوڵی بەدەستهێنانی نادات . مرۆڤی لەم جۆرەش بە پێی تێڕوانینی عاشق ، مرۆڤێکی مردووەو باسکردنی مەسەلەیەکی گەورەو گرنگی وەك عیشق بۆ کەسی مردوو بێ سوودەو شایەنی ئەوەنییە باسی عیشقی بۆ بکرێت ، بۆیە دەبێ مەحوی واز لەو جۆرە کەسانە بهێنێت و لە جیاتی باسی عیشق بۆ ئەوان بکات ، با لە عیشق و لەو کەسانە وردبێتەوە کە عاشقن و چۆن پلەو پایەی دنیاییان هەرچییەك بووبێت ، عیشق هەموویانی وەك یەك لێکردووەو هیچ جیاوازییەکی لە نێوانیاندا نەهێشتووە :

**لە قاپی عیشقەدا وەك شاهە بەندە**

**لەسەر خوانە ‌ـ مەتبووع و چ تابیع**(2)

لێرەشدا دیسان جیاوازییەکی تری جیهانی عیشق لەگەڵ دنیاو کۆمەڵگەدا لە شیعرەکانی مەحویدا دەردەکەوێت . لە دنیادا بە پێی سەروەت و سامان و هێزو دەسەڵات خەڵك دابەش دەکرێن ، واتە کێ لە هەموویان زیاتر هێزو دەسەڵات و

---

(1) د . م ، ل ١٦٦ .

(2) د . م ، ل ١٦٨ .

سەروەت و سامانی هەبێت ، ئەوە پاشایەو ئەوانەش کە ئەو شتە دنیاییانەیان نییە ، دەبنە بەندە . بەردەوام دنیاش بە جۆرێکە کە چەند کەسێکی کەم لێی بەهرەمەند دەبن و دەبنە خاوەنی هێزو دەسەڵات و پارەو سامان و بە هۆی ئەمانەشەوە دەبنە پاشا ، بەشی زۆری خەڵکیش لێی بێبەش دەبن و بەم بێبەش بوونەیان دەبنە بەندەو کۆیلەی خاوەن دەسەڵات و پاشاکان . بەڵام جیهانی عیشق بەم جۆرە نییە ، لەم جیهانەدا پاشاو بەندە وەکو یەکن و هیچ جیاوازییەك لە نێوانیاندا نییەو پێکەوە لەسەر خوانی عیشق دادەنیشن ، چونکە عیشق کەس بێبەش ناکات و هەرکەسێك مەیلی عیشقی کرد (چ پاشا بێ چ بەندە) ، عیشق بە رێبوارێکی رێگەی خۆی قبوڵی دەکات . کە بووە رێبواری رێگەی عیشق ، دەکەوێتە (بادیەی عیشق)ەوە ، لە بیابانی عیشقیشدا هەموو عاشقەکان وەکو یەکن و کەس لە کەس زیاتر نییە . چ (تابیع و چ مەتبووع) ، وەکو یەك وان و کەسیان پاشای ئەوی تر نییە ، با لە دەرەوەو لە دنیادا یەکیان پاشا بوویێت و ئەوی تر بەندە ، لە جیهانی عیشقدا هەموویان وەك یەك لەسەر خوانی عیشق کۆدەبنەوە . سەرەڕای ئەوەی لە دەرەوەو لە ناو خەڵکدا وەك گەدا دەردەکەون ، لەوێ هەریەکەیان پاشایەکە بۆخۆی . بەڵام دنیا بەم جۆرە نییە ، چونکە زۆربەی زۆری خەڵك مەیلی بەدەستهێنانی دەکەن ، کەچی کەمیان بەدەستی دەهێنن و زۆریان لێی بێبەش دەبن و بەردەوام ئەو کەمە بە کەم سەیری زۆرەکە دەکەن و گاڵتەیان پێ دەکەن ، تەنانەت ئەوانەش کە بە هۆی عیشقەوە وازیان لە سەروەت و سامان و دەسەڵات هێناوە ، هەر دەبنە سەرگوزشتەی ئەهلی دنیا :

**فسانەی من بووە زینەی مەجالیس ئافەرین ئەی عیشق**
**چەها بێ نام و خامی وەك منت کردۆتە صاحێب نام**(1)

مەحوی وازی لە دنیاو سەروەت و سامان هێناوەو لە کۆمەڵگەو خەڵك خۆی دابڕیوەو لەو دابونەریت و رێوڕەسم و بۆچوونانەی ئەواندا نەتواوەتەوە کە لە میانەیانەوە دەژین . ئەم بەجۆرێکی جیاواز لەوان دەژی و ئەم ژیانە جیاوازەشی لە عیشقەوە سەرچاوەی گرتووە . بەڵام خەڵك بە کەسێکی لە دنیا تێنەگەیشتووی دادەنێن و لە کۆڕو کۆبوونەوەو مەجلیسەکانیاندا باسی دەکەن . مەحویش ئەم جۆرە تێڕوانین و سەیرکردنەی خەڵك بۆی بە مایەی شانازی دەزانێت ، چونکە مانای ئەوەیە وەك ئەوان ئەهلی دنیا نییەو عاشقەو لە عالەمی عیشق و مەحەببەتدایە ، بۆیە خەڵك

---

(1) د . م ، ل ٢١٦ .

بەو جۆرە باسی دەکەن و کۆڕو مەجلیسی خۆیانی پێ گەرم دەکەن . دەشتوانین بەم جۆرەی تر ئەم دێڕە لێك بدەینەوە : مەحوی هەتا بە دنیاوە خەریك بوو و عاشق نەبوو ، لە کۆڕی عاشقاندا باسی نەدەکرا ، واتە کەسێك بوو لای عاشقان هیچ ناو و ناوبانگێکی نەبوو و کەسێکی پێنەگەیشتوو (خام) بوو ، بەلاّم کە توانی واز لە دنیاو شتی دنیایی بهێنێت و بکەوێتە عالەمی عیشقەوەو ببێتە عاشق ، ئیتر ناوی چووە کۆڕو مەجلیسی عاشقانەوەو سەرگوزشتەو بەسەرهاتی ئەم کۆڕو مەجلیسی عاشقانی دەڕازاندەوە . بەمە هەستدەکات لە ناو عاشقاندا بووە بە کەسێکی بەناوبانگ و هەموویان دەیناسن و باسی دەکەن و ئەم ناوبانگەشی بەهۆی عیشقەوە دەستکەوتووە ، بۆیە شانازی بەم عیشقەوە دەکات . لە هەردوو لێکدانەوەکەدا مەحوی هەر ناوبانگ دەردەکات ، بەلاّم لە یەکەمیاندا ناوبانگەکەی لای ئەهلی دنیایەو لە روانگەی ئەوانەوە ناوبانگێکی سلبیە ، بەلاّم بەلای خۆیەوە ئیجابییە ، لە دووەمیشیاندا ناوبانگەکەی لای ئەهلی دڵ (عاشقان)ەو ناوبانگێکی ئیجابییە .

بەمجۆرە بۆمان دەردەکەوێت کە مەحوی لە حاڵەتی عیشق و جیهانی عیشقدایە . ئەو جیهانی عیشقە ئەوەندە بە لایەوە گەورەو بەرزو پیرۆزە ، ئامادەیە هەموو داواکاری و رێوڕەسمەکانی جێبەجێ بکات کە بریتین لە : سووتان بە ئاگری عیشق و خەم و پەژارەی عیشق و قوربانیدان لە پێناو عیشقدا .

## عیشق و ئاگری عیشق

مەحوی لە جیهانی عیشقدایە ، ئەم جیهانە جیهانێکی سەربەخۆیەو لە شیعرەکانی مەحویدا بە (دیاری عیشق ، ئیقلیمی عیشق ، وادیی مەحەببەت ...) ناوی هاتووە . دیاردەو رێوڕەسم و دانەکانی ئەم جیهانی عیشقە وەك هی دنیا نین و لە ریشەوە لێیان جیاوازن . یەکێك لەو دانە یاخود دیاردانەی لە جیهانی عیشقدا هەیە ئاگرە . ئەم ئاگرەی ئیقلیمی عیشق بە تەواوی پێچەوانەی ئەو ئاگرەیە کە لە دنیاداو لای مرۆڤ هەیە ، ئاگری دنیا سوتێنەرەو مرۆڤ لەناو دەبات و دەیفەوتێنێت . کەچی ئاگری عیشق نەك هەر سوتێنەر نییەو عاشق ناسوتێنێت ، بەڵکو عاشق و کیان و بوونی رەسەنی عاشق دەپارێزێت و لە تیاچوون رزگاری دەکات ، تەنانەت لەو کائینە نامۆیانەش پاکی دەکاتەوە کە لەناویدان و دەبنە هۆی ئەوەی لە بوونی رەسەنی خۆی

دایبېڕن ، بەوەی دەیان سووتێنێت و لەناو عاشقدا نایانهێڵێت . واتە ئاگری عیشق پارێزەری مرۆڤە لە بوونی ساختەو دنیاو حەزکردن لە شتی دنیایی و لە بەرامبەر ئەمانەدا سوتێنەرە ، بەڵام بەرامبەر بە عاشق و بوونی رەسەنی عاشق سوتێنەر نییە . نەك هەرئەمە ، تەنانەت عاشق لە ئاگری دۆزەخیش دەپارێزێت کە سوتێنەرترین ئاگرەو هیچ شتێك لەبەریدا خۆی راناگرێت . ئەم ئاگرەی عیشق لە هەر شوێنێك هەبێت ، ئەو شوێنە بە نسبەت عاشقەوە بەهەشتە ، مەحوی بەبێ عیشق ئەو بەهەشتەی ناوێت کە ئایین باسی دەکات و ئەم بەهەشتەی جیهانی عیشقی دەوێت ، ئەگەر بەم ئاگرەی عیشقەوە لەو دۆزەخەدا بێت کە ئایین باسی دەکات ، ترسی لێی نییە ، بۆیە دەڵێت :

گەر ئاگری مەحەببەتی شك بەم لە دۆزەخا
ئەو دۆزەخە بەهەشتمە ، جەننەت دەکەم حەرام[1]

واتە ئەگەر لە دۆزەخدا ئاگری عیشق هەبێت ، ئەوە هەستدەکات لە ئاگری دۆزەخ کە ئازاردەرو سوتێنەرە پارێزراوەو ئامادەیە لەم دۆزەخەدا بێت ، نەك لە بەهەشتێکدا بێت کە ئاگری عیشقی تێدا نەبێت ، چونکە ئاگری عیشق ئەو دۆزەخەی بۆ دەکات بە بەهەشت و لە ئاگری دۆزەخ دەیپارێزێت و ناهێڵێت مەحوی بسوتێنێت و تەنها ئەو شتانە دەسوتێنێت کە پێی نامۆن وتیایدان و پێوەیان خەریکە ، وەك بوونی ساختەو ئەو مەوجودانەی هاتوونە ناویەوەو بەرەو ئەوەی دەبەن لە بوونی رەسەنی خۆی دایبېڕن . کەواتە کاتێك مرۆڤ بەرەو بوونی رەسەنی خۆی دەچێت و عاشقی دەبێت ئەگەر لە دۆزەخیشدا بێت ، ئەوا ئاگرەکەی دۆزەخ و ئاگری ئەم عیشقە بوونی ساختەو مەوجودەکانی تری ناو کەسەکە دەسوتێنن و کەسەکە لێیان پاك دەبێتەوەو ئامادەی دەرکەوتنی بوونی رەسەنی خۆی دەبێت . واتە ئاگری عیشقەکە عاشق لە سوتاندن بە هۆی ئاگری دۆزەخەوە دەپارێزێت و ئاگرەکەی دۆزەخ وا لێدەکات سوتاندنەکەی بە نسبەت عاشقەوە باش بکەوێتەوە . بۆیە تا مەحوی نەکەوێتە جیهانی عیشق و بەگڕی ئەو عیشقە ، بەم کردەی پاکبوونەوەیەدا لە بوونی ساختەو مەوجوددا نەڕوات ، بە بوونی رەسەنی خۆی ناگات و بەدیی ناهێنێت . ئەوەیش کە مرۆڤ لە بوونی خۆی دادەبڕێت ، ئەو جەستەیەیەتی کە بە مەوجودەوە خەریکە ، واتە بە شتە مادییەکانی وەك پارەو سامان و موڵك و شتی دنیاییەوە خەریکە و تیایاندا

(1) د . م ، ل ٢١٣ .

ڕۆدەچێت و وەك بەشێك لە جەستەی ئەمیان لێ دێت و بوونێکی ساختەی تیا دروست دەکەن کە لە خۆیانەوە سەرچاوەی گرتووەو ئەو هەستەیشی لا دروست دەکەن کە ناتوانێت بێ ئەوان بژی ، واتە لە بوونی خۆی دایدەبڕن و شوێنی ئەو بوونەی دەگرنەوەو لەواندا هەست بە بوونی خۆی دەکات . کەچی لە راستیدا ئەم شتانە بە نسبەت بوونی کەسەکەوە وەك سێبەر وان و حەقیقەتی کەسەکە بەو شتانەوە نەبەستراوە ، بەڵکو بە بوونی خۆیەوەو عیشقی ئەو بوونەیەوە بەستراوەو تا نەچێتە جیهانی عیشقەوەو خۆی لەو شتە ماددی و دنیاییانە رزگار نەکات ، جەستەی پاك نابێتەوەو بە (یار ـ بوون) ناگات . پاکبوونەوەی جەستەشی لە بوونی ساختەو شتی دنیایی ، بەوە دەبێت عاشق ببێت و لە عیشقدا بێت ، چونکە مەحوی هەستدەکات عیشق نەك هەر ئاگری هەیە ، بەڵکو خودی خۆی بە نسبەت بوونی ساختەو شتی دنیاییەوە ئاگرە ، بۆیە دەڵێت :

**عیشق ئاگرێکە بەر بووە هەر کەس ، دەیکات بە کەس**

**ئەگەر رۆژە رەش وەکو شەوە بێ ، بوو بە شەو چراغ[1]**

لێرەدا بەنسبەت مەحوییەوە عیشق ئاگرەو هەرکەسێك کەوتە عیشقەوە ئەوا وەك ئەوەیە ئەو ئاگرەی تێبەر بووبێت . هەرکەسێکیش ئاگری عیشقی تێبەر بوو دەبێت بە کەس ، واتە دەبێت بە مرۆڤێکی پێگەیشتوو . پێگەیشتنەکەشی لەوەوەیە ئەگەر بە دنیاو شتی دنیایی وەك (پارەو سامان و دەسەڵات و...هتد)ەوە خەریك بووبێت و لە رێگەیانەوە بوونێکی ساختەی تیادا دروست بووبێت ، بەڵام هەر کاتێك لەناو جەرگەی دنیاو ئەو شتە دنیاییانەدا هەستی بەوە کرد کە بوونی راستەقینەی لەوانەوە سەرچاوە ناگرێت و هەوڵیدا بەرەو بوونی رەسەن و راستەقینەی خۆی بگەڕێتەوەو عاشقی ببێت و لە بەرامبەریدا بکەوێتە حاڵەتی عیشقەوە ، بەم کەوتنە عیشقە ، عیشقەکەی وەك ئاگرێك بەردەبێتە مەحوی و دەبێتە هۆی سووتاندنی ئەو بوونە ساختەیەی کە لە رێگەی دەرەوەو دنیاو شتی دنیاییەوە تیایدا دروستبووە ، بەم سووتانە مەحوی لێی پاك دەبێتەوەو لە ناویدا نامێنێت و بەمە دەبێتە کەس . هەر کەسێکیش ئاگری عیشقی تێبەر بوو و بەهۆی ئەو ئاگرەوە بوو بە کەس ، ئەوا ئەگەر کەسێکی بەختڕەش بێت و بەختەکەی لە رەشیدا وەکو شەوێکی تاریك وابێت ، ئەوا بە هۆی ئاگری عیشقەوە بەختی سپی دەبێت و دەکرێتەوە و چانسی ئەوەی دەبێت

---

(1) د . م ، ل ١٧١ .

بەو بوونە رەسەنەی خۆی بگات کە وەکو شەوچراغ وایەو ژیان بۆ مرۆڤ رۆشن دەکاتەوە . لێرەداو بۆ زیاتر روونکردنەوەی مەسەلەی ئەم ئاگرەی عیشق لای مەحوی پێویستە لە شیعرەکانی مەحویدا باس لە پەروانەو مۆم و خۆدانە بەر گڕی مۆم لەلایەن پەروانەوە بکەین .

## پەروانە و مۆم ـ ئاگری عیشق

مەحوی لە شیعرەکانیدا چەندین جار باسی ئەو دیاردەیەی کردووە کە پەروانە کاتێك لە شەودا رووناکی مۆم دەبینێت ، بەرەو ئەو رووناکییە دەچێت و ئەوەندە لەو رووناکییە نزیك دەبێتەوە ، تا خۆی دەدات بە گڕی مۆمەکەدا و دەسووتێت[1]. لێرەدا دەپرسین کە بۆچی ئەم دیاردەیە ئاوا بە قووڵی سەرنجی مەحویی راکێشاوەو چەندین جار لە شیعرەکانیدا باسی کردووە؟ ئەم حاڵەتەی پەروانە کە مەحوی دەرکی پێکردووەو باسی کردووە ، بۆ دەربڕینی مەسەلەیەکی قووڵە کە لای مەحوی هەبووە، بەڵام نەیتوانیوە وەك پێویست راستەوخۆ لە خودی خۆیەوە ئەو حاڵەتە دەربڕێت و روونی بکاتەوە ، بۆیە هاتووە لەڕێگەی مۆم و پەروانەوە ئەو حاڵەتەی خۆی دەربڕیوە، ئەو حاڵەتەش بریتییە لە عیشقی بوون و خۆدانە بەر ئاگری ئەم عیشقە ، بەهۆی ئەو ئاگرەوە دەسوتێت و بەو سوتانە لە بوونی ساختەو شتی دنیایی پاك دەبێتەوە . ئەوەتە دەڵێت :

**(محوی) زتب شوق تو بگداخت ، خود ای شمع**
**امشب بعزاخوانی پروانە بیرون آ[2]**

واتە : مەحوی (وەك پەروانە) لە تاو ئارەزووی گەیشتن بە تۆ تواوەتەوە ، تۆش ئەی مۆم ئەمشەو بۆ پرسەو سەرەخۆشی پەروانە دەربکەوە . لێرەدا ئەوە دەردەکەوێت کە مەحوی لە تاو مەیل و دیداری (یار ـ بوون) ، وەك پەروانە کە بە گڕی مۆم دەتوێتەوە ، تواوەتەوەو لەناوچووەو داوا لە (یار ـ بوون) دەکات بۆ سەرەخۆشی کردنی دەربکەوێت و سەر لە مەیتەکەی بدات . واتە مەحوی داوا لە (یار ـ بوون) دەکات بێتە سەر مەیتەکەی ، چونکە بەم هاتنەی یار ، مەحوی زیندوو دەبێتەوەو

---

(1) ئەمە مانای ئەوە نییە کە باسکردنی پەروانەو مۆم هەر تەنها لای مەحوی هەبووەو شاعیرەکانی تر باسیان نەکردووە ، ئەوانیش باسیان کردووە ، بەڵام باسکردنی ئەم دیاردەیە لای مەحوی دەتوانرێت لەو روانگەیەوە لێکبدرێتەوە کە ئێمە لێی دەدوێین

(2) د . م ، ل ٤٧٤ .

دەبێتە کەسێکی نەمر . هەروەها سەبارەت بەم سووتانە بە هۆی عیشقی (یار - بوون)ەو، دەڵێت :

**دیارە خۆ پەروانە هەر سووتانە ئەسڵی مودەدەعای**

**بۆیە ئێمەش عاشقین ئەی شەخصی ئاتەش خوو بە خووت**[1]

واتە وەك چۆن پەروانە ئامادەی خۆدانە بەر گڕی مۆم و سووتانە ، مەحویش {کە بە (ئێمە) ئاماژە بە خۆی دەکات} ئامادەو عاشقی سووتانە بە دەستی یارە سیفەت ئاگرینەکەی . واتە عاشقی ئەو (یار - بوون)ەیە کەسیفەتی ئاگرینەو ئامادەیە بە ئاگری ئەو یارە بسووتێت ، بۆ ئەوەی پاك ببێتەوە . ئەم سووتانە نەك هەر ئازار بەخش نییە ، بەڵکو بە نسبەت عاشقەوە مایەی ئارامییەو سەکینەتی پێ دەبەخشێت ، بۆیە دەڵێت:

**سەکینەی مەرتەبەی سووتانیە ئاتەش پەرستی عیشق**

**ئەگەر صاحیب ئیرادەت بیّ عەجەب پیرێکە پەروانە**[2]

ئەوەی ئاگری عیشق بپەرستێت ، بەوە سەکینەتی بۆ دێت و دڵی ئارام دەبێت ، بگاتە پایەی سووتان . عیشقیش عاشقبوون بە بوونی رەسەن و چوون بەرەو ئەو بوونەیە ، بەم پێیە کەسێك کە عاشقی بوونی خۆی بێت و بیەوێت بەو بوونەی بگات ، دەبێت پەروانە بکاتە پیری خۆی و چاو لەو بکات و ئیرادەی ئەوەی هەبێت لە پێناو ئەو بوونەدا جەستەی بکاتە قوربانی ، وەك چۆن پەروانە ئەم ئیرادەیەی هەیەو جەستەی دەکاتە قوربانی مۆم . ئەم خۆدانە بەر ئاگری عیشقە لەو حاڵەتەدا بە تەواوی لای عاشق سەر هەڵدەدات کە بیر لە (یار - بوون) دەکاتەوەو ئەو عیشقەی دەگاتە لوتکە :

**کە هەڵگیرسا لە نووری بادە شەمعی حوسنی جانانە**

**نەچێتە سەر طەریقەی حەزرەتی پەروانە دڵ چبکا**[3]

بیرکردنەوە لە بوون و رۆچوون لەم بیرکردنەوەیەدا ، وەك بادەیەکەو کەسەکە مەست دەکات و لە دەرەوە دایدەبڕێت . ئەو بادەیە رووناکیی هەیە (بۆیە دەڵێت نووری بادە) ، بەهۆی ئەم بادەیەوە مۆمی جوانیی (جانانە - یار - بوون)

---

(1) د . م ، ل ٧٨ .

(2) د . م ، ل ٢٧٨ .

(3) د . م ، ل ١٤ .

دادەگیرسێت . واتە لە ڕێگەی بیرکردنەوە لە بوونەوە ، ئەو بوونە بۆ کەسەکە دەردەکەوێت و وەك مۆمێکی داگیرساو وایەو ڕووناکی پەخش دەکاتەوە . مەحوی کە هەستی بەم ڕووناکییەی بوونی خۆی کرد ، وەك چۆن پەروانە کە ڕووناکی مۆم دەبینێت بەرەو ڕووی دەچێت ، ئەمیش بەرەو ڕووناکیی ئەو بوونەی خۆی دەچێت و ئامادەیە لە پێناو ئەو بوونەیدا جەستەی خۆی بکاتە قوربانی . وەك چۆن پەپوولە لە پێناو مۆمەکەدا جەستەی خۆی دەکاتە قوربانی و دەسووتێت . هەستیش دەکات بەم قوربانیکردنەی جەستەو خۆدانە بەر ئاگری عیشق ، وەك پەپوولە جەستەی ناسوتێت و لەناو ناچێت ، بەڵکو جەستەی لە دنیاو شتی دنیایی و بوونی ساختە پاك دەبێتەوەو دەبێتە نشینگەیەکی ئامادە بۆ دەرکەوتنی (یار - بوون) .

لەم چەند دێڕە شیعرەو لێکدانەوەیان ئەوە دەردەکەوێت مەحوی لە ڕێگەی مۆم و پەروانەوە تەعبیر لە ئاگری عیشق و خۆدانە بەر ئەو ئاگری عیشق و گەیشتن بە بوونەکە دەکات . پەپوولە ڕووناکیی مۆم لێی دەدات و هەست بەو ڕووناکییە دەکات ، دوایی بەرەو سەرچاوەی ڕووناکییەکە دەڕوات کە مۆمەکەیە ، خۆی بەگڕەکەیدا دەدات و دەسووتێت ، واتە خۆی دەکاتە قووربانیی ڕووناکی و مۆمەکە .

مەحویش دوای ئەوەی واز لە بوونە ساختەکان و مەوجودو شتە دنیاییەکان دەهێنێت ، خۆی دەداتە بەر ئاگری عیشق بۆئەوەی بە تەواوی لە بوونی ساختەو دنیاو شتی دنیایی پاك ببێتەوە ، ئەمەش ڕێگای گەیشتنە بە بوونی ڕەسەن . ئامادەیشە لە پێناو عیشقی ئەو بوونەو گەیشتن بەو بوونەدا جەستەی بکاتە قوربانی . واتە ئەگەر بەهۆی خۆدانە بەر گڕی ئاگری عیشقەوە ، جەستەی لە دنیاو شتی دنیایی و بوونی ساختە پاك نەبوویەوە ، ئەوا دەیەوێت بەم ئاگرەی عیشق جەستەی بسووتێت و بیکاتە قوربانیی بوونە ڕەسەنەکەی .

ئەم بە قوربانی کردنەی جەستەی لە پێناو بوونی ڕەسەنی خۆیدا ، بە باشتر دەزانێت لەوەی جارێکی تر لەو بوونە ڕەسەنەی خۆی داببڕێت و بەرەو بوونی ساختەو مەوجودو شتی دنیایی بچێتەوەو پێوەیان خەریك ببێت .

# ئاگری عیشق و رووناکیی بوون

ئەگەر عیشقی بوونی رەسەن ئاگر بێت ، بێگومان ئەم ئاگرە روناکیی هەیەو سەرچاوەی رووناکییەکەش ئەو بوونە رەسەنەیە کە مەحوی عاشقی بووەو دەیەوێت پێی بگات . ئەم حاڵەتە وەك ئەو حاڵەتە وایە کە هایدگەر بە خۆدانە بەر رووناکیی بوون ناوی دەبات و دەڵێت : ((خۆدانە بەر رووناکیی بوون(التعرض لإنارة الوجود) ، بە ئامادەیی ، یاخود بوونایەتی(تواجد)ی مرۆڤ ناو دەبەم و تەنها مرۆڤ خاوەنی ئەم شێوازەی بوونە))[1] . واتە مرۆڤ ، کاتێك بە (بوون)ی خۆی دەگات و ئەو بوونەی بەدی دەهێنێت ، کە خۆی بداتە بەر رووناکیی بوون و ((ئەم رووناکییە بریتییە لە خودی بوون))[2] ، واتە کە کەسەکە خۆی دەداتە بەر ئەم رووناکییەی بوون ، مانای وایە بەرەو بوونی رەسەنی خۆی دەچێت . کەواتە سەرەڕای ئەوەی دەبێت مرۆڤ هەوڵ بدات لە رێگەی بەدیهێنانی تواناو ئیمکانەکانی بوونییەوە بەو بوونەی خۆی بگات ، لەگەڵ ئەمەدا ((دەبێت خۆی بداتە بەر رووناکیی بوون و بە روویدا بکرێتەوە))[3] ، ئنجا بەو بوونەی خۆی دەگات و بەدیی دەهێنێت . ئەم رووناکییەی بوون لە زماندا دەردەکەوێت ، چونکە ((زمان ماڵی بوونە ، واتە ئەو جێگەیەیە کە رووناکیی بوون تیایدا دەردەکەوێت))[4] و مرۆڤ بە ئاسانی ناتوانێت هەست بەم رووناکییەی بوون بکات ، چونکە ((بە شێوەیەکی ئاسایی ئەم رووناکییە لێمان شاراوەیە ، یان داپۆشراوە ، ئەمەش لەبەرئەوەیە ئێمە لە ژیانی رۆژانەماندا تەنها بایەخ بەو مەوجودانە دەدەین کە لەبەر ئەم رووناکییەی بووندا دەردەکەون))[5] . واتە گرنگی دان بە مەوجودو خەریکبوون پێوەی و رۆچوون تیایدا ، وادەکەن دەرك بەو رووناکییە نەکەین ، کە بووەتە هۆی دەرکەوتنی ئەو مەوجودانە .

ئێمە پێشتر باسی (پەروانەو مۆم)مان کرد ، پەروانە تەنها لە شەودا کە رووناکی مۆمی بینی خۆی دەداتە بەر رووناکی و گڕی مۆمەکە ، ئەگەر لە رۆژدا مۆم هەبێت و داگیرسا بێت ، پەروانە بەرەو رووی ناچێت و خۆی نادات بە گڕەکەیدا . لێرەدا ئەگەر پەروانە بە مەحوی دابنێین و مۆمەکەش بە بوونی رەسەنی مەحوی

---

(1) نداء الحقيقة ، مارتن هيدجر ، ص ١٤٨ .

(2) هـ . س ، هـ ، ل .

(3) هـ . س ، ل ١٤٩ .

(4) هـ . س ، ل ١٤٨ .

(5) هـ . س ، هـ . ل .

دابنێین ، دەتوانین بڵێین : پەروانە لەبەرئەوەی لە ڕۆژدا بە مەوجودەکانی ترەوە (بۆنموونە بە گوڵ و دارو درەختەوە )خەریك دەبێت ، مۆمەکە (کە بوونی خۆیەتی) لەبیر دەکات و بەرەو ئەو ناچێت ، بەڵام لە شەودا لەبەرئەوەی دنیا تاریکەو مەوجودەکانی تر دیار نین و لە پەروانە بزر دەبن ، پەروانەش لێیان دادەبڕێت و تەنها مۆمەکە (کە بوونی خۆیەتی) دەمێنێتەوەو دەیبینێت و بەرەو رووی دەچێت . مەحویش کاتێك بە بوونی ساختەو مەوجودەکانی ترەوە خەریك دەبێت ، بوونی خۆی لەبیر دەکات و لێی دادەبڕێت ، بەڵام کە لە بوونی ساختەو مەوجودەکانی تر دادەبڕێت ، هەست بەم ڕووناکییەی بوونی خۆی دەکات .

دەرککردن بەم ڕووناکییەی بوون ، خۆی لە خۆیدا کارێکی ئاسان نییە ، چونکە بابەتێك نییە کە بتوانرێت بەهۆی ئەو جۆرە قسەکردن و زمانەوە دەربببڕێت کە وەسفی بابەت و شتە دیارو مەئلووفەکانی ژیانمانی پێ دەکەین . هەروەها ئەم ڕووناکییە مەوجودێك نییە وەك ئەو مەوجودانەی کە دەردەکەون و دەتوانین بە ئاسانی دەرکیان پێ بکەین ((بەڵکو ڕووناکیی بوون ئەوەیە کە ، وا دەکات ئەزموونکردنی بوون کارێکی مومکین بێت))(1)، واتە کەسەکە لە ناوەوەی خۆیدا هەست بەو ڕووناکییە دەکات ، نەك ڕووناکییەکی دەرەکی بێت . بە کورتی ئەم ڕووناکییەی بوون شتێك یان مەوجودێك یان بابەتێك نییە کە بتوانرێت ببینرێت و باس بکرێت ، بەڵکو ئەزموونێکە لە دوای ئەوەی مرۆڤ خۆی لە بوونی ساختەو ئەو مەوجودو شتە دنیاییانە دادەبڕێت کە مەشغوولی دەکەن و لە خودی خۆی دووری دەخەنەوەو بەرەو دەرەوەی خۆی دەیبەن ، دوای دابڕانی لەمانەو کەوتنە حاڵەتی عیشقەوە هەست بەم ڕووناکییەی بوون دەکات و دەکەوێتە بەری و ئامادەیی ئەوەی تیا دەبێت بە بوونی ڕەسەنی خۆی بگات و بەدیی بهێنێت . مەحویش ئامادەیە واز لە شتە ماددیەکانی وەك موڵك و سامان و شتی دنیایی بهێنێت ، کە تەنها پەیوەستن بە جەستەیەوەو وەك مەوجودێك گەشەی پێ دەدەن بەبێ ئەوەی بوونی گەشەبکات و، خۆی بداتە بەر ڕووناکیی بوون . بە دوورکەوتنەوەی لە بوونی ساختەو مەوجودو شتە دنیاییەکان و کەوتنە حاڵەتی عیشقەوە بەرامبەر ئەو بوونە ڕەسەنەی و ئامادەیی بۆ خۆکردنە قوربانیی (یار۔ بوون) ، گەیشتۆتە ئەو حاڵەتەی کە خۆی بدات ، یاخود بڵێین خۆی داوەتە بەر ڕووناکیی بوون و لە شێوەی پرسیاردا ئەم حاڵەتە دەردەبڕێت و دەڵێت :

---

(1) هـ . س ، هـ . ل .

**بریقەی بەرقی جیلوەی کێ جەلابەخشی بینابییمە**

**کە قورصی ئافتاب و مەه وەکو تەم دێتە بەر چاوم**[1]

واتە : بریقە یاخود رووناکی بروسکەی دەرکەوتنی کێیە بووەتە هۆی رووناککردنەوەی چاوم و رووناکییەکەی بە جۆرێکە کە رۆژو مانگ لە چاو ئەودا وەك تەم وان ؟ دیارە ئەوە رووناکی (یار - بوون)ەکەیەتی چاوی رووناککردووەتەوەو وای لێکردووە هەست بە رووناکی خۆر و مانگ نەکات ، چونکە ئەوان دەرەوەی بۆ رووناك دەکەنەوەو ئەمیش ئاگای لە دەرەوە نەماوەو کەوتووەتە بەر رووناکیی بوونی خۆی و تەنها هەست بەم رووناکییە دەکات . سەرچاوەی ئەم رووناکییە بوونی رەسەنی مەحوییەو هەرچەند عیشقی ئەم بوونەی وەك پشکۆیەکی ئاگرە ؛ بەلاّم ئەو رووناکییەی لەم پشکۆیەوە پەیدا دەبێت پڕ بە عالەمە :

**کەمالات و مەعاریف مەبیە بێ دەخلّی هەوێنی عیشق**

**عەجەب پشکوتووە لەم جەذوە نارە پڕ بە عالەم نوور**[2]

مرۆڤ کە بەرەو ئەوە چوو خۆی لە بوونی ساختەو مەوجودو شتی دنیایی دابڕێت و گەیشتە حالّەتی عیشق ، دەبێتە ئەو کەسەی کە پێگەیشتووەو خاوەنی زانینە . مەحویش گەیشتووەتە ئەم حالّەتەو دنیای بۆ رۆشن بووەتەوەو لێی تێگەیشتووەو سەر سوورمانی خۆی لەوە دەردەبڕێت ، کە ئەو عیشقەی ئەم بەرامبەر بوونی خۆی هەیەتی و دەبێتە هۆی دەرکەوتنی بوون ، وەك پشکۆیەکی ئاگر وایە ، کەچی ئەو رووناکییەی لەم پشکۆوە پەیدا دەبێت پڕ بە گشت عالەمە . ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت مرۆڤ بەوەی عاشقی بوونی خۆی دەبێت ، ئەم بوونەی دەرك پێ دەکات و لە دوای ئەمە ؛ ئنجا دەتوانێت لە دنیا تێ بگات بەوەی کە لە چاو بوونی مرۆڤدا هیچ نییەو ئەوە ناهێنێت مرۆڤ لەبەرخاتری دنیاو شتی دنیایی واز لە بوونی خۆی بهێنێت . لە دێڕێکی تردا دەلّێت :

**بە سۆزی عیشقە بوونە ذی کەمالات**

**(اذ الأنوار من ذی النار تنشأ)**[3]

---

(1) د . م ، ل ٢٢٣ .

(2)د . م ، ل ١٢٨ .

(3) د . م ، ل ٤١ .

مرۆڤ کە خاوەنی سۆزی عیشق بوو ، دەبێتە کەسێکی پێگەیشتووی خاوەن کەماڵ . واتە دەبێت مرۆڤ بتوانێت خۆی لە بوونی ساختەو ئەو مەوجودانە دابڕێت کە خەریکی دەکەن و پێیانەوە پابەند دەبێت و ئەم پابەندبوونەی پێیانەوە دەبێتە هۆی ئەوەی نەتوانێت عاشق ببێت ، چونکە کە بەوانەوە خەریکبوو لە عیشقی بوونی و گەڕان بە دوایدا بێبەش دەبێت و دەبێتە کەسێکی ناکامڵ و وەك هەر کەسێکی سادەو ئاسایی دەبێت و ناتوانێت خۆی پێ بگەیەنێت ، بەڵام کە خۆی لێیان دوور خستەوە ، دەکەوێتە ناو عیشقەوەو دەست دەکات بە گەڕان بە دوای بوونی خۆیداو بەو بوونەی خۆیەوە خەریك دەبێت . بەمە دەبێتە خاوەنی کەماڵ ، واتە دەبێتە کەسێکی کامڵ و پێگەیشتوو و هەوڵی پێگەیاندن و بەدیهێنانی بوونی خۆی دەدات .

مرۆڤ کاتێك دەتوانێت لە حاڵەتی خۆ پێگەیاندندا بێت بەرەو ئەوە بچێت ببێتە کەسێکی پێگەیشتوو ، کە رووناکییەکی هەبێت و بە هۆی ئەو رووناکییەوە خۆی پێ بگەیەنێت . مەحویش مادەم لە عیشقدایە ، کەواتە خاوەنی رووناکیەو ئەو رووناکییەش لە بوونی خۆیەوە سەرچاوەی گرتووەو رووناکیی بوونی رەسەنی خۆیەتی . هەر لە بارەی ئەوەوە کە (یار - بوون) رووناکییەو مەحوی خۆی دەداتە بەر رووناکیی ئەو بوونەی : دەڵێت :

**ویصالت نارە هیجرت رۆژە رەش ، وەك ئافتابی تۆ**
**لە تۆ نەزدیکە پشکۆیە ، خەڵوزە گەر لە تۆ بێ دوور**[1]

ڕووی دەمی لە (یار - بوون)ی خۆیەتی و دەڵێت : تۆ وەك خۆر وایت . بێگومان خۆریش رووناکیی هەیە ، کەواتە ئەم بوونەی مەحویش رووناکیی هەیە . کاتێك مەحوی لە دەرەوەو مەوجود دادەبڕێت و عیشقی بوونی رەسەنی خۆی دەبێت و بەرەو ئەم بوونەی خۆی دەچێت ، هەست بە رووناکی ئەم بوونەی خۆی دەکات کە وەکو خۆر وایە . رووناکیی بوونەکەشی کە ئەم خۆی دەداتە بەر ، بەرچاوی رۆشن دەکاتەوەو دەبێتە هۆی ئەوەی چاوی زۆر بە قووڵی ببینێت و حەقیقەتی دنیاو مەوجودو شتەکانی دەوروبەری بۆ دەربکەوێت و لێیان تێ بگات . بۆیە بە تەواوی واز لە دنیا دەهێنێت و بەمە دەبێتە ئەهلی دڵ ، کە بووە ئەهلی دڵ دەتوانێت بە هۆی چاوی دڵەوە ئەو بوونە رەسەنەی خۆی ببینێت و دەرکی بکات ، بۆیە هەستدەکات کە ئەو بوونە وەکو خۆر وایە . بەڵام کە لەو بوونەی خۆی دادەبڕێت ، (ڕووناکیی بوون)ی

(١) د . م ، ل ١٢٩ .

نامێنێت ، كە ئەو ڕووناكییەش نەما ڕۆژی لێ تاریك دەبێت و ناتوانێت حەقیقەتی دنیاو مەوجودو شتە دنیاییەكان ببینێت و هەست بەوە بكات لە چاو بوونی ئەمدا زۆر بێبایەخن . بۆیە بەرەو ڕوویان دەچێت و پێوەیان خەریك دەبێت و تیایاندا ڕۆدەچێت ، ڕۆچوونیشی تیایاندا دەبێتە هۆی ئەوەی لە بوونی خۆی دابڕێت و ئاگای لێی نەمێنێت و ئەو بوونەی لێ بزر ببێت ، ئەمەش وەك ئەوەیە دنیای لا تاریك ببێت و ببێتە شەو . بەڵام هەستدەكات تاسەر لەو حاڵەتەدا نامێنێتەوەو لەو تاریكییەی شەودا ، واتە لەو ڕۆچوونەی بە دنیاو مەوجوددا جارێكی تر ئەو بوونەی دەردەكەوێتەوە ، بۆیە دەڵێت :

**بۆیە ظولّمەت پۆشە ، نووری ئەهلی جەوهەر دەركەوێ**
**سەیری حەققی كەن لەسەر ئەم ماه و ئەستێرانە شەو**(1)

كاتێك مرۆڤ بەتەواوی لە بوونی ساختەو مەوجودو شتە دنیاییەكاندا ڕۆدەچێت و پێوەیان خەریك دەبێت ، ئەوا بە تەواویش لە بوونی ڕەسەنی خۆی دادەبڕێت و لە بیری دەكات ، بەمە دنیا بە نسبەت ئەو بوونە ڕەسەنەیەوە وەك تاریكە شەوێكی لێدێت كە هیچ شتێكی تێدا دیار نییە . بەڵام ئەم تاریكییە دەبێتە هۆی دەركەوتنی ڕووناكیی بوونە ڕەسەنەكەی خۆی كە لێرەدا بە (نووری ئەهلی جەوهەر) ناوی بردووە ، كە ئەم ڕووناكییەش دەركەوت مەحوی خۆی دەداتە بەری . خۆدانە بەر ڕووناكیی بوونیش مانای چوونە بەرەو سەرچاوەی ڕووناكییەكە كە بوونە ڕەسەنەكەیە ، بەمە مەحوی عاشقی ئەو بوونەی دەبێت و جارێكی تر بەرەو هیچ مەوجودو بوونێكی ساختە ناچێتەوە ، چونكە ئەوان لەچاو ئەمدا زۆر كەم بایەخن و شایەنی ئەوە نین خۆیان پێوە خەریك بكات : بۆیە دەڵێت :

**هەر كەسێ چاوی كە بەو جیلوە مونەووەر بوویێ و**
**كەسی كەی بێتە نەظەر دیدەیی پڕ بێ لە ڕەمەد**(2)

واتە هەر كەسێك ئەو بوونەی خۆی بۆ دەركەوتبێت و چاوی پێی كەوتبێت و بەهۆی ڕووناكیی ئەو بوونەیەوە چاوی ڕووناك بووبێتەوەو بەهۆی ئەم بەرچاو ڕوونیەوە ئەوەی بۆ دەركەوتبێت ، كە لە چاو ئەو بوونەو ڕووناكییەكەیدا ، بوونە ساختەكان و

(1) د . م ، ل ٢٥٧ .
(2) د . م ، ل ١١٤ .

مەوجودەکانی دی زۆر بێ بایەخن ، کەچی هێشتا عاشقی ئەو بوونەی نەبێت و چاوی لە کەسێکی تر یاخود بوونێکی تر بێت و بەرەو رووی بچێت ، یاخوا ئەو کەسە تووشی چاوئێشەیەکی سەخت بێت و کوێر ببێت . لێرەدا کە مەحوی دوعای تووشبوون بە چاوئێشە لەو کەسانە دەکات کە بە هۆی بینینی رووناکیی بوونی خۆیانەوە چاویان رووناکبووەتەوەو کەچی بایەخ بەم بوونەیان نادەن و چاویان لە کەسی تر یاخود لە بوونی ترو شتی دنیابیە ، مانای وایە خۆی کە بەر رووناکیی بوونی کەوت و هەستی بەو بوونەی کرد ، خۆی بۆ ئەو بوونەی یەکلایی دەکاتەوەو چاوی لە هیچ کەس و هیچ بوون و هیچ شتێکی تر نابێت و وازیان لێ دێنێت . واتە لە مەوجودو بوونە ساختەکان دوور دەکەوێتەوەو بەرەو بوونی رەسەنی خۆی دەچێت و عاشقی دەبێت و بەهۆی ئەم عیشقەوە دەبێت بە کەسێکی پێ گەیشتوو و هەست بە ئارامی دەکات .

## عیشق و پەژارەی بوون

پێشتر باسی ئەوەمان کردووە مەحوی ئەگەر بە عیشق و ئاگری عیشقەوە لە دۆزەخدا بێت ، ئەمەی بەلاوە پەسەندترو خۆشترە لەوەی بەبێ عیشق و ئاگری عیشق لە بەهەشتدا بێت . بەلام لە قۆناغێکی تردا مەحوی گەیشتووەتە ئەوەی کە دۆزەخ عیشقی تێدا نییەو مرۆڤ ناتوانێت بە عیشقەوە لە دۆزەخدا بێت . جگە لەمە ، ئەم عیشقەی مەحوی خەم و پەژارەو داغ و دەردی پێوەیە ، ئەمانەش لە بەهەشتدا دەست ناکەون ، بۆیە مەحوی هەستدەکات ئەم مادەم عاشقە ، ئەو دۆزەخ و بەهەشتەی کە عەقڵە کۆمەڵایەتییەکەی دەوروبەری و ئایین باسی دەکەن جێی ئەمیان تیا نابێتەوە . لەم روانگەیەوە دەڵێت :

**دۆزەخ لە عیشقە خاڵی و جەننەت لە دەردو داغ**

**عاشق لە حەشریشا نییەتی جێ دڵێ فەراغ**[1]

لە دۆزەخدا عیشق (کە گەڕان و دۆزینەوەی بوونە) نییەو لە بەهەشتیشدا خەم و خەفەت نییەو تەنها خۆشی و شادی هەیە . عیشق و عاشقبوونیش پرۆسەیەکە پڕە لە خەم و خەفەت و داغ و پەژارە بۆ ئەو بوونەی کە عاشق بە دوایدا وێڵەو هێشتا پێی نەگەیشتووە . ئەو خەم و خەفەتەی عاشق لە رێگەی عیشقی بوونی رەسەندا دەیخوات نەک هەر ناخۆش نییە ، بەڵکو چێژو خۆشییەکی زۆری تێدایەو بە لای

(1)د . م ، ل ١٧١ .

مەحوییەوە لە خۆشیەکانی بەهەشت پەسەندتر و خۆشترە . خۆشییەکانی بەهەشت بەرجەستەن و لەو شتانەوە دەست دەکەون کە لە بەهەشتدا بۆ کەسەکە ئامادە کراون ، وەك حۆری و میوە و شەراب و... هتد ، مەحوی ئەم جۆرە خۆشییەی بەهەشتی ناوێ و ئەو خۆشیە مەعنەویی و قووڵەی دەوێت کە لە خەم و خەفەتی عیشق و گەڕان بە دوای بوونی خۆیدا دەستی دەکەوێت ، لەبەرئەمە بەهەشتی ناوێت ، کە بەهەشتیشی نەوێت دەبێت بچێتە دوزەخ . بەڵام لە دۆزەخیشدا عیشق نییە ، بۆیە دۆزەخیشی ناوێت . لە کاتێکدا ئەوە یەکلایی کراوەتەوە لە قیامەتدا دەبێت مرۆڤ یان لە بەهەشتدا بێت یان لە دۆزەخداو نابێت لە هیچیاندا نەبێت . کەچی مەحوی نایەوێت لە هیچیاندا بێت ، ئەو دەیەوێت لە گەڕاندا بێ بە دوای بوونی خۆیداو بەدیی بهێنێت . ئەگەر لە دنیادا ئەم کارەی پێ ئەنجام نەدرا ، ئەوا دەیەوێت لە قیامەتدا خەریکی ئەنجامدانی ئەم کارە بێت . تەنانەت لەم دێڕەشیعرەی سەرەوەدا مەحوی هەر لە روانگەی دنیاوە لە قیامەتی روانیووەو دەیەوێت لە قیامەتیشدا هەر لە حاڵەتی عیشق ، یاخود گەڕان و دۆزینەوەو بەدیهێنانی بوونیدا بێت و لەم رێگەیەدا لە خەم و خەفەت و پەژارە دانەبڕێت . ئەگەر لە قیامەتدا لە عیشق دابڕێت ، ئەوا هەست دەکات قیامەت و بەهەشت یان دۆزەخ جێی ئەم نین و تەصەوری خۆی لە بەهەشت یان جەهەنەمێکی لەم جۆرەدا ناکات ، چونکە وەك وتمان لە دۆزەخدا عیشق نییەو لە بەهەشتیشدا خەم و خەفەت نییە . مەحویش دەیەوێت هەم لە عیشق و هەم لە خەم و خەفەت و داغ و دەرد دانەبڕێ ، چونکە لەڕێگەی ئەم عیشقەوە بە (یار - بوون) دەگات و غەم و پەژارەو داغ و خەفەتیش نیشانەی زیندوویەتی مەحوین و ئەوە دەگەیەنن کە لە حاڵەتی عیشقدایەو لە گەڕان و دۆزینەوەی بووونی خۆیدا بەردەوامە . هەر ئەمەشە وا دەکات خەم و خەفەت و داغ و ئازار لای مەحوی هەر بە رواڵەت وەك خەم و خەفەت دەربکەون و لە حەقیقەتدا بە نسبەت ئەمەوە ، چێژ و خۆشییەکی زۆری مەعنەویی پێ دەبەخشن . ئەو خۆشیەی لە خەم و خەفەت و دەردو داغ دەستی دەکەوێت ، وایکردووە لە زۆر جێی تردا باس لەم دیاردەیە بکات و دەیەوێت بە هیچ جۆرێك لێی دانەبڕێت :

**بەشمە پێی قانیعم و بەسمە داغ و دەردی سەرمەدی**
**سەر بە دەردین ئێمە ، بێ دەردی لە ئێمە سەر مەدە**[1]

---

(1) د . م ، ل ٢٧٤ .

مەحوی داغ و دەردێکی هەمیشەیی و نەبڕاوە بە بەشی خۆی دەزانێت و پێی ڕازییەو دەیەوێت بێ دەردی و خەم و خەفەتی ( کەدەکاتە خۆشیی ڕواڵەتی) سەری لێ نەدەن و بەلایدا نەیەن ، چونکە ئەم عاشقەو لە جیهانی عیشقدایە ، جیهانی عیشقیش پڕە لە خەم و خەفەت و داغ و دەرد . چۆن مرۆڤ لە دنیادا بە دوای پارە و سامان و خۆشی و ڕابواردندا دەگەڕێت بۆ ئەوەی ژیانی خۆش بێت ، عاشقیش لە جیهانی عیشقدا بەدوای خەم و خەفەت و دەردو داغدا دەگەڕێت ، چونکە خۆراکی دڵن و دڵی عاشق بەوانە دەژی :

**دڵ بــژێــوی هــەر بــە دەردو داغــە تــەزیــیـدی دەوێ**

**قــەت مــەکەن مەنعی دوعاکو سەعیە بۆ ضەممی مەعاش**[1]

لەم دێڕەدا ئەوە دەردەکەوێت کە بەلای مەحوییەوە ، مانەوەو زیندوویەتی دڵ بە دەردو داغەوەیەو دەردو داغ بژێویی دڵە ، بۆیە داوا دەکات ئەم مایەی بژێوییەی هەر لە زیاد بووندا بێت . خەڵکی داوا لە خوا دەکەن رزق و ڕۆزی و ماڵی دنیایان پێ ببەخشێت بۆ ئەوەی بە خۆشی بژین ، بەڵام مەحویی عاشق لەبەر ئەوەی لە دنیادا نییەو لە جیهانی عیشقدایە ، خۆشی لە غەم و دەردو داغدا دەبینێت ، بۆیە لە جیاتی داوای زیادکردنی رزق و ڕۆزی و پارەو سامان ، داوای زیادکردنی خەم و خەفەت دەکات بۆ دڵی . تەنانەت خەم و خەفەت نەك هەر مایەی زیندوویەتی دڵیەتی ، بەڵکو خواردنی ڕۆحیشیەتی ، بۆیە دەڵێت :

**بێ منەت رزقێکە غەم بمرم لە برسان ئەو دەخۆم**

**تەفرە ناخۆم و طەلەب ناکەم لە دنیا قووتی رووح**[2]

خواردنی ڕۆحی غەم و خەفەتە کە لای خۆی هەیە و دەست دەکەوێت و پێویستی بەوە نییە داوای خواردنی ڕۆح لە دنیا بکات ، چونکە دنیا دەتوانێت تەنها خواردن بە لایەنی ماددیی مرۆڤ بدات کە جەستەیەتی و دەبێت لەڕێگەی بە دەستهێنانی پێویستی و بژێوییەکانی جەستەیدا ڕوو لە دنیا بکات و هەوڵی بەدەستهێنانی بدات ، بەمەش ئەو کەسە لە عیشق و چاوەڕوانی بوونی ڕەسەنی خۆی دادەبڕێت . ئەمە بووەتە هۆی ئەوەی مەحوی واز لە دنیا بهێنێت و خواردنی جەستەی نەوێت کە لە دنیاوە دەستی دەکەوێت ، دەشزانێت خواردنی ڕۆح لای دنیا دەست

---

(1) د . م ، ل ١٥١ .

(2) د . م ، ل ١٠٢ .

ناکەوێت ، بۆیە هەڵەی وا ناکات کە داوای خواردنی ڕۆح لە دنیا بکات . مەحوی عاشقەو عاشقیش داغ و دەردو خەفەت خۆراکی دڵ و ڕۆحیەتی و ، توانیویەتی ئەم خۆراکەی دڵ و ڕۆحی دەست بخات بۆیە ئەمە بە جێی شانازی دەزانێت و دەڵێت :

**بچشم کم تو (محوی) ننگر آثار درد عشق**

**نشان فخر بشمر داغهای سینهء خود را**(1)

واتە : مەحوی بەچاوی کەم سەیری ئاسەواری دەردی عیشق مەکە ، ئەو داغانەی عیشق کە بە سینەتەوەن بە نیشانەی فەخرو شانازییان بژمێرە . کەواتە بەلای مەحوییەوە دەردو غەم و خەفەتی عیشق مایەی شانازین ، بۆیە نایەوێت بە هیچ جۆرێك چارە یاخود دەوای دەردو غەم و خەفەتی خۆی بکات :

**هەموو فەخری کە داغ و دەردە عاشق**

**مەبەن ریسوایییە ناوی دەوا قەط**(2)

چارەسەرکردنی داغ و دەردی خۆی بە ریسوایی دەزانێت ، چونکە چارەسەرکردن و نەمانی دەردو داغ مانای نەمانی قووتی ڕۆحیەتی و بەمە ڕۆحی لاواز دەبێت ، لە بەرامبەر ئەمەدا جەستەی بەهێزو باڵادەست دەبێت و وای لێ دەکات رووبکاتە دنیا ، بۆ ئەوەی پێداویستییەکانی جەستەی دابین بکات . رووکردنە دنیاش دەبێتە دابڕانی لە عیشقی ئەو بوونەی خۆی و ئەمەش بە ریسوایی دەزانێت ، بۆیە نایەوێت کەس باسی دەوای دەردو خەم و خەفەتی لا بکات . ئەم دەردی عیشقە لە دەرەوەو دنیادا وەك دەرد دیارەو وا دەزانرێت مایەی خەم و خەفەت و ئازارە ، بەلام لای عاشق دەوایە:

**خودا ئەم دەردی عیشقەم لێ نەکا کەم**

**هەتا هەم بەس لەباتی هەر دەوا بەس**(3)

دەردی عیشق دەوای دەردی دنیایە . دەردی دنیا ئەوەیە ، کە دنیا مرۆڤ وا لێ بکات واز لە بوونی ڕەسەنی خۆی بهێنێت و روو بکاتە دنیاو شتی دنیایی و هەوڵی بەدەستهێنانیان بدات . بۆ ئەمەش دەبێت لەناو خەڵك و کۆمەڵگەدا بتوێتەوەو تیایاندا ڕۆبچێت ، چونکە ئەگەر لەناو دنیاو لە کۆمەڵگەدا نەبێت ، ناتوانێت شتی دنیایی وەك

---

(1) د . م ، ل ٤٧٤ .
(2) د . م ، ل ١٦٠ .
(3) د . م ، ل ١٤٥ .

پـاره و سـامان و دەسـەڵات و... هتـد. بەدەسـت بهێنێـت و بەدەسـتهێنانی ئـەم شـتە دنیاییانە بێ کۆمەڵگەو خەڵك هیچ مانایەکیان نییە ، چونکە ئەمانە بۆ ئەوە بەدەست دەهێنێـت ، لای دەرەوە بـوون بـەخۆی بدات و هەسـتی پـێ بکرێـت . کـە ئەمانـەی بەدەستهێنا ، هەر ئارام نابێت و هەوڵی بەدەستهێنانی زیاتر دەدات ، چونکە تـا زیـاتر شتی دنیایی بەدەست بهێنێت ، ئەو بوونەی کە لـە ڕێگـەی ئـەم شـتە دنیاییانـەوە لای خـەڵك و لـەناو کۆمەڵگـەدا هەیـەتی ، زیـاتر گـەورە دەبێـت . مـرۆڤ لـە جەرگـەی ئـەم هەوڵدانەدایە لە ناکاو زەمانەو دنیا ڕووی لێ وەردەگێڕن و ئەوەی بەدەستی هێنـاوە لـە دەستی دەچێت . بەمە ئەو بوونەی لەدەست دەردەچێت کە لە ڕێگەی پارەو سامان و دەسەڵات و دنیاوە لای خەڵك هەیبوو ، واتە لای خەڵك بـوونی نامێنێـت و ئەمـە دەردی دنیایە کە مرۆڤ گرفتار دەکات . بۆیە لای مەحوی ڕزگاربوون لەم دەردە ، بەوە دەبێت کە عاشق بێـت و بکەوێتـە حاڵـەتی عیشقەوەو ئـەو داغ و دەردەی لـە عیشقدا هەیـە دەوای ڕاسـتـەقینـەی ئەم دەردەی دنیان ، ئەمـە وای لـە مـەحوی کـردووە نەیـەوێت غـەم و دەردی عـیـشق چـارەسـەر بکات . جگـە لەمـە ئـەم چارەسـەر نـەکردنی داغ و دەردو غەم وخەفەتە ، لەبەرئەوەشە کە ئەوانە چێژو خۆشی پێ دەبەخشن و نایـەوێت لێیان بێبەش بێت ، ئەوەتە دەڵێت :

**نـاڵـەم لــــە سیـنـە ، هـەم لـە دڵـم دەردو غـەم حـەرام**
**بێ ، بێ تۆ بەزمی عوشرەت و عەیش ئەر نەکەم حەرام**[1]

لای ئـەهلی دنیـا وا بـاوە کـە لـە خۆشەویـستەکەیان دابـڕان ، بـەبێ ئـەو خۆشەویـستەیان ڕابـواردن و بـەزم و کـەیف و خۆشـی لـە خۆیـان حـەرام دەکـەن . مەحویش بەبێ (یار ـ بوون) نەك هەر ئەمە دەکات ، بەڵکو لەمە زیاتر دەکات و دەڵێـت ئەگەر بـەبـێ یـار ژیانم لە خۆم حەرام نەکرد ، ئەوا ناڵـەو غـەم و دەرد لـە سـینەو دڵـم حـەرام بێـت . واتـە لای مـەحوی دەردو ناڵـەو غـەم و خەفـەت بـە خۆشـی دادەنـرێن و حەرامکردنی ئەوانە بە هۆی دووری یارەوە ، وەك حـەرامکردنی هـەموو خۆشـییەکە لـە خۆی .

لێرەدا ئەو پرسیارە سـەر هەڵدەدات کـە بۆچـی مـەحوی ئـەم هـەموو غـەم و خەفەت و دەردو ناڵەیە دەخوات و سەرچاوەی ئەم غـەم و خەفەتـەی چییە ؟ وەڵامـی ئەم پرسیارەمان لەو دێڕە شیعرەوە دەست دەکەوێت کە دەڵێت :

---

(1) د . م ، ل ٢١١ .

**غـەمـی خۆشی نییە مەحوی لە دڵیا هەر غەمی تۆیە**

**لە عیشقتدا دەکەم غەم بۆت بەغەم ، بڕوانە چۆنم بۆت[1]**

لێرەدا رووی دەمی لە (یار ـ بوون)ەکـەی جۆیـەتی و پـێـی دەڵـێـت کـە غـەمی خۆی ناخوات و هـەر غـەمی ئـەو دەخـوات و عاشـقی بـووەو هەوڵـدەدات پـێـی بگـات و بەدیی بهێنێت ، لە پێناو ئەمەدا بەردەوام غەم بەخێو دەکات . ئەمەش مانای وایـە لـە هەوڵدان بۆ بەدیهێنانی بـوونی خـۆی نەوەسـتاوە ، ئـەم هەوڵـدان و گەڕانـەی بـە دوای بوونی خۆیدا بە عیشق ناو دەبات و دەڵێت لە عیشقی تۆدا غەمت بـۆ بـەخێو دەکـەم و دوایی لە پێناوی تۆدا دەیخۆم ، واتە لە بەرامبەر بوونی خۆیدا لـە حاڵـەتی عیـشقدایەو لەبەرئەوەی هێشتا پێی نەگەیشتووەو بەدیی نەهێناوە ، بەردەوام غەم و خەفـەتی بـۆ دەخوات . تەنانەت لە یەکێك لە دێڕە شیعرە فارسییەکانیدا دەڵێت :

**دوصد بار از غمت امشب بمردم ، زنده گشتم باز**

**چـنـیـن احـیـا نـمـودم مـن شـب آدینهء خود را[2]**

واتە : ئەمشەو من دوسەد جار لەتاو غەمی تۆ مردم و زیندوو بوومـەوە ، بـەم شێوەیە من ئەم شەوی جومعەیـەی خـۆمم بەسـەر بـرد . دیـارە ئـەو شـەوی جومعەیـە مەحوی تا بەیانی خەوی لێ نەکەوتووە ، هەر بیری لە (یار ـ بوون) کردووەتەوەو لە تاو ئەو غەمی خواردووە . بەڵام ئەم غەم و خەفەتـە ، لـە غـەم و خەفـەتی بەدەسـتهێنانی شتی دنیایی جیاوازەو لەبەرئەوەی مەحوی لە دنیا دابڕاوەو عاشقی (یار ـ بوون) بووەو چاوەڕوانی دەرکەوتنی (یار ـ بوون)ە ، لە حاڵەتی چاوەڕوانی یاردا ئەم هەموو غـەم و خـەفەتە دەخوات . ئەمەش لەم دێڕەدا دەردەکەوێت کە تیایدا باسی جۆری ئەو غەم و داغە دەکات کە دەیخوات و هۆی غەم خواردنەکەشی روون دەکاتەوەو دەڵێت :

**وەك داغی غەم نییە سپییە داغی ئینتیظار**

**چاوم ببینە چاوە کە موطبیقیەتی بەیاض[3]**

ئەو داغ و خەفەتەی کە مەحوی دەیخوات ، ئـەو داخ و خەفەتـە نییـە کـە بـۆ شتی دنیایی ، یان بۆ مەوجودێك دەخورێت ، بەڵکو داغ و خەفەتی چـاوەڕوانییەو لـەو چـاوەڕوانییەدا چـاوەکانی سـپی بـوون . سـپی بـوونی چـاویش مانـای کوێربـوونی

---

(1) د . م ، ل ٧٧ .

(2) د . م ، ل ٤٧٤ .

(3) د . م ، ل ١٥٧ .

دەگەیەنێت . بەڵام ئایا مەحوی ئامادەی ئەوە بووە کە بەهۆی داغ و غەم و خەفەتی چاوەڕوانییەوە چاوەکانی لە دەست بدات ؟ ئەگەر چاوی لەدەست بدات ئیتر چۆن بە دوای ئەو بوونەیدا بگەڕێت و بیدۆزێتەوە ؟ مەحوی دەڵێت :

**خودا بیدا بە رەحمەت ، داغی دڵ چاوی دڵە(مەحوی)**

**بەگریە چاو ئەگەر چوو شك دەبەم چاوێکی بیناتر[1]**

لەم دێڕەدا ئەوە دەردەکەوێت کە مەحوی ئامادەبووە بەهۆی چاوەڕوانی و داغ و غەمی چاوەڕوانییەوە چاوی لە دەست بدات ، چونکە چاو بۆ بینینی شتانێکە کە لە دەرەوەی کەسەکەدان ، ئەو بوونەش کە مەحوی عاشقی بووە لە دەرەوەی خۆیدا نییە ، تا بەهۆی چاوەوە بیبینێت و پێی بگات . هەر بۆیە داغ و خەفەتی دڵ کە دەبێتە هۆی گریان و فرمێسك رشتن و کوێر بوونی چاو ، لە هەمان کاتدا دەبێتە هۆی ئەوەی چاوی دڵی کە چاوێکی ناوەکییەو بە هۆی تەرکیزکردنە سەر چاوە دەرەکییەکەوە لە بینین کەوتووە ، بکەوێتە بینین . بینینی ئەم چاوەی دڵیش زۆر لە بینینی چاوی سەر قووڵترە ، بینینی ئەو بوونەی کە چاوەڕوانی دەکات و دەیەوێت بیدۆزێتەوە ، لە رێگەی ئەم چاوەی دڵەوە ئەنجام دەدرێت ، واتە بەهۆی ئەم چاوەوە دەرك بەو بوونەی دەکات . ئەو بوونەش لە دەرەوەدا نییەو لە ناو مەحوی خۆیدایە ، بۆیە بە چاوی سەر ، کە شتی دەرەوە دەبینێت ، نابینرێت و بە چاوی دڵ ، کە لە ناوەوەیدایەو ناوەوەی دەبینێت ، دەبینرێت . ئەم راستییەش کە (یار - بوون) لە ناوەوەی مەحویدایە لەم دێڕەدا بەدی دەکرێت کە پێشتریش باسمانکردووەو دەڵێت :

**دڵم دەرهات و تۆ هەر دەرنەهاتی**

**نەهاتی هەر نەهاتی هەر نەهاتی[2]**

ئەگەر بپرسین مەبەست لەو (تۆ)یە کێیە کەمەحوی رووی دەمی تێ دەکات و پێی دەڵێت: دڵی من دەرهات ، کەچی تۆ هەر دەرنەهاتی ؟ مەبەستی ئەو بوونەی خۆیەتی کە لەناو خۆیدایە ، بەڵام دەرنایەت . دەرنەهاتنیشی لەبەرئەوەیە مەحوی بەتەواوی خۆی لە بوونی ساختەو مەوجودەکانی تر رزگار نەکردووەو نەکەوتووەتە عیشقی ئەو بوونە رەسەنەی خۆیەوە ، تا ئەو بوونە رەسەنەی خۆی کە وەك

---

(1) د . م ، ل ١٢٧ .

(2) د . م ، ل ٢٩٧ .

مومکینێك تیایدایه ، دەربێت و بەدی بێت . داغ و دەردو غەم و خەفەتی مەحوی لەمەوە سەرچاوە دەگرن و هەستدەکات ئەم غەم و خەفەتەی کە لە پێناوی عیشقی ئەو بوونەیدایە ، مایەی سەربەرزی و شان و شکۆیە بۆی و دەڵێت :

**لە دەورمدا حەصار : ئافەت ، لەسەر سەر خەیمە : دوودی ئاه**

**لە سایەی عیشقەوە بوومە شەهی صاحیب سەرا پەردە[1]**

پاشاکان شان و شکۆو گەرەیی خۆیان بەوە پیشان دەدەن کە شوراو قەڵا بە دەوری خۆیاندا دەکەن ، کۆشك و تەلاری گەورەو بەرز دروست دەکەن و بەمانە دڵخۆش و شادمان دەبن و لەم شتانەدا هەست بە بوونی خۆیان دەکەن . بەڵام مەحوی لە بارێکدایە کە دەوروبەری هەمووی دەردو بەڵایەو کۆشك و تەلارو خەیمەی سەریشی دووکەڵی ئاه و هەناسە هەڵکێشان و خەفەتە . ئەمە لە دەرەوە ئاوا دیارە ، بەڵام لە رووی ناوەوە ، لەبەرئەوەی کەسێکە کە لە حاڵەتی عیشقدایەو خەریکی گەڕان و دۆزینەوەی بوونیەتی ، هەستدەکات ئەو گەورەییەی پاشاکان لە دەسەڵات و کۆشك و تەلاردا هەیانە ، لە بوونی خۆیدا ئەو گەرەییە هەیە ، کە پێی گەیشت و بەدیی هێنا پاشایەکە بۆخۆی . ئەمەش وای لێکردووە دەردو بەڵای دەوری و دووکەڵی هەناسەی ساردی خۆی بە قەڵاو شوراو کۆشك بزانێ و ئەو هەستەی قەڵاو شوراو کۆشك ئەیدەن بە پاشایەك و وای لێ دەکەن لە میانەی ئەو شتانەوە وەك پاشایەك هەست بە بوونی خۆی بکات ، ئەم لە میانەی غەم و خەفەت و دەردو ئازارەوە وەك پاشایەك هەست بە خۆی دەکات . ئەم پاشایەتی و گەورەییەی لە عیشقی بوونی خۆیدا هەستی پێ دەکات وای کردووە دەردو بەڵاو غەم و خەفەتی دووری (یار - بوون) وەك کۆشك و تەلارو شورا هەست پێ بکات .

## عیشق و قوربانیدان

مەحوی هەستدەکات عیشق مانا بە ژیانی دەبەخشێت و دەیکاتە کەسێکی نەمر ، ئەگەر لە عیشقدا نەبێت ئەوا ژیانێکی بێمانا دەژی و مان و نەمانی وەکو یەك وان . بۆئەوەی تووشی ژیانێکی لەم جۆرە نەبێت بە تەواوی خۆی بۆ عیشق یەکلایی دەکاتەوەو ئامادەیە سەری بکاتە قوربانی ئەم عیشقەو دەڵێت :

---

(1) د . م ، ل ٢٧١ .

**تا نەبووری تۆ لەسەر رێ ناخەیە مەیدانی عیشق**

**سەر لە پێشی پێ دەبێ لەم رێیە دانێی (اولا)[1]**

مەیدانی عیشق مەیدانێکە هەموو کەس ناتوانێت بە ئاسانی بچێتە ناویەوە . تەنها ئەو کەسە دەتوانێت رێ بخاتە مەیدانی عیشق ، کە لە پێناو عیشقدا لەسەری خۆی ببورێت و بیکاتە قوربانی ، چونکە رێگای چوون بەرەو عیشق ، رێگایەکە پێش ئەوەی بیگریتە بەر ، دەبێت ئامادەبیت لە پێناویدا سەرت بکەیتە قوربانی و بیخەیتە بەر پێی (یار - بوون) . سەرخستنە بەرپێ لە رێگەی عیشقدا مرۆڤی پێ تاقی دەکرێتەوە ، تا دەرکەوێت ئایا شایانی مەیدانی عیشقە یان نا ، چونکە ئەگەر مرۆڤ ئامادە نەبێت لە پێناو عیشقدا لە سەری ببورێت و بیخاتە بەر پێی (یار - بوون) ، جورئەت و ئازایەتی ئەوەشی تیا نابێت لە پێناو عیشقی بوونی رەسەنی خۆیداو گەیشتن بەو بوونەی دەست لە سەروەت و سامان و دەسەلات و دنیاو بوونی ساختە هەلگرێت . بەلام ئەگەر ئامادەبوو سەری بکاتە قوربانی عیشق ، ئەوا زۆر بە ئاسانی دەتوانێت واز لە بوونی ساختەو دنیاو شتی دنیایی بهێنێت و بکەوێتە عیشقەوەو عاشقی بوونی رەسەنی خۆی ببێت و هەولی بەدیهێنانی بدات . مرۆڤ بەم قوربانیدانە دەبێتە کەسێکی زاناو لە دنیاو ژیان و مردن تێدەگات :

**لەبەر دەرگاهی عیشقا یەکسەرە هەرکەس سەری دانا**

**ئەگەر پەتیارەیەک بوو ، بوو لە صەد عەللامە داناتر[2]**

هەرکەسێك ئامادەبێت لەبەر دەرگای عیشقدا سەری خۆی دانێت ، واتە سەری خۆی ببەخشێ بە عیشق و بیکاتە قوربانی ، ئەوا ئەگەر ئەو کەسە پێشتر کەسێکی نەزان بووبێت و بەهیچ جۆرێك ئاگای لە عالەمی عیشق نەبووبێت و لە دنیاو شتی دنیاییدا رۆچووبێت و تیایاندا توابێتەوەو ئاگای لە بوونی خۆی نەمابێت ، بەوەی سەری خۆی لەبەر دەرگای عیشقدا داناوە ، دەبێتە کەسێکی داناو دەرك بە عالەمی عیشق و بوونی رەسەنی خۆی دەکات و بێ بایەخی و پووچی دنیای بۆ دەردەکەوێت و جارێکی تر ئامادە نابێت بە رۆچوون لە دنیاو خەریکبوون بە شتی دنیاییەوە لە عیشقی ئەو بوونە رەسەنەی خۆی دابڕێت ، چونکە بەهۆی ئەم عیشقەوە هەم دەبێتە

---

(1) د . م ، ل ٢٩ .

(2) د . م ، ل ١٢٦ .

کەسێکی نەمرو هەم دەبێتە کەسێکی داناو زانا . بۆیە دەبێت ئامادەبێ لە پێناو عیشقدا وەك مەجنوون بەردباران بکرێت و وەك مەنصوور لە دار بدرێت :

**دەبینم ئەهلی دڵ یا سەنگەسارە یا لەسەر دارە**

**دیاری عیشق ئەگەر ساغت دەوێ هەر دارە هەر بەردە**[1]

کەسێك لە عیشقدا بێت ، وازی لە سەروەت و سامان و دەسەڵات و بوونی ساختەو دنیا هێناوە . واتە بە واز هێنانی لە دنیا ، بووە بە عاشق و بەم عیشقە خۆی لە ئەهلی دنیا جیاکردووەتەوەو بووە بە ئەهلی دڵ ، کە بووە ئەهلی دڵ ، لە کۆمەڵگەو دەوروبەر دادەبڕێت و دەچێتە وڵاتی عیشق . وڵاتی عیشقیش وڵاتێکە لە جیاتی خۆشی و رابواردن ، عاشق تیایدا هەم سەنگسار دەکرێت و هەم لە دار دەدرێت . ئەم حاڵەتەی وڵاتی عیشق لەم دێڕەدا زیاتر رۆشن دەبێتەوە کە دەڵێت :

**دڵ چووە وادی مەحەببەت هەرچی دی کوشتە ، یا**

**نیوە کوژراوە ، لەسەر لێو ئاه و ناڵەی (وا أسف)**[2]

دڵی مەحوی چووەتە دۆڵی خۆشەویستی و عاشقە راستەقینەکانی بینیوە کە یان بە تەواوی کوژراون و لە خەم رستگاون ، یان نیوە کوژراون و داخی ئەوە دەخۆن کە بە تەواوی نەکوژراون ، نەکوژرانیشیان بە تەواوی ، مانای ئەوەیە هێشتا نەبوونەتە عاشقێکی تەواو و کاریگەری دنیایان لەسەر ماوە . ئەم کوشتن و بڕینەی لە وڵاتی عیشقدا هەیە ، نابێت وا لە عاشق بکات سڵی لێ بکاتەوە ، چونکە ئەگەر عاشق سڵی لەو کوشتنەی وڵاتی عیشق کردەوە ، ئەوا لە مەیدانی عیشقدا خۆی راناگرێت ، وڵاتی عیشق چۆڵ دەکات و روودەکاتەوە دنیاو شتی دنیایی و لە بوونی رەسەنی خۆی دادەبڕێت و دەبێتە ئەهلی دنیا . ژیانی ئەهلی دنیاش بە نسبەت عاشقەوە وەك مردن وایە . بەڵام ئەگەر عاشق لەو کوشتنەی وادی مەحەببەت و دیاری عیشق نەترساو هەر ئامادەی کەوتنە حاڵەتی عیشق بوو و چووە وڵاتی عیشقەوەو بووە ئەهلی دڵ ، ئەوەی بۆ دەردەکەوێت ئەو کوشتنەی لەوێ روودەدات ، کوشتنێکی فیعلی نییەو تەنها ئەو لایەنەی دەکوژرێت کە گرنگی بە شتی ماددی دەدات و بە پارەو سامان و دەسەڵات و دنیاوە پابەند دەبێت . بە کوژرانی ئەم لایەنە لەناو کەسەکەدا ، بەیەکجاری و بۆ هەتاهەتایە لە دنیاو شتی دنیایی وەك پارەو سامان و بوونی ساختە پاك دەبێتەوەو بە

---

(1) د . م ، ل ٢٧٢ .

(2) د . م ، ل ١٧٦ .

تەواوی بۆ بوونی رەسەنی خۆی یەکلا دەبێتەوەو عاشقی ئەو بوونەی دەبێت و جگە لەو بوونەی چاوی لە هیچ شتێکی تر نابێت و بەو کوشتنە دەبێتە پاشا:

**کە کوژرا شاهی عالی جاهی عیشقە**

**هەتا صەیدت نەکەن ناگەیتە فیتراک**[1]

لە دنیادا کەسێك کە بکرێتە پاشا ، تاجی پاشایەتی لەسەر دەکرێت و دەبێتە خاوەنی پارەو سامان و دەسەڵات و وڵات و بەمانە دەبێتە پاشا ، بەڵام لە وڵاتی عیشقدا مرۆڤ بەوە دەبێتە پاشا کە بکوژرێت . ئەم کوژرانەش ، کوشتنی ئەو لایەنەیە لەناو کەسەکەدا کە حەزی لەو تاج و سەروەت و سامان و دەسەڵاتەیە کە لە دنیادا مرۆڤی پێ دەبێتە پاشا ، واتە ئەو لایەنەی کەسەکە دەکوژرێت و لەناو دەبرێت کە پەیوەستە بە دنیاوەو دەیەوێت کەسەکە بەرەو دنیاو سەروەت و سامان و دەسەڵات ببات و بیکاتە ئەهلی دنیا . ئەگەر هاتوو لە وڵاتی عیشقدا ، عیشق ئەم کوشتنەی ئەنجام نەدا ، بۆ ئەوەی مەحوی لەو لایەنەی پاك بکاتەوە کە پەیوەستە بە دنیاوە ، ئەوا دەبێت مەحوی خۆی ئەم کوشتنە ئەنجام بدات :

**بە خۆکوشتن نەجاتی خۆ بدە مەحوی وەکو فەرهاد**

**لە زۆری قەهرەمانی عیشق ، ئەفەندم هەر ئەجەل بەستە**[2]

عیشق لەبەرامبەر کەسێکدا کە ئەهلی دنیا بێت زۆر قەهرەمانەو بەهیچ جۆرێك بوار بەو کەسە نادات لێی نزیك بێتەوەو پێ بخاتە وڵاتی عیشقەوە . چاری ئەو کەسەش ئەوەیە بۆ ئەوەی بەرەو عیشق بچێت و پێ بخاتە وڵاتی عیشقەوە ، دەبێت چۆن فەرهاد لە پێناو شیریندا خۆی کوشت ، ئەمیش ئەو خۆیەی بکوژێت کە لە رێگەی دەرەوە تیایدا دروستبووەو بە دنیاو بوونی ساختەوە پەیوەستە ، بەمە بەرەو بوونی رەسەنی خۆی دەگەڕێتەوەو لەبەرامبەریدا دەکەوێتە حاڵەتی عیشقەوە . واتە بەم کوژران و خۆ کوشتنە ، کەسەکە دەبێتە ئەهلی دڵ و پاشای ئیقلیمی عیشق . ئیقلیمی عیشق جێگەیەکی بە ئاو و هەواو سازگارو خۆشە ، بۆیە مەحوی لە وەسفی ئەو ئیقلیمی عیشقەدا دەڵێت :

---

(1) د . م ، ل ١٨٦ .

(2) د . م ، ل ٢٦٧ .

**گریە دەجۆشێ لەوێ ، ئاهە دەبێ نەسرەوێ**
**نەمدی وەك ئیقلیمی عیشق جێگە بە ئاب و هەوا**(1)

هەرچەندە لە ئیقلیمی عیشقدا بەردەوام گریە دەجۆشێت و ئاە و ناڵە ناسرەوێت ، بەڵام لەوێ لە روانگەیەکی ترەوەو بە شێوەیەکی جیاواز لە شتەکان دەڕوانرێت . گریەو فرمێسك و ئاە و ناڵە ، بە نسبەت دنیاوە ناخۆشن و لە ئیقلیمی عیشقدا مایەی خۆشی و شادین ، ئیقلیمی عیشق بەوان رازاوەیەو بووەتە جێگەیەکی بە ئاو و هەواو دڵگیرو خۆش و مرۆڤ تیایدا هەست بە چێژ و خۆشییەکی رۆحی دەکات و دڵی ئاسودەیەو لە مەرگ ئەمینەو لە خەم و خەفەتی هەبوون یان نەبوونی شتی دنیایی وەك پارەو سامان و دەسەڵات و...هتد دوورەو لەوە دڵنیایە کە (یار ـ بوون) لە ئیقلیمی عیشقدا دەردەکەوێت . واتە کە بووە ئەهلی دڵ و پاشای ئیقلیمی عیشق ، بوونە رەسەنەکەی دەردەکەوێت و دڵی رۆشن دەکاتەوەو بە چاوی دڵ جوانیەکەی دەبینێت .

## عیشق و (سۆفی و زاهید)

مەحوی لە زۆر جێی دیوانەکەیداو لە زۆر دێڕە شیعردا ناوی سۆفی و زاهیدی هێناوە . بە گشتی سۆفی و زاهید لای مەحوی دوو دەستەن :

**دەستەی یەکەم :**

ئەوانەن کە بە درۆ و بە رواڵەت سۆفی و زاهیدن و لە ناوەرۆکدا وا نین . واتە ئەم جۆرە ، کەسانێکن وا خۆیان پیشان دەدەن کە عاشقی خوا بوون و لە پێناو ئەم عیشقەدا ، وازیان لە دنیاو سەروەت و سامان و خۆشی و رابواردن هێناوەو گۆشەگیری و تەنیاییان هەڵبژاردووە . بەڵام لە راستیدا کەسانێکن لە بوونی تاکەکەسی خۆیان دابڕاون و لە بوونێکی ساختەدان ، چونکە لە سۆفییەتی و زوهددا بە گشتی کۆمەڵێك دیاردەو سرووت و رێورەسم و ویرد هەن ، کە سۆفی و زاهید پێوەیان پابەندن و کەس خۆی نییەو هەموویان وەك یەکن . زاهیدو وشکە سۆفی کاتێك واز لە دنیاو خۆشی و رابواردن و سەروەت و سامان دێنن ، خۆیان وا پیشان دەدەن لە پێناو عیشقی خواو خواپەرستی و بەدەستهێنانی رەزامەندی خوادا ئەم کارە دەکەن ، کەچی لە ناوەوەیاندا هەر بەو شتانەوە پەیوەستن و حەزیان لێیانە . بۆیە مەحوی لە بارەیانەوە دەڵێت :

---

(1) د . م ، ل ٣٧ .

**له نان و ئاو ئەوا ئیمساکیه مردووش ، ئەریٚ زاهید**

**چ عوجبێکه ، ئەمەندە بۆ دەنازی تۆ بە مورتاضی**

**قسەو باست له عیرفانه ، کەچی دنیایه مەنظورت**

**له عینوانی جەواهیر جۆییایی و روو له ئەعراضی**[1]

زاهید ئەو کارەی خۆی بەلاوه گەورەیەو خۆی پێوه هەڵدەکێشێت کە لە نان و ئاو خۆی گرتووەتەوەو وازی لە خۆشی و رابواردن هێناوەو خەریکی ریازەت کێشانه . بەلام ئەم کارەی زاهید بەلای مەحوییەوە هیچ ئازایەتییەکی تێدا نییە ، چونکه مردووش نان و ئاو ناخوات . هەروەها مەحوی ئەو رەخنەیە لە زاهید دەگرێت کە باسی عیرفان (واتە خواناسی و عیشق) دەکات ، کەچی راست ناکات و دەستکەوتنی دنیا مەبەستیەتی و وا خۆی پیشان دەدات کە بە دوای جەوهەردا دەگەڕێت ، کەچی روو لە شتی رووکەش دەکات . لێرەدا مەحوی ئەوه ئاشکرا دەکات زاهید لەوەدا کە نان و ئاو ناخوات و وازی لە دنیا هێناوە ، هیچ ئازایەتییەکی نەنواندووەو راست ناکات ، چونکه وازهێنان لە دنیاو خۆشی و رابواردن و سەروەت و سامان بە رواڵەت نابێت ، بەڵکو دەبێت کەسەکە لە ناخەوە واز لەو شتانه بهێنێت و پەیوەندیی ناوەکیی پێوەیان نەمێنێت ، ئیتر ئەگەر لە دەرەوەشدا خاوەنی ئەو شتانه بێت ، ئەوا نایجولێنن و هیچ کاریگەرییەکیان لەسەری نابێت . زاهیدو سۆفی بەم جۆره نین ، بۆیە مەحوی زۆر بە توندی هێرش دەکاتە سەر ئەم جۆره سۆفی و زاهیدەو زۆر دژیانه . لە زۆر دێڕە شیعردا ئەم هێرشکردنەی بۆ سەر سۆفی و زاهید دەردەکەوێت . بۆ نموونه دەڵێت :

**بیٚ کەس منم کەسیٚ لە زوبانم بگا نیە**

**هەمدەم خودا نەناسن و دەم پڕ له یاخودا**[2]

لێرەدا مەحوی باسی هەمدەمەکانی خۆی دەکات . ئەم هەرچەند لەناو ئەو هەمدەمانەی خۆیدایە ، بەلام هەر خۆی بە بێکەس دەزانێت و کەسێك شك نابات لە زمانی ئەم بگات ، واته لەوه بگات کە ئەم باسی دەکات . ئەم زۆر لەگەڵ خۆیدا بووەو هەست بە تەنیاییەکی قووڵ دەکات و دەیەوێت کەسێك هەبێت لەوه بگات کە ئەم تەنیاییەی ئەم لە پێناوی چیدایەو لەبارەی ئەوەوە قسەی لەگەڵدا بکات . بەلام کەس

---

(1) د . م ، ل ٣٠٥ .

(2) د . م ، ل ٣ .

ئاگای لەو مەسەلەیە نییە کە مەحوی لە پێناویدا تەنیایی هەڵبژاردووەو واش خۆیان پیشان دەدەن کە ئاگایان لەو مەسەلەیە هەیە ، بەمەش لە کەسێك دەچن کە خوا نەناسێت ، کەچی بەردەوام ناوی خوای لەسەر دەم بێت و باسی بکات . بێگومان ئەم جۆرە کەسانە کە ناوی خوا ، یان شتێکی تر لەسەر دەمیانەو باسی دەکەن ، کەچی لە راستیشدا وانین . ئەم کەسانە ریاکارن و بە درۆ وا خۆیان پیشان دەدەن . لێرەدا بە پێویستی دەزانین لەسەر وشەی (هەمدەم) بوەستین و بزانین مەبەستی مەحوی لەو هەمدەمانە کێیە؟ مەحوی لە دەرەوە ناسراوە کە سۆفی بووە ، سۆفیش کەسێکە وازی لە دنیاو سەروەت و سامان و خۆشی و رابواردن هێناوە . هەمدەمەکانیشی ئەو کەسانەن کە وەکو خۆی وان ، واتە سۆفین . کەواتە ئەو هەمدەمانەی مەحوی باسیان دەکات سۆفی و زاهیدەکانن . بەڵام ئەو سۆفی و زاهیدانە هەر بەناو سۆفی و زاهیدن و ، لە راستیدا کەسانێکی خوا نەناسن و بە درۆ وازیان لە دنیاو خۆشی و رابواردن هێناوە . ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی مەحوی حەقیقەتی درۆزنانەو ریاکارانەیان دەربخات ، بۆیە دەڵێت :

**بەو طاعەتە کە بۆ ئەم و ئەویە بەهەشتی ویست**
**زاهید ئومێدەوارە بە ئەجری ریا ریاض**[(1)]

زاهید لەجیاتی گوێڕایەڵی خواو بەجێهێنانی فەرمانەکانی ، گوێڕایەڵیی ئەم و ئەو دەکات . مەبەستی مەحوی لەو (ئەم و ئەو)ە ئەو شێخ و پیری تەریقەتانەیە کە زاهید لە جیاتی خوا ، گوێڕایەڵی ئەوان دەکات و لەبەرئەوان دەست لە دنیاو خۆشی و رابواردن هەڵ دەگرێت . مەحوی گاڵتەی بە عەقڵی ئەمجۆرە زاهیدە دێت کە دەیانەوێت بە ریاو گوێڕایەڵی ئەم و ئەو بەهەشت بەدەست بهێنن و ، نازانن بەهەشت بەوە بەدەست دێت کە بە راستی عاشقی خوا بن و تەنها گوێڕایەڵی ئەو بن . ئەو پیری تەریقەتانەش کە زاهید بۆ ریا گوێڕایەڵییان دەکات ، بەلای مەحوییەوە ئەوانیش گومڕان . بۆیە دەڵێت :

**بە پێچی خوارو خێچ ئیما دەکا پیری طەریقەت : بێ**
**حەقیقەت پیرە زاهید پیرە ، گوم کردو طەریق ئەمما**[(2)]

ئەو پیری تەریقەتەی کە بە ئیشارەت بانگی خەڵك دەکات ، بۆ ئەوەی بچنە

---

(1) د . م ، ل ١٥٦ .
(2) د . م ، ل ٣١ .

لای و لەسەر دەستی ئەو تەریقەت وەرگرن . مەحوی بە پیری تەریقەتی نازانێت و تەنها بە پیری دەزانێت . واتە کەسێکی پەککەوتەو بێ توانایەو هیچی لەباردا نییەو ڕێگەی ون کردووە ، چونکە ئەگەر ڕێگەی ون نەکردبێت ، بەوە ڕازی نابێت خەڵك بۆ ڕیا لەسەر دەستی ئەو تەریقەت وەرگرن و بەدرۆ واز لە دنیاو خۆشی و ڕابواردن و سەروەت و سامان بهێنن . بەلای مەحوییەوە هەم ئەمجۆرە پیری تەریقەتەو هەم زاهیدەکانیشیان ڕیاکارن و لە عیشقی ڕاستەقینە دوورن . چونکە عیشق و مەحەببەت هەر ئەوە نییە واز لە دنیاو خۆشی و ڕابواردن بهێنیت ، بەڵکو کارێکی قورسە . بۆیە دەڵێت :

**لەبەر باری مەحەببەت ئاسمان و ئەرز ئەناڵێنن**

**چیە ئەم دەعویەت زاهید ، جلی لێ بارە گا پیرت[1]**

زاهید لای مەحوی وەك گایەکی پیر وایە کە هیچ هێزو توانایەکی نەماوەو تەنانەت جلەکانی خۆی لێ بارەو پێی هەڵناگیرێت ، کەچی لافی عیشق لێ دەدات کە کارێکی ئەوەندە قورسە ئەرزو ئاسمان لەبەری دەناڵێنن و پێیان هەڵناگیرێت . کەواتە زاهید لەم لاف لێدانەی عیشقدا ڕاست ناکات و عاشق نییە ، چونکە کەسی عاشق دەبێت لە پێناوی عیشقدا ئەوەندە ئازاری چەشتبێت ، دڵی بووبێت بە خوێن و قەدری ئەم (دڵ بوون بە خوێن)ە بزانێت . بەڵام زاهید وا نییە ، بۆیە مەحوی دەڵێت :

**قدر خون گشتن دل هیچ ندانی زاهد**

**تو کە در عمر خودت عشق نورزیدی هیچ[2]**

زاهید ئەگەر لەبەر وازهێنانی لە دنیاو خۆشی و ڕابواردن ئێش و ئازاری چەشتبێت و دڵی بووبێت بە خوێن ، بەڵام لەبەرئەوەی لە تەمەنی خۆیدا هیچ عیشقی نەکردووەو ئەو ئازارو خەفەت و دڵ بەخوێن بوونەی لە پێناوی عیشقدا نەبووە . ئەوا قەدری ئەو دڵە خوێنینەی خۆی نازانێت ، چونکە دڵ بوون بە خوێن ، دەبێت تەنها لە پێناوی عیشقدا بێت و تەنهاش عاشق قەدری ئەم دڵە دەزانێت . زاهید لەبەرئەوەی عاشق نییە ، با دڵیشی خوێنین بێت ، بەڵام قەدری ئەم دڵە خوێنینەی نازانێت و ئەمەش مانای وایە ئەو دڵەی زاهید هەرچەند خوێنینە ، بەڵام لەبەرئەوەی لە پێناوی عیشقدا خوێنین نییە ، دڵێکی بێ قەدرو بێ بەهایە .

---

(1) د . م ، ل ٦٨ .

(2) د . م ، ل ٤٩١ .

مەحوی کە دەبینێت سۆفی و زاهید و شێخ ، یاخوود پیری تەریقەت ریاکارو گومڕان و ڕێی راستیان ون کردووە ، مەستدەکات ئەم زۆر لێیـان دوورەو ئەگەر ئەوان بچنە بەهەشت ئەم ناچێت ، بۆیە دەڵێت :

**کە شێخ و واعیظ و صۆفی بە جەننەت بەن گەدو گیپاڵ**

**دەبێ ئەمثالی ئێمە بۆ جەهەننەم بەن سرو سیپاڵ[1]**

مەحوی پێی وایە ئەگەر شێخ و سۆفی و واعیز بەو هەموو ریاو ناڕاستییەوە بچنە بەهەشت ، مانای وایە بەهەشت بە ریاو درۆ بەدەست دێت و مادەم ئێمە (مەبەستی خۆیەتی)و نموونەی ئێمە لە ریاو درۆ دوورین ، کەواتە ناچینە بەهەشت و دەبێت ببرێین بۆ دۆزەخ . مەبەستی ئەوەیە زاهیدو سۆفی مادەم ریاکارن و درۆ دەکەن بەهەشت نابینن ، چونکە بەهەشت بەوە بەدەست نایەت واز لە دنیاو خۆشی و رابواردن و سەروەت و سامان بهێنیت و چڵکن و ریش پان و قژ درێژ بیت ، بۆیە دەڵێت :

**گەر ئەم ریش و سەرەی زاهید لەگەڵ بێ**

**دەبێ جەننەت بە دەشتی شنگ و پیشۆك[2]**

ئەگەر زاهید بەو ریشە پان و قژە ئاڵۆزاو و چڵکنەوە بچێتە بەهەشت ، ئەوا بەهەشت دەبێتە دەشتی شنگ و پیشۆك . واتە بەهەشت دەبێتە شوێنێکی ناخۆشی وا ، کە هیچی بەسەر هیچەوە نەبێت و هیچ چێژو خۆشی و جوانییەکی تێدا نامێنێت . بێگومان بەهەشت شوێنێکە پڕە لە خۆشی و جوانی و جێگەی زاهیدی قژ ئاڵۆزاو و ریش پان و چڵکنی تێدا نابێتەوەو بەهەشت بە چاوی خۆی نابینێت ، بۆیە مەحوی داوا لە زاهید دەکات تۆبە بکات و دەڵێت :

**نزیکە مردنت ئەی پیرە زاهید**

**وەرە با تۆبە کەین ئیتر ریا بەس[3]**

زاهید دوای ئەوەی تەمەنێکی زۆر دەستی لە دنیاو خۆشی و رابواردن هەڵگرتووەو گۆشەگیریی هەڵبژاردووە ، پیربووەو لە مردن نزیك بووەتەوە . مەحوی دەزانێت ئەم گۆشەگیری و دوورکەوتنەوەیەی زاهید لە دنیاو خۆشی و رابواردن ،

---

(1) د . م ، ل ٢٠١ .
(2) د . م ، ل ١٩١ .
(3) د . م ، ل ١٤٥ .

ریایەو راست نییە ، بۆیە داوای لێدەکات پێش ئەوەی بمرێت تۆبە بکات و دەست لە ریا هەڵبگرێت . ئەمەش بەوە دەبێت رووبکاتە بارەگای عیشق :

**زاهید وەرە روویێ بکەرە بارەگاهی عیشق**

**عالی جەنابە ، وا نیە هەر رێ بدا بە کەس**[1]

مەحوی داوا لە زاهید دەکات بێت و بەڕاستی رووبکاتە بارەگای عیشق . هەرچەندە زاهید بە هۆی ریاوە لە ریزی ناکەساندایە ، بەڵام بارەگای عیشق بەرزو فراوانەو جێی هەموو کەسێکی تێدا دەبێتەوە ، تەنانەت ئەگەر ناکەسیش تەوبە بکات و بیەوێت بەڕاستی روو بکاتە عیشق ، ئەوا عیشق لە بارەگای خۆی وەری دەگرێت.

**دەستەی دووەم :**

ئەوانەن کە مەحوی لە قۆناغێکی تەمەنیدا پێی وایە بە راستی سۆفی و زاهیدن و لەبەر عیشقی خواو گەیشتن پێی ، وازیان لە دنیاو پارەو سامان و خۆشی و رابواردن هێناوە . مەحوی لەو قۆناغەی تەمەنیدا ، ئەم دەستەیانی بەلاوە پەسەندبووەو هەستی کردووە عیشقی راستەقینە لای ئەوانە و پاشای عیشقن . مەنصوور یەکێکە لەوانەو مەحوی لەبارەیەوە دەڵێت :

**مرد میدان محبت ، دید چون منصور را**

**عیشق ، با تعظیم گفتش شاه من بالا بیا(۲)**

واتە : پیاوی مەیدانی مەحەببەت ، کە عیشقی مەنصووری بینی ، بە کڕنووشەوە پێی وت (واتە بە مەنصووری وت) : ئەی پاشای من وەرە سەرەوە (واتە وەرە سەر تەختی پاشایەتی) . لێرەدا دەتوانین بڵێین ئەو پیاوەی مەیدانی مەحەببەت مەحوی خۆیەتی کە بەو عیشقەی مەنصوور بەرامبەر بەخوا هەیبووە سەرسامبووەو وەك پاشای عاشقان سەیری کردووەو دەیەوێت ببێتە پەیڕەوی ئەو ، بۆیە دەڵێت :

**لە ئولکەی عیشقەدا بۆ هەر کەسێ سەرداریيە مەنظوور**

**عولووی مەرتەبەی سەردارە ، بۆتە پەیڕەوی مەنصوور**[3]

هەر کەسێك دەیەوێت لە وڵاتی عیشقدا ببێتە سەردار ، بە چوونە سەر سێدارە ئەم مەرتەبەیەی دەست دەکەوێت و کە ئەمەی کرد دەبێتە پەیڕەوی

---

(1) د . م ، ل ١٤٨ .
(2) د . م ، ل ٤٧٩ .
(3) د . م ، ل ١٢٨ .

مەنصوور ، چونکە مەنصوور لە پێناو عیشقەکەیدا لە دار درا . واتە لێرەدا مەحوی پێی وایە مرۆڤ دەبێت پەیڕەوی مەنصوور بکات و ئەو بکاتە سەردەستەی خۆی . ئەگەر لە داریش درا ، ئەو لە دار درانەی وەك چوونە سەر تەختی پاشایەتییە .

بەڵام مەحوی لە قۆناغێکی تردا ، هەستدەکات ئەم دەستەیەی دووەمیش کە مەنصوور سەر دەستەیانەو سەردەمێکیش خۆی لە ناو ئەو دەستەیەدا بینیوەتەوە ، لە هەڵەدان و لە حەق لایانداوە . بۆیە لەبارەی مەنصوورەوە دەڵێت :

**با حەقیشی بێ لە بۆ (مەنصوور) (انا الحق) حەق نیە**

**شێتیە مەجنوون ئەگەر بێ نازی لەیلایی بکا**[1]

مەحوی پێی وایە وەك چۆن ئەو کارەی مەجنوون هەڵە بوو کە لە پێناوی لەیلادا وازی لە دنیاو خۆشی و رابواردن و تەنانەت خودی خۆی هێناو تەنها هەستی بە لەیلا دەکردو لەودا توابوویەوە ، بە هەمانشێوە ئەو کارەی مەنصووریش هەڵەیە کە لە پێناو خوادا وازی لە دنیاو سەروەت و سامان و خۆشی و رابواردن و خودی خۆی هێناو تەنها هەستی بە بوونی خوا دەکردو خۆی لێ بووبووە خواو دەیگووت (انا الحق) واتە من خوام . مەحوی پێی وایە حەق نەبوو مەنصوور ئەم کارە بکات ، چونکە بوونی مرۆڤ و بوونی خوا بە تەواوی لەیەك جیان و هەرگیز یەکیان نابێت بەوی تریان . ئەو حاڵەتەش کە مەنصوور وای زانیوە بوونی خوا لە ناویدایەو وەك خوای لێهاتووە ، حاڵەتێکی حەقیقی و راست نەبووەو لە وەهمدا بووە . واتە بە وەهم هەستی کردووە خوا لەناویدایەو هەر بەهۆی ئەو وەهمەوە وای هەستکردووە لە سەرو هەموو مرۆڤێکەوەیە . ئەمەش بەرەو بۆچوونی (نیچە)مان دەبات سەبارەت بە زاهید . نیچە پێی وایە ((زوهد ... باشترین ئامرازی دەسەڵات پەیداکردنی زاهیدەو ، مۆڵەتێکی باڵایە کە سەرپشکی گەیشتنە دەسەڵاتی دەکات))[2] . هەروەها زیاتر لە سەر ئەم مەسەلەیە دەڕوات و باسی چۆنیەتی دەسەڵات پەیداکردنی زاهید دەکات و دەڵێت : ((دەبێت پێشتر بە نسبەت ئێمەوە کاهینی زاهید رزگارکەرێکی ئامادەبێت ، شوانی گەلەخەڵکی نەخۆش (مەبەستی نەخۆشی جەستەیی نییە ، بەڵکو مەبەستی نەخۆشی دەروون و ژیرییە ، لێکۆڵەر) و پارێزگاریکەریانە . بەمجۆرە دەتوانین لە کارە مێژووییە

---

(1) د . م ، ل ١٩ .

(2) أصل الأخلاق وفصلها ، فردريك نيتشة، ت : حسن قبيسي ، المؤسسة الجامعية للدراسات والنشر والتوزيع ، بيروت - لبنان ، ط ٢ ، س ١٩٨٣، ص ٩٥.

لە رادەبەدەرەکەی (زاهید) تێبگەین . غەریزەی ئەو بۆ ئەوە ئامادەی کردووە کە دەسەڵات بەسەر چەوساوەکان (المتألمین)دا پەیدا بکات . بۆ بینینی ئەم ڕۆڵەش هونەری تایبەتی خۆی هەیە ... دەبێت زاهید پەیوەندییەکی گەرم و گوڕی بە کەسە بێبەش (محروم)و نەخۆشەکانەوە هەبێت ، بۆئەوەی بتوانێت گوێبیستیان بێت و لێیان تێبگات . هەروەها دەبێت زۆر بەهێز بێت و زیاتر لەو دەسەڵاتەی بەسەر ئەوانی تردا هەیەتی دەسەڵاتی بەسەر خۆیدا هەبێت . ئیرادەیەکی پتەو و پۆڵایینی هەبێت ، بۆئەوەی بتوانێت متمانەی نەخۆشەکان بەدەست بێنێت و ببێتە مایەی ترسیان ، هەروەها ببێتە یارمەتیدەرو پاڵپشت و مامۆستاو دەسەڵاتدارو خوایان ...»[1] . واتە نیچە پێی وایە کەسێك کە دەبێتە زاهید لەبەرئەوەیە ئەو کەسە هیچ دەسەڵات و توانایەکی بەسەر دنیاو شتە دنیاییەکان و خەڵکدا نییە . ئەم بێ دەسەڵاتی و بێ توانایییە وای لێ دەکەن رووبکاتە گۆشەگیری و واز لە دنیاو سەروەت و سامان و خۆشی و رابواردن بهێنێت ، بەڵام لە ناوەوەو لە ناخیدا حەزی لەو شتانەیە . واتە واز هێنانی زاهید لە دنیاو شتی دنیایی ، لەوەوە نییە کە لە ناوەوەیدا قەناعەتی بەو شتانە نییەو بە شتانێکی راگوزەرو کاتییان دەزانێت ، بەڵکو لەوەوەیە نەیتوانیوە لە واقیعدا ئەو شتانە بەدەست بهێنێت . بەڵام بەڕواڵەت وا خۆی پیشان دەدات کە ئەو شتانە بەلایەوە گرنگ نین و جێی بایەخ نین بۆیە وازی لێ هێناون . زاهیدەکان بۆیەش لە خەڵك دادەبڕێن و گۆشەگیری هەڵدەبژێرن و واز لە سەروەت و سامان و خۆشی و رابواردن دێنن ، تا لەم ڕێیەوە دەسەڵاتێکی مەعنەوی لای خەڵك بۆخۆیان پەیدا بکەن و وا دەربکەون کە ویست و ئیرادەیەکی بەهێزو گەورەیان هەیەو بەمە لای خەڵك بەرزو گەورە دەربکەون ، چونکە خەڵك ناتوانن وەك ئەمان دەست لە دنیاو پارەو سەروەت و سامان و هەموو شتێك هەڵبگرن . بۆیە خەڵك وا خۆیان دەبینن و وا هەست دەکەن کە لەچاو ئەو زاهیدانەدا زۆر بێ ئیرادەو لاوازن و خۆیان بەکەم دەزانن و زاهیدەکان بەگەورە دەزانن و هەستدەکەن ئەوان ویست و هێزو توانایەکی لەڕادەبەدەریان هەیە ، بۆیە توانیویانە واز لە دنیاو سەروەت و سامان و خۆشی و رابواردن بهێنن . زاهیدو سۆفییەکانیش بۆ دروستکردنی ئەم وێنەیە لە زەینی خەڵکدا دەبنە زاهیدو سۆفی و دەیانەوێت لە ڕێگەی ئەو وێنەیەی خۆیانەوە لای خەڵك ، دەسەڵات بەسەر خەڵکدا پەیدا بکەن و تەنانەت لەچاو خەڵکدا خۆیان لێ دەبێت بە

(1) هـ . س ، ل ١٢٣ .

خوا . هەرئەمە وای لە مەنصوور کردبوو کە بەناو خەڵکدا بڕوات و بەدەنگی بەرز بڵێت (أنا الحق) . هەر لەم روانگەوەیە ، مەحوی پێی وایە ئەوەی دەبێت مرۆڤ عاشقی ببێت ، لە دەرەوەی خۆیدا نییە ، بەڵکو لەناو خۆیدایەو بوونی رەسەنی خۆیەتی و پێویستە مرۆڤ عاشقی ئەو بوونەی خۆی ببێت و لەبەر گەیشتن بەم بوونەو بەدیهێنانی ، واز لە دنیاو سەروەت و سامان و خۆشی و رابواردن بهێنێت ، نەك لەبەر شتێکی تری جگە لەم بوونەو تەنانەت نەك لەبەر خواش ، چونکە کە مرۆڤ عاشقی خوا دەبێت و دوایی هەستدەکات بەو مەعشووقەی (کە خوایە) گەیشتووە ، خۆی لێ دەبێت بە خوا ، لە راستیشدا وەك پێشتر وتمان ئەمە لە وەهمێك بەولاوە هیچی تر نییە . جگە لەمە ، خوا پێویستی بەم عاشقبوونەی مرۆڤ نییە ، چونکە مرۆڤ عاشقی خوا ببێت یان عاشقی نەبێت ، هیچ لە مەسەلەی خوایەتی خوا ناگۆرێت . واتە نەبەو عاشقبوونەی مرۆڤ بۆی ، خوایەو ، نەبە عاشق نەبوونی مرۆڤ بۆی ، لە خوایەتی دەکەوێت . بەڵام بوونی مرۆڤ پێویستی بەم عاشقبوونەیە ، چونکە کە مرۆڤ عاشقی بوونی رەسەنی خۆی دەبێت ، ئەوا واز لە هەموو شتێك دەهێنێت و بەرەو ئەو بوونەی خۆی دەچێت و بەدیی دەهێنێت . بەڵام ئەگەر عاشقی ئەو بوونەی خۆی نەبێت و عاشقی شتێکی تر بێت و بەو شتەی ترەوە خەریکبێت ، ئەوا ئەو بوونەی خۆی لەبیر دەکات و وازی لێ دێنێت . بەمەش ئەو بوونەی دەکشێتەوەو بزر دەبێت و بەدی نایەت .

# عــــەدەم چییە ؟

دارشتنی پرسیارێك سەبارەت بە (عەدەم) ، دەمانخاتە حاڵەتێکەوە کە تیایدا دەرك بەوە بکەین ، لەوانەیە وەڵامدانەوەی لە تواناادا بێت ، یان بە پێچەوانەوە ، وەڵامدانەوەی ئەستەم بێت، چونکە (عەدەم) شتێك یان بابەتێکی دیارو ئاشکرا نییەو مرۆڤ ناتوانێت لەوە دڵنیا بێت ، ئایا دەتوانرێت ئەوە دیاری بکرێت کە (عەدەم) چییە . بەڵام ، لەگەڵ ئەمەشدا با بپرسین (عەدەم) چییە[1]؟ لەم پرسیارەدا شتێکی نائاسایی دەردەکەوێت ، چونکە (عەدەم) وەکو شتێك تەرح دەکرێت کە بەم جۆر یان بەو جۆرەیەو مەوجودێکە ، لە کاتێکدا (عەدەم) لە ریشەوە لەگەڵ ئەمەدا یەك ناگرێتەوەو جیاوازە لێی ، چونکە ((پرسیار کردن لەوەی (عەدەم) چییەو چۆنە ، پرسیار لە بارە کراوەکە (کە عەدەمە) دەکات بە دژەکەی (کە مەوجودە)و خودی پرسیارەکە ، لە بابەتە تایبەتیەکەی دادەڕنێت . بەم پێیە ، لە بناغەدا وەڵامدانەوەی ئەم جۆرە پرسیارە ئەستەمە ، چونکە وەڵامەکە بەم شێوەیە دەبێت : (عەدەم) بریتییە لەوەو لەوە))[2]. واتە وەکو شتێکی دیارو بەرجەستە مامەڵە لەگەڵ (عەدەم)دا دەکرێت . لەم حاڵەتەدا ، ئەو پرسیارو وەڵامەی کە لەبارەی (عەدەم)ەوەن دژیەکییان تێدا دەبێت و لەگەڵ یەك ناگونجێن و ئەستەمە پێکەوە بێن ، هەر بۆیە لۆجیك رێگەی پرسیاری لەم جۆرە نادات ، چونکە ((بیرکردنەوە ، کە لە بناغەدا هەمیشە بیرکردنەوەیە لە شتێکی دیاریکراو ، بیرکردنەوە دەبێت لە (عەدەم)و بە پێچەوانەی ماهییەتی تایبەتی خۆیەوە کار دەکات . بەپێی لۆجیك ، مادەم ناتوانین (عەدەم) بکەینە بابەتێك ، کەواتە نابێ ئەم پرسیارەش بکەین))[3]. بە دەربڕینێکی تر : ماهییەتی بیرکردنەوە ، کە بریتییە لەوەی پێویستە شتێکی دیاریکراو یاخود بابەتێك هەبێت ، کە ببێتە مایەی تێڕامان و وامان لێبکات بە مەبەستی دەرککردنی بیری لێ بکەینەوە ، لێرەدا رووبەڕووی (عەدەم) دەبێتەوە کە بابەتێکی دیاریکراو نییە، تا بتوانین دەرکی بکەین و بیری لێ بکەینەوە ، ((بۆیە پێویستە وەك هۆکارێك پەنا بەرینە بەر تێگەیشتن و پرۆسەی بیرکردنەوەش بکەینە رێگایەك بۆ دەرککردن و ئاشکراکردنی (عەدەم) . بە هۆی تێگەیشتنەوە دەتوانین بگەینە دیاریکردنێکی گشتی

---

(1) بروانە : کتابات اساسیة ـ الجزء الثانی ـ ( ما المیتافیزیکا) ، مارتن هیدجر ، ت : اسماعیل المصدق ، المجلس الأعلی للثقافة ـ القاهرة ، ط ١ ، س ٢٠٠٣ ، ص ٢٠ .

(2) م . س ، هـ . ل .

(3) هـ . س ، هـ . ل .

(عەدەم)و وەك كێشەیەك بیخەینە روو))[1]. واتە ئێمە ناتوانین وەك مەوجودێك بیر لە (عەدەم) بکەینەوەو لێی تێ بگەین و بزانین چییە ، بۆیە دەبێت لە رێی مەوجودەوە بەرەو (عەدەم) بچین و هەوڵی دەرككردنی بدەین . جا ((لەبەرئەوەی (عەدەم) رەتکردنەوە ، یاخود نەفیکردنی هەمەکییەتی مەوجودە ، بریتییە لە نا مەوجودێکی پەتی))[2]. لێرەدا (عەدەم) وا دەردەکەوێت کە پێچەوانەی مەوجودەو بە هیچ جۆرێك لەگەڵیدا یەك ناگرێتەوەو کە (عەدەم) هەبوو ، مەوجود نامێنێت . لەم بارەدا ((عەدەم) ملکەچی دیاریکردنێکی ورد دەکەین ، کە هەڵگری (نا)یەو وەك دەردەکەوێت ئەم (نا)یە بۆ نەفیکردنەو بە پێی رێنمایی لۆجیك ، ئەم نەفیکردنە پرۆسەیەکە تێگەیشتن ئەنجامی دەدات))[3]. واتە ئەم (نا)یە ، کە بەهۆیەوە مەوجود نەفیدەکرێت ، بۆ ئەوەی پەی بە (عەدەم) ببرێت ، تێگەیشتن ئەنجامی دەدات و بەرهەمی تێگەیشتنە . ئەمەش کاتێك دەبێت ، کە تێگەیشتن لە لایەن خودەوە ئەنجام دەدرێت . خودیش بۆ ئەنجامدانی تێگەیشتن پێویستی بە بابەتێکە ببێتە مایەی سەرنج و تێرامانی ، واتە بوونی بابەتێك لە دەرەوەی خودداو هەوڵدان بۆ دەرككردنی، وا دەکات کردەی تێگەیشتن لەو بابەتە لە لایەن خودەوە ئەنجام بدرێت . لێرەدا ئەوەی لە بەرامبەر خوددایەو هەوڵی تێگەیشتنی دەدات (عەدەم)ە ، کە بە هۆی نەفیکردنەوە دیاریکراوە . ((بەڵام ئایا نەفیکردن ئەو دیاریکردنە باڵایە کە (عەدەم) وەك جۆرێکی تایبەتی نەفیکراو بگرێتەوە؟ ئایا (عەدەم) لەسەر نەفیکردن ، واتە لەسەر (نا) وەستاوە ؟ یان بەپێچەوانەوە نەفیکردن و (نا) لەسەر (عەدەم) وەستاون؟))[4]. واتە ئایا نەفیکردن و (عەدەم) کامیان پێش ئەوی تریانەو دەبێتە هۆی پەیدابوون و هاتنە ئارای ئەوی دیکەیان؟ بەلای هایدگەرەوە ((عەدەم) زۆر لە (نا)و لە نەفیکردن رەسەنترە. بەم جۆرە توانای نەفیکردن بەو پێیەی بەرهەمی تێگەیشتنەو ، خودی توانای تێگەیشتن ، بە جۆرێك لە جۆرەکان لەسەر (عەدەم) رادەوەستن))[5]. واتە هەریەك لە توانای تێگەیشتن و نەفیکردن (کە بەرهەمی تێگەیشتنە) پەیوەستن بە (عەدەم)ەوەو نەفیکردن لە (عەدەم)ەوە سەرچاوە دەگرێت ، نەك بە پێچەوانەوە .

(1) هـ . س ، هـ . ل .
(2) هـ . س ، ل ٢١.
(3) هـ . س ، هـ . ل .
(4) هـ . س ، هـ . ل .
(5) هـ . س ، هـ . ل .

واتە (عەدەم) وا دەکات نەفیکردن و (نا) هەبن ، چونکە ئەگەر پێشتر بیرۆکەی (عەدەم) لای مرۆڤ نەبێت ، ناتوانێت بە هۆی (نا)وە مەوجودێك نەفی بکاتەوەو بیخاتە حاڵەتی نەبوونەوە . بەم پێیە (عەدەم) لە ئەنجامی نەفیکردنەوە پەیدا نابێ و پێش نەفیکردنە.

(عەدەم) ناوەڕۆکی پرسیارەکەمانە ، بۆیە پێویستە پێشتر پێدراوێك بێت و بتوانین پێی بگەین و چاومان پێی بکەوێت ، بەلاّم لێرەدا کۆمەڵێك پرسیار سەر هەڵدەدەن ، کە بریتین لەوەی «لە کوێ بۆ (عەدەم) بگەڕێین ؟ چۆن دەیدۆزینەوە ؟ ئایا بۆ ئەوەی شتێك بدۆزینەوە ، پێویست نییە پێشتر ئەوە بزانین کە ئەو شتە هەیە ؟ ئایا لێرەدا بەبێ پێشبینی و وێناکردنێکی پێشوەختی (عەدەم) ، دەتوانین گەڕان ئەنجام بدەین و ئەوە بدۆزینەوە کە بە دوایدا دەگەڕێین؟ لە راستیدا ئەگەر مرۆڤ پێشتر چۆنیەتیی ئەو شتە نەزانێت کە بە دوایدا دەگەڕێت ، ناتوانێت بە دوایدا بگەڕێت و بیدۆزێتەوە»[1] . لێرەدا ئێمە بەدوای (عەدەم) دا دەگەڕێین ، دەمانەوێت بیدۆزینەوەو دەرکی پێ بکەین ، گەڕان و دۆزینەوەش لە حاڵەتێکدا ئەنجام دەدرێت ، ئەوەی بە دوایدا دەگەڕێین شتێکی دیاریکراو و بەرجەستە بێت و بتوانرێ ببینرێت . کەچی (عەدەم) ، نە شتێکی دیاریکراوە و نە دەبینرێت . لەگەڵ ئەمەشدا «هەرچۆنێك بێت ، دەزانین (عەدەم) چییەو ، وەکو هەموو ئەو شتانە وایە کە لێرەو لەوێدان و لە قسەکردنی ئاسایی رۆژانەماندا وەك شتێکی بەدیهی لێیان دەدوێین ، بێ ئەوەی بە قوڵی سەرنجمان راکێشن»[2] . ئەمە بۆچوونێکی گشتیی باوە لە بارەی (عەدەم)ەوە . ئەگەر لە هەرکەسێك بپرسیت (عەدەم) چییە ؟ وەك هەموو شتێکی ئاسایی ژیانی خۆی رایەکی دیاریکراوی لە بارەیەوە هەیە . بەلاّم ئەم رایەی لە بارەی (عەدەم)ەوە لە ئەنجامی ئەوەوە لای دروست نەبووە ، کە (عەدەم) سەرنجی راکێشاوەو بووەتە مایەی تێڕامانی و لەمەوە ئەو بۆچوونەی لەبارەی (عەدەم)ەوە بۆ دروستبووە . بەڵکو وەك هەر بۆچوونێکی ئاسایی کە لە بارەی بابەتێکەوە هەیەتی ، بۆچوونێکیشی لە بارەی (عەدەم)ەوە هەیەو دەری دەبڕێت . لەم روانگەیەوە دەتوانرێت بەمجۆرە شێوە پێناسەیەکی (عەدەم) بکرێت : «(عەدەم) بریتییە لە نەفیکردنێکی تەواوی هەمەکیەتی مەوجود ... لێرەدا دەبێت لەپێشدا

---

(1) هـ . س ، ل ٢١ — ٢٢ .

(2) هـ . س ، ل ٢٢ .

هەمەکیەتی مەوجود پێدراوێك بێت ، تا بتوانرێت رووبەڕووی نەفیکردن بکرێتەوە ، بۆ ئەوەی لەم نەفیکردنەدا خودی خۆی دەربخات»[1] . واتە بە پێی ئەم پێناسە گشتییەی (عەدەم) ، مرۆڤ هەموو شتەکانی دەرەوەی خۆی بە مرۆڤەکانی ترو گیاندارو دارو بەردو زەوی و ئاسمان و تەنانەت هەموو گەردوونیش ، نەفی دەکات و بەمە دەگاتە (عەدەم) . بێگومان ئەستەمە بتوانرێت ئەم نەفیکردنەی هەمەکییەتی مەوجود ئەنجام بدرێت ، چونکە «ئێمەی مرۆڤ بەو پێیەی کائینێکی کۆتادارین ، چۆن دەتوانین بە هەمەکییەتی مەوجود بگەین و پاشان نەفیی بکەین؟ ... گومان لەوەدا نییە کە ئێمە هەرگیز ناتوانین بە شێوەیەکی رەها دەرك بە هەمەکییەتی مەوجود بکەین لە خۆیدا ، هەروەها لەوەش دڵنیاین بە جۆرێك لە جۆرەکان لە ناو جەرگەی (هەمەکییەتی مەوجود)داین . لێرەدا جیاوازییەکی ریشەیی هەیە لە نێوان ئەوەی دەرك بە (هەمەکییەتی مەوجود) بکەین لە خۆیدا ، لەگەڵ ئەوەی دەرك بە خۆمان بکەین لە ناو (هەمەکییەتی مەوجود)دا . حاڵەتی یەکەم بە شێوەیەکی سەرەتایی ئەستەمە ، بەڵام حاڵەتی دووەم رووداوێکی بەردەوامی رۆژانەی (دازاین)مانە»[2] . واتە ئێمەی مرۆڤ لەچاو زەمین و ئاسمان و گەردووندا پنتێکی زۆر بچوك و سنووردارین ، بۆیە بەم بچوکی و سنووردارییەی خۆمانەوە کە لە بەشێکی ئەم گەردوونەداین و بەو بەشەوە خەریکبووین و تیایدا رۆچووین ، هەرگیز ناتوانین پەی بە هەمەکییەتی مەوجود ، واتە پەی بە دنیاو گەردوون ببەین ، چ جای ئەوەی بێین نەفیی بکەین ، بۆ ئەوەی بە (عەدەم) بگەین . واتە لە واقیعداو لە رووی پراکتیکییەوە نەفیکردنی (هەمەکییەتی مەوجود) کارێکی ئەستەمەو مرۆڤ ناتوانێت ئەنجامی بدات . بۆیە «لە باشترین باردا ، بۆ دەرککردن بە (عەدەم) ، دەتوانین وەك بیرۆکە (فکرە)یەك وێنای (هەمەکییەتی مەوجود) بکەین ، پاشان هەر لە بیرکردنەوەماندا ، ئەوەی وێنامان کردووە ، نەفیی بکەین و دایبنێین بە نەفیکراوێك»[3] . واتە نەفیکردنەکە لە رێگای پرۆسەیەکی زەینییەوە ئەنجام دەدەین و ئەوەی لەم گەردوونەدا هەیە بەزەوی و ئاسمان و مرۆڤ و گیاندارو شتەکانی ترەوە ، لە هۆش و مێشکی خۆماندا هەموویان وەك بیرۆکەیەك ، یاخود وەك شتێك وێنا دەکەین . پاشان هەر لە هۆش و مێشکی خۆماندا ، ئەو بیرۆکەیە یاخود ئەو شتە وێناکراوە نەفی دەکەین و وای دادەنێین کە نەما «بەم جۆرە

(1) هـ . س ، هـ . ل .
(2) هـ . س ، ل ٢٢- ٢٣ .
(3) هـ . س ، هـ . ل .

دەگەینە چەمکێکی شکڵیی (عەدەم)ە وێناکراوەکە ، نەك خودی (عەدەم) ، چونکە هەرگیز ناگەینە خودی (عەدەم)))[1] . ئێمە لە دەرەوەی خۆماندا بۆ (عەدەم) دەگەڕێین و دەمانەوێت لە دەرەوە دەرکی پێ بکەین و بزانین چییە . بەلاّم ئەوەی لێرەدا پێی دەگەین (عەدەم)ێکە لەناو خۆماندایە ، یاخود لە هۆش و مێشکی خۆماندا پێی دەگەین و دەرکی پێ دەکەین ، نەك لە دەرەوەی خۆماندا . بەلاّم چ لە ناوەوەی خۆماندا بێت یان لە دەرەوەماندا ((عەدەم) هەر (عەدەم)ەو ئەگەر ئەوە راست بێت کە (عەدەم) نەبوونی جیاوازییە ، ئەوا ناتوانرێت جیاوازی لە نێوان (عەدەم)ی وێنا کراو و خودی (عەدەم)دا بکرێت و هەردووکیان یەکن))[2] . واتە چ ئەو (عەدەم)ەی لە دەرەوەماندایەو چ ئەو (عەدەم)ەی لە هۆشی خۆماندا پێی دەگەین ، هەر یەکن و جیاوازییان نییە ، چونکە (عەدەم) لە خودی خۆیدا بریتییە لە نەبوونی هیچ سیفەت و جیاوازییەك .

وەك پێشتر وترا ، ئێمە کائینێکی کۆتادارین و ((لە ژیانی رۆژانەماندا هەموو جارێك هۆگری ئەم مەوجود یان ئەو مەوجود دەبین و ، خۆمان تەرخان دەکەین بۆ لایەنێك لە لایەنەکانی مەوجود . ژیانی رۆژانە لەم بارەدا ، رواڵەتێکی پەرتبوو وەردەگرێت))[3] . واتە لەو حاڵەتەدا کە مرۆڤ بە شتێکی دیاریکراوەوە خەریك دەبێت و تیایدا رۆدەچێت ، بۆ نمونە بە پارەو سامانەوە یان بە دەسەلاّتەوە خەریك دەبێت ، ژیانی رۆژانەی وا دەردەکەوێت کە پەرتبووەو لەم بارەدا مرۆڤ هەست بە (هەمەکییەتی مەوجود) ناکات و وەك ئەوە وایە (هەمەکییەتی مەوجود) تەنها بریتی بێت لەو لایەنەی یان لەو بەشەی کە ئەو مرۆڤە پێوەی خەریکە . بەلاّم ((ئەگەر بە شێوەیەکی نادیاریش بێت ، یەکبوونی (هەمەکییەتی مەوجود) پارێزراوە))[4] . کە دەوترێت (بە شێوەیەکی نادیاریش بێت) مەبەست ئەوەیە ، مرۆڤ کاتێك بە بەشێك یان لایەنێك لە هەمەکییەتی مەوجودەوە خەریك دەبێت ، دەرك بە هەمەکییەتی مەوجود ناکات و بە نسبەت ئەمەوە هەمەکییەتی مەوجود وەك نەبێت وایە . بەلاّم هەمەکییەتی مەوجود لە خودی خۆیدا هەر ماوەو ((لەو کاتەشدا کە ئێمە خۆمان نە بە شتەکان و نە بە خودی خۆمانەوە خەریك ناکەین ، ئەم هەمەکییەتەمان بۆ دێت و بەسەرماندا دەدات ، بۆ

---

(1) هـ . س ، هـ . ل .

(2) هـ . س ، هـ . ل .

(3) هـ . س ، ل ٢٣ .

(4) هـ . س ، هـ . ل .

نمونە لە بێزارییەکی راستەقینەدا بۆمان دێت . ئەم بێزارییە جیاوازە لەو بێزارییەی خوێندنەوەی کتێبێك ، یان نمایشێك ، یان کارێك ، تیاماندا دروستی دەکات»[1] . ئەم بێزارییە کاتێك روو دەدات کە هیچ شتێك لەلامان گرنگی و بایەخی نامێنێت . دازاینمان لە بەرامبەر (هەمەکییەتی مەوجود)دا کاتێك خۆی لە بێزارییەکی قووڵدا دەبینێتەوە ، کە شتەکانی دەوروبەرمان هیچ توانایەکی کردارمان پێ نابەخشن ، واتە وامان لێ ناکەن شتێك بکەین یان واز لە شتێك بهێنین . واتە بێزاری راستەقینە کاتێك روو دەدات ، کە مرۆڤ لە بەرامبەر ئەو شتە دیاریکراوەدا کە هەیەتی و تیایدا رۆچووە ، چ پارەو سامان بێت ، چ دەسەڵات ، چ...هتد لەناوەوەی خۆیدا وازیان لێ دەهێنێت و هیچ پەیوەندییەکی ناوەکی و قووڵی لەگەڵیاندا نامێنێت . ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی هیچ کاریگەرییەکیان لەسەری نەمێنێت و وەکو نەبین وایە ، چونکە نابنە هۆی جوڵاندنی ئەم و بە هۆیانەوە هیچ کارێك یان رەفتارێکی دیاریکراو ئەنجام نادات . لە کاتێکدا با ئەم لە ناوەوەی خۆیدا پەیوەندیشی پێوەیان نەمابێت ، بەڵام لە دەرەوە و لە واقیعدا هەر هیی ئەمن و ئەم خاوەنیانە ، ئەگەرچی نە ئەم کاریگەریی لەسەر ئەوان ماوەو نە ئەوانیش کاریگەرییان لەسەر ئەم ماوە . ئەم حاڵەتەش بە هۆی بێزاری راستەقینەو قووڵەوە روو دەدات و «ئەم بێزارییە قووڵە ، وەك تەمێکی وەستاوە لە قووڵایی (دازاین)داو هەموو شتەکان و خەڵك و خودی کەسەکە لە بێبایەخیی (لامبالات)ێکی سەیردا کۆدەکاتەوە»[2] . واتە ئەو مرۆڤەی کە پێشتر بە لایەنێك لە مەوجودەوە خەریکبووە ، بۆ نمونە بە دەسەڵات و سامانەوە خەریکبووەو لەمەوە خۆی پێکهێناوەو دەسەڵاتی بەسەر شتەکان و خەڵکدا هەبووە ، لەم حاڵەتی بێزارییەدا ئەو پێکهاتە دەرەکییەی خۆی و ئەو کەسێتییەی لە رێگەی سامان و دەسەڵاتەوە تیایدا دروستبووە ، لە لای بێبایەخ دەبن و هیچ پەیوەندییەکی قووڵی پێوەیان نامێنێت . نەك هەر ئەمە ، بەڵکو خەڵکانی ترو ئەو شتانەش کە ئەم بەهۆی ئەم دەسەڵات و سامانەوە پەیوەندی پێوەیان هەبووەو کاریگەریی لەسەریان هەبووەو بوونەتە جێی بایەخی ، لە ناوەوەیدا ئەوانیش بێبایەخ دەبن . بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا «ئەم بێزارییە کرانەوە تیایدا روو دەدات و (هەمەکییەتی مەوجود) ئاشکرا دەکات ... ئەم بارگە هەستییە کە مۆرکی مرۆڤەو تیایدا بەم جۆر یان بەو جۆر دەبین ، وامان

(1) هـ . س ، هـ . ل .

(2) هـ . س ، هـ . ل .

لێدەکات خۆمان لە ناو (هەمەکییەتی مەوجود) دا ببینینەوە . ئەو حاڵەتە هەستیەی ئەم بارگەیە تیاماندا دەی وروژێنێت ، ئەوە نییە کە تەنها مەوجودمان لە هەمەکیەتیدا بۆ ئاشکرا دەکات ، واتە ئەم ئاشکراکردنە تەنها ڕووداوێکی سادە نییە ، بەڵکو لە هەمان کاتدا کردەی ئەساسیی (دازاین)مانە))[1] . یاخوود دەتوانین بڵێین ئەو ساتە مێژووییە بنچینەییەیە ، کە دازاینمان تیایدا بەدی دێت . واتە لەم حاڵەتی بێزارییەدا کە هیچ شتێکی دەرەوە (چ سامان و دەسەڵات بێت ، چ خەڵك و شتەکانی تر ) لای کەسەکە بایەخیان نامێنێت و ئەوەی دەمێنێتەوەو ئەو کەسە هەستی پێ دەکات بوونی خۆیەتی . لەم حاڵەتی بێزارییەدا بە نسبەت کەسەکەوە دوو شت ڕوون دەبنەوەو دەرکیان پێ دەکات ، یەکەمیان : ئەوەیە ئەو بەش و لایەنە دیاریکراوانەی مەوجود کە پێشتر پێوەیان خەریکبووە ، لای نامێنن و (هەمەکییەتی مەوجود) ئاشکرا دەبێت و کەسەکە هەستی پێ دەکات . دووەمیشیان: ئەوەیە بە نەمانی پەیوەندی و دابڕانی لەو بەش و لایەنانەی مەوجود (پارە ، یان سامان ، یان دەسەڵات ، یان ... هتد) کە پێشتر پێوەیان خەریکبووەو بێبایەخ بوونیان لای ، ئەوەی دەمێنێتەوەو هەستی پێ دەکات بوونی خۆیەتی . کەواتە ئەم بارگە هەستییە ((دیاردەیەکی لابەلاو تێپەڕی کردەی بیرکردنەوەو ئیرادەمان نییە ، هەروەها تەنیا پاڵنەرێك نییە ، کە بیرکردنەوەو ئیرادەمان بوروژێنێت ، یان حاڵەتێك نییە کە دەبێت بە جۆرێك لە جۆرەکان لەگەڵی بگونجێین))[2] ، چونکە ئەم بارگە هەستییە کە بێزارییەکی ڕاستەقینەیەو لە کەسەکەدا ڕووی داوە ، ئەو دوو دەرئەنجامە گەورەو گرنگەی لێ کەوتووەتەوە کە لە سەرەوە دیاریمان کردن و بە نسبەت کەسەکەوە بریتی بوون لە : هەستکردن بە بوونی خۆی و دەرککردن بە هەمەکییەتی مەوجود ((بەڵام کاتێك ئەم بارگە هەستیانە بەم جۆرە دەمانخەنە بەرامبەر مەوجود لە هەمەکیەتیدا ، ئەوا لە هەمانکاتدا ئەو (عەدەم)ەمان لێ دەشارنەوە کە بەدوایدا دەگەڕێین))[3] . واتە کە لە حاڵەتێکی وەك بێزاریدا واز لە شتێکی دیاریکراو دێنین کە پێشتر پێوەی خەریکبووین و هەست بە (هەمەکییەتی مەوجود) دەکەین ، لەم بارەدا هەست بە (عەدەم) ناکەین . ((لێرەدا (وا دیارە) لەو باوەڕە دوور دەکەوینەوە کە لە بارگەیەکی هەستیدا نەفیکردنی (هەمەکییەتی مەوجود) (عەدەم)مان بۆ ئاشکرا دەکات . لەهەمان

---

(1) هـ . س ، هـ . ل .

(2) هـ . س ، هـ . ل .

(3) هـ . س ، هـ . ل .

کاتدا لەو رایەش پاشگەز نابینەوە کە لە بارگەیەکی هەستیدا نەفیکردنی (هەمەکییەتی مەوجود) (عەدەم)مان بۆ ئاشکرا دەکات . بەلآم ئایا لە (دازاین)دا بارگەیەکی هەستیی وا روو دەدات کە تێیدا لە بەرامبەر ( (عەدەم)دا خۆی ببینێتەوە؟))[1] . بە دەربڕینێکی تر ، ئایا مرۆڤ تووشی بارگەیەکی هەستی ، یان تووشی حاڵەتێکی وا دەبێت کە تیایدا هەست بە (عەدەم) بکات و خۆی لە بەرامبەر (عەدەم)دا ببینێتەوە؟ سەرەڕای دەگمەنی و کەمیی ئەم بارە ، ((بەلآم واقیعییەو ، دەکرێ لەو بارگە هەستییە ئەساسییەدا کە پێی دەوترێت (قەلەق) ، بۆ چەند ساتێك ئەمە روو بدات . (قەلەق) ئەو شڵەژانە ئاسابیە نییە کە باڵدەکێشێت بەسەرمانداو هۆکارەکەی بۆ ترس دەگەڕێتەوە . (قەلەق) زۆر بە قووڵی لە ترس جیاوازە ، چونکە ترس ، هەمیشە هەستکردنە بە ترس لە(بەرامبەر) شتێکی دیاریکراودا ، کە لە روانگەیەکی دیاریکراوەوە هەڕەشەمان لێدەکات . خاڵی جیاکەرەوەی ترس لەوەدایە ، ئەوەی لێی دەترسین شتێکی دیاریکراوەو دەزانین چییە . ئەو مرۆڤەی دەترسێت ، خۆی لەو بارەدا دەبینێتەوە کە بەستراوە بەوەوەی لە خۆیدا هەستی پێ دەکات))[2] . واتەسەرچاوەی ترس شتێکی ئاشکراو بەرجەستەیەو دیارە چییە ، بۆ نموونە : مرۆڤ لە نەخۆشییەکی کوشندە ، یان لە جەنگ ، یان لە ئاگرو لافاو دەترسێت . ئەم ترسەش لەو شتە دیاریکراوە ، وا لە کەسەکە دەکات ببەسترێتەوە بەو حاڵەتی ترسەوەی کە بە هۆی سەرچاوەی مەترسییەکەوە لە خۆیدا هەستی پێ دەکات و هەوڵدەدات خۆی لەو شتە بپارێزێت کە مەترسیی هەیە بۆی و ((هەوڵی رزگاربوونیشی لەو شتە دیاریکراوەی لێی دەترسێت لەوەوەیە ، لە بەرامبەر ئەوی تردا هەست بە نائارامی دەکات ، واتە بە گشتی هۆشی لە دەست دەدات))[3] و لە حاڵەتی شڵەژان و پەشۆکاندا دەبێت و دەیەوێت لەو بارە دەرباز بێت . بەلآم (قەلەق) لەمە جیاوازەو ((ڕێگە بەم جۆرە نائارامییە نادات و، تیایدا هەست بە جۆرە ئارامییەکی تایبەت دەکرێت))[4] و تووشی شڵەژان و پەشۆکانمان ناکات . ((قەلەق بەردەوام (قەلەقییە لە.....) ، بەلآم لەم شت یان لەو شت نا))[5] و نازانین ئەو شتە چییە کە قەلەقمان

---

(1) هـ . س ، هـ . ل .

(2) هـ . س ، ل ٢٤ .

(3) هـ . س ، هـ . ل .

(4) هـ . س ، هـ . ل .

(5) هـ . س ، هـ . ل .

دەکات . ((ناڕوونی ئەوەی قەلەقمان دەکات لەوەدا نییە سەرچاوەی قەلەقەکەمان دیاری نەکردووە ، بەڵکو لەوەدایە ئەستەمە بتوانین ئەوە دیاری بکەین کە قەلەقمان دەکات . واتە ئێمە لە بەرامبەر شتێکی دیاریکراودا هەست بە (قەلەق) ناکەین))[1] ، هەر ئەوەندەیە دەکەوینە ئەم حاڵەتەوەو هۆکاری کەوتنە ئەم حاڵەتەو سەرچاوەکەی نازانین . ئەمەش لەم لێکدانەوە باوەی (قەلەق)دا دەردەکەوێت کە دەڵێت : ((لە قەلەقدا مرۆڤ لە بارێکدایە ، هەست بە تەنگ پێ هەڵچنین دەکات ... بەلاَم نازانرێت بەرامبەر بە چ شتێك هەست بە تەنگ پێ هەڵچنین دەکات ... لەم بارەدا هەموو شتەکان و خۆیشی بێ بایەخ دەبن))[2] . واتە هیچ شتێك یاخود هیچ مەوجودێك کاریگەری لەسەر ئەم نامێنێت و پەیوەندیی لەگەڵ هەموو مەوجودێکدا دەپچڕێت و گرنگی بە هیچ شتێك نادات و وەك ئەوە وایە لە دەرەوەی خۆی هیچ شتێك نەبێت . ((ئەمەش مانای لەناوچون (زوال)ێکی تەواوی شتەکان نییە))[3] . شتەکان هەر ماون ، بەلاَم ئێمە کە لەم حاڵەتی قەلەقیەداین هەستیان پێ ناکەین ، چونکە لێمان کشاونەتەوەو ((بەم کشانەوەیان لێمان ، لە ئێمە بزر دەبن))[4] . واتە لەم بارەدا (هەمەکییەتی مەوجود) دەکشێتەوەو لە دەستمان دەردەچێت ((ئەم دوورکەوتنەوەیەی (هەمەکییەتی مەوجود) کە لە (قەلەق)دا هەستی پێ دەکەین ، تەنگمان پێ هەڵدەچنێت و هیچ پاڵپشت(سند)ێکمان بۆ نامێنێتەوە))[5] ، چونکە هەست ناکەین هیچ شتێك هەبێت و ئەم هەستە وامان لێ دەکات خۆمان بێ پاڵپشت ببینینەوە .

## (قەلەق) ، (عەدەم) ئاشکرا دەکات

هایدگەر پێی وایە کە دەکەوینە قەلەقەوە ، ئەوا ((لە قەلەقدا بە هەڵواسراوی (معلق) دەمێنینەوە))[6] . بە دەربڕینێکی روونتر : (قەلەق) وامان لێ دەکات مۆڵەق بین و هەست بکەین لە بۆشاییداین و لە هیچ لایەکمانەوە شتێك نەماوە دەستی پێوە بگرین . ((چونکە وا لە (هەمەکییەتی مەوجود) دەکات لە دەستمان دەربچێت . ئەمەش مانای ئەوەیە ئێمەی مرۆڤیش لەناو ئەم مەوجودە لەدەست دەرچووەدا ، لە دەست

---

(1) هـ . س ، هـ . ل .
(2) هـ . س ، هـ . ل .
(3) هـ . س ، هـ . ل .
(4) هـ . س ، هـ . ل .
(5) هـ . س ، هـ . ل .
(6) هـ . س ، هـ . ل .

دەردەچین و هیچ زەمینەیەکمان نابێت لەسەری رابووەستین))[1] . ئەمەش وەك شۆكێك وایەو رامان دەچڵەكێنێت و ((لەم راچەنینەدا كە (دازاین) بە هەڵواسراوی دەمێنێتەوەو هیچ پەنایەكی نامێنێت و رێگەی پێ نادرێت دەست بە هیچ شتێكەوە بگرێت ، تەنها (دازاین) دەمێنێتەوە))[2] . واتە ، (قەلەق) ، كە وا لە (هەمەكییەتی مەوجود) دەكات بكشێتەوەو لە دەستمان دەر بچێت ، دەمانخاتە بەرامبەر (دازاین)ی رەسەنی خۆمانەوەو (دازاین)مان بۆ ئاشكرا دەكات ، وەك (بوون)ێك كە هەڵدراوەتە جیهانەوە . واتە ئاراستەی بایەخ پێدانمان دەگۆڕێت ، چونكە پێش حاڵەتی قەلەقەكە ، بایەخمان بە دەرەوە دەداو بە مەوجودەوە خەریك دەبووین ، بەڵام ئێستا لەبەرئەوەی مەوجودەكان بەگشتی كشاونەتەوەو هەستیان پێ ناكەین ، بوونی خۆمان ماوەتەوەو هەستی پێ دەكەین و بایەخ بەو دەدەین . لەم حاڵەتەدا ((قەلەق زمانمان دەبەستێت و لەبەرئەوەی مەوجود لە هەمەكییەتیدا لە دەستمان دەرچووەو (عەدەم) تەنگی پێ هەڵچنیوین ، هیچ قسەیەكمان بۆ ناكرێت))[3] . ئەم بێدەنگییەش بە هۆی ئەوەوەیە (عەدەم) لە بەرامبەرماندا ئامادەیەو ناتوانین هیچ قسەیەكی لە بارەوە بكەین ، چونكە (عەدەم) شتێكی دیاریكراو ، یان بابەتێك نییە ، تا بتوانین قسەی لە بارەوە بكەین ، هەر ئەمەشە زمانمان دەبەستێت . ((ئەوەی كە (قەلەق) ، (عەدەم) ئاشكرا دەكات ، مرۆڤ كاتێك جەختی لێدەكاتەوە كە قەلەقەكە نامێنێت ، چونكە كە حاڵەتی قەلەقەكە نەما ، دەڵێین : ئەوەی قەلەقی كردبووین ، لەڕاستیدا هیچ شتێك نەبوو ، ئەوەی لەوێ هەبوو خودی (عەدەم) بوو . لەگەڵ ئەم بارگە قەلەقە ئەساسییەدا ، بەو مێژووە دەگەین كە (دازاین)ی تیا بەدی دێت و (عەدەم)ی تیا دەردەكەوێت))[4] . واتە دوای تەواوبوونی ئەو حاڵەتەی كە لە كاتی قەلەقەكە تیایدا بووین ، هەستدەكەین ئەوەی تەنگی پێ هەڵچنیبووین كشانەوەی مەوجود بوو ، كە بوویووە هۆی ئەوەی هیچ پاڵپشتێكمان نەمێنێت ، ئەم حاڵەتەش دەبێتە هۆی دەركەوتنی (عەدەم) . ئەمەش بەلای هایدگەرەوە ئەو ساتەیە كە مرۆڤ هەست بە بوونی خۆی دەكات ، چونكە لای هایدگەر مێژووی (بوون)ی هەر مرۆڤێك لەو ساتەوە

(1) هـ . س ، هـ . ل .

(2) هـ . س ، هـ . ل .

(3) هـ . س ، ل ٢٥ .

(4) هـ . س ، هـ . ل .

دەست پێدەکات کە (قەلەق) دەبێت ، چونکە لە (قەلەق)دا لە مەوجود دادەبڕێت و هەست بە بوونی خۆی دەکات .

## وەلامی پرسیارەکە

بەم جۆرە وەلامی پرسیارەکەمان لە بارەی (عەدەم) ەوە دەستکەوت . ((بەلام ئەوەی لێرەدا گرنگە ، ئەو گۆڕانەیە کە لەگەڵ هەموو حاڵەتێکی (قەلەق)دا ، لە مرۆڤدا ڕوودەدات و بەرەو (دازاین) یاخود بەرەو (بوون) ی خۆی دەبیات و ، لە هەمان کاتدا (عەدەم)یشی بۆ ئاشکرا دەکات))[1] . واتە قەلەق هەر ئەوە نییە کە (عەدەم) ئاشکرا دەکات و دەبێتە هۆی کشانەوەی (هەمەکییەتی مەوجود)و ئەو بەش و لایەنانەی (هەمەکییەتی مەوجود) ، کە ئێمە بە خۆیانەوە خەریك دەکەن ، بەڵکو دەبێتە هۆی هەستکردنمان بە بوونی خۆمان و ئەو (عەدەم)ەش کە لە قەلەقدا دەردەکەوێت شتێکی بەرجەستە نییە . ((کەواتە لە (قەلەق) دا (عەدەم) ئاشکرا دەبێت ، بەلام نەك وەك مەوجودێك و ، هەروەك چۆن وەك هەر بابەتێك پێدراوێکیش نییە . (قەلەق) پرۆسەی وێناکردنی (عەدەم) نییە))[2] . واتە لە قەلەقدا (عەدەم) وەك شتێك دەرناکەوێت کە دەتوانین بیبینین ، بەڵکو بە هۆی کشانەوەی (هەمەکییەتی مەوجود)ەوە هەست بە (عەدەم) دەکەین ، ((بەلام بەو جۆرە نا کە (عەدەم) بەجیا لە تەنیشت ئەو (هەمەکییەتی مەوجود)ەوە دەردەکەوێت ، کە بە هۆی قەلەقەوە کشاوەتەوەو لە دەستمان دەرچووە . وا باشترە بڵێین : لە (قەلەق)دا ، (عەدەم) هاوکات لەگەڵ (هەمەکییەتی مەوجود)دا دەردەکەوێت ... واتە مەوجود لەلایەن قەلەقەوە لەناو نابرێت بۆ ئەوەی (عەدەم) بمێنێتەوە ...، چونکە (قەلەق) لە بەرامبەر هەمەکییەتی مەوجوددا تەواو هەست بە بێتوانایی خۆی دەکات))[3] . واتە قەلەق هەمەکییەتی مەوجود لەناو نابات بۆئەوەی لە نەمانی (هەمەکییەتی مەوجود)دا (عەدەم) دەربکەوێت ، تەنانەت ئەگەر بیشیەوێت ئەم کارە بکات ، پێی ناکرێت ، چونکە (هەمەکییەتی مەوجود) شتێك نییە بتوانرێت لە لایەن قەلەقەوە لە ناو ببرێت . نەك هەر ئەمە ، بەڵکو لە ناوچوونی (هەمەکییەتی مەوجود) بە هیچ جۆرێك و لەهیچ بارێکدا بە پراکتیکی ئەنجام نادرێت ، تەنها ئەوەندە هەیە بەنسبەت ئەو کەسەی لە

---

(1) هـ . س ، هـ . ل .

(2) هـ . س ، هـ . ل .

(3) هـ . س ، ل ٢٥-٢٦.

حاڵەتی قەلەقدایە ، (هەمەکییەتی مەوجود) دەکشێتەوەو وەك نەما بێت وایە . بۆیە ((عەدەم لەگەڵ مەوجود و لە مەوجوددا لەو کاتەدا خۆی ئاشکرا دەکات ، کە مەوجود بە گشتی دەکشێتەوەو لە دەستمان دەردەچێت))[1] . واتە دەرکەوتنی (عەدەم) و هەستکردن پێی ، هاوکاتە لەگەڵ کشانەوەی مەوجودو دەرچوونی لە دەستمان . ((لە (قەلەق)دا گەڕانەوەیەك لە (بەرامبەر ....)دا هەیە))[2] . واتە لە قەلەقدا لە شتێك دەگەڕێینەوە . بەڵام ئەو شتەی لێی دەگەڕێینەوە ، شتێکی دیاریکراو نییە ، جگە لەوەی ((ئەم گەڕانەوەیە راکردن نییە ، بەڵکو وەستاوییەکی راکێشەرە))[3] . مەبەست ئەوەیە ، ئەم گەڕانەوەیە بەرەو ئەو حاڵەتە وەستاو و ئارامەیە کە لەناو خۆماندایەو بە هۆی قەلەقەکەوە تیاماندا دروستبووە ((سەرچاوەی ئەم گەڕانەوەیە لە (بەرامبەر....)دا (عەدەم)ە . ئەم (عەدەم)ەش سەیر ناکرێت و لە بناغەدا ڕێ لەوە دەگرێت سەیر بکرێت))[4] ، چونکە شتێکی بەرجەستە یاخود بابەتێك نییە ، تا بتوانرێت سەیر بکرێت . بەڵکو ((گواستنەوەیە بۆ (هەمەکییەتی مەوجود) لە دیارنەمانیداو ، ئەم گواستنەوەیە وا دەکات لەدەست دەرچوون روو بدات))[5] . واتە (هەمەکییەتی مەوجود) دەکشێتەوەو لە دەستمان دەردەچێت ((ئەم گواستنەوەیە بۆ مەوجودی لەدەست دەرچوو لە هەمەکییەتیدا ، کە لەگەڵیدا بە هۆی (قەلەق)ەوە ، (عەدەم) گەمارۆی (دازاین) دەدات ، ماهییەتی (عەدەم)ەو بریتییە لە عەدەمان . ئەمە نەمانی مەوجود نییەو لە ئەنجامی نەفیکردنەوە پەیدا نەبووە . هەروەها ناشتوانرێت بە نەمان و نەفیکردن بپێورێت ، چونکە (عەدەم) خۆی دەعەدەمێت))[6] . لێرەدا هایدگەر لە وشەی (das Nichts) کە واتای عەدەم دەگەیەنێت ، فرمانی (nichten)ی دارشتووە کە لە زمانی ئەڵمانیدا بوونی نییە[7] . ئێمەش بە (عەدەمان) دامان رشت (کە بە مانای ئەوە دێت (عەدەم) روو دەدات و باڵادەست دەبێت و بڵاو دەبێتەوە . بەکارهێنانی ئەم دەربڕینە لەلایەن هایدگەرەوە بۆ جەختکردنە لەسەرئەوەی (عەدەم) شتێك یان حاڵەتێك نییە ، بەڵکو کردار یان رووداوێکە . ئەمەش بەو مانایەی کە لەکاتی لە

---

(1) هـ . س ، ل ٣٦ .
(2) هـ . س ، هـ . ل .
(3) هـ . س ، هـ . ل .
(4) هـ . س ، هـ . ل .
(5) هـ . س ، هـ . ل .
(6) هـ . س ، هـ . ل .
(7) بڕوانە : هـ . س ، ل ٣٦ .

دەست دەرچوونی مەوجوددا ، دەگوازرێتەوە بۆی و دەردەکەوێت و ((لە جەرگەی ئەو (عەدەم)ەدا کە پەیوەستە بە قەلەقەوە ، دەرکەوتنی رەسەنی مەوجود وەك خۆی ، دەست پێدەکات ، کە بریتییە لەوەی مەوجود هەیە نەك (عەدەم) ، یاخود (نەك نا شت) . ئەم دەستەواژەی (نەك نا شتە) کە لێرەدا زیادمان کردووە ، روونکردنەوەیەکی پاشوەخت نییە ، بەڵکو مەرجێکی پێشوەختی توانای دەرکەوتنی مەوجودە بە گشتی . لەسەر بناغەی دەرکەوتنی رەسەنی (عەدەم) ، (دازاین)ی مرۆڤ دەتوانێت بەرەو مەوجود بچێت و بایەخی پێ بدات))[1] . واتە پێش حاڵەتی قەلەق ، کە مرۆڤ بە مەوجودەوە خەریك دەبێت ، ناتوانێت وەك مەوجودێك دەرك بە مەوجود بکات ، لەم بارەدا ئەم مرۆڤە لە بەرامبەر ئەو مەوجودەدا بوونی خۆی لە دەست دەدات و تیایدا رۆدەچێت ، بەڵام لە حاڵەتی قەلەقەکەدا ، مەوجود لێی دەکشێتەوەو (عەدەم) دەردەکەوێت ، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی ، تەنها بوونی خۆی بمێنێتەوەو هەست بەم بوونەی بکات . لێرەدا هەرچەندە بەلای هایدگەرەوە (هەمەکییەتی مەوجود) لە مرۆڤ دەکشێتەوە ، بەڵام ئێمە پێمان وایە سەرەتا مرۆڤ لە (هەمەکییەتی مەوجود) دەکشێتەوەو ئەم کشانەوەیەش وا دەکات (هەمەکییەتی مەوجود) لە دەست دەربچێت و لە مرۆڤ بکشێتەوە . واتە مرۆڤ پەیوەندی بە مەوجودو شتە مادی و مەعنەوییەکانی تری وەك (پارەو سامان و دەسەڵات و ...هتد)ەوە نامێنێت . دوای نەمانی قەلەقەکەش مرۆڤ دیسان بایەخ بە مەوجودو شتەکانی دەرەوە دەداتەوە ، بەڵام بایەخدانی ئەم جارەی جیاوازە لە پێش قەلەقەکە ، چونکە لە بایەخدانی پێش قەلەقەکەیدا بە مەوجود ، بە تەواوی لە مەوجوددا رۆ دەچوو و بوونی خۆی لە بیر دەکرد ، بەڵام دوای تەواوبوونی قەلەقەکە هەست بە بوونی خۆی دەکات و کە بەرەو مەوجودیش دەچێتەوەو بایەخی پێ دەدات ، تەنها وەك مەوجودێك بایەخی پێ دەدات و تیایدا رۆ ناچێت . کەواتە بەدیهاتنی دازاین ((واتە : تووشبوون بە (عەدەم)و گیربوون تیایدا . (دازاین) بەم گیربوونەی لە (عەدەم)دا، دەست بە هاتنە دەرەوە دەکات لە هەمەکییەتی مەوجود))[2] و هەمەکییەتی مەوجود تێ دەپەڕێنێت و لەدەرەوەی (هەمەکییەتی مەوجود)دا خۆی دەبینێتەوەو هەست بە بوونی خۆی دەکات . ((ئەم تێپەڕاندنەی (هەمەکییەتی مەوجود) بە بالابوون (تعالی) ناودەبرێت .

---

(1) هـ . س ، ل ٢٦.

(2) هـ . س ، ل ٢٧ .

ئەگەر (دازاین) لە ماهییەتی خۆیدا بالآبوون ئەنجام نەدات ، واتە ئەگەر تووشی (عەدەم) نەبێت و (هەمەکییەتی مەوجود) تێنەپەڕێنێت ، ناتوانێت لەگەڵ مەوجودو هەروەها لەگەڵ خودی خۆیشیدا پەیوەندی ببەستێت))[1] . واتە بالآبوون ئەوەیە کە مرۆڤ لە (هەمەکییەتی مەوجود) دەکشێتەوەو لە دەستی دەردەچێت ، ئنجا هەست بە بوونی خۆی دەکات . لە دوای ئەمە ئەگەر جارێکی تر بەمەوجودەوە خەریکبوویەوەو پەیوەندی لەگەڵدا بەستەوە، ئەم خەریکبوونەی دروست و ئاساییە ، چونکە بەتەواوی لە مەوجوددا رۆناچێت و ئاگای لە خودی خۆی دەمێنێت و پەیوەندیی بە بوونی خۆیەوە ناپچڕێت .

بەمجۆرە دەگەینە وەلآمی ئەو پرسیارەی لە بارەی (عەدەم)ەوە کردمان . ((عەدەم) نە بابەتێکەو نە مەوجودێکە ، هەروەها دژە چەمکی مەوجودیش نییە ، بەڵکو لە ئەساسدا سەر بە خودی بوونەو لەبوونی مەوجوددا روو دەدات . (عەدەم) بوار بە مەوجود دەدات وەك مەوجودێك بۆ (دازاین) دەربکەوێت))[2] . کەواتە (دازاین) کاتێك دەتوانێت بوونی خۆی بەدی بهێنێت و لەگەڵ مەوجوددا پەیوەندی ببەستێت ، کە تووشی (عەدەم) بووبێت . ((بەلآم ، ئەگەر (عەدەم) تەنها لە (قەلەق)دا دەربکەوێت ، ئایا نابێ ئێمە بەردەوام لە (قەلەق)دا بین بۆئەوەی بتوانین بەتەواوی ، بوونی خۆمان بەدی بهێنین؟ ئەی ئەوەی کە ئێمە پێشتر وتمان ئەم (قەلەق)ە دەگمەنەو زۆر کەم روو دەدات ، چی دەگەیەنێت ؟ بێگومان ئەوە دەگەیەنێت ، کە بە زۆری (عەدەم)ی رەسەن لێمان شاراوەیە . بەلآم با بپرسین چی لێمانی دەشارێتەوە؟ ئەوەی لێمانی دەشارێتەوە ئەوەیە کە ئێمە بە جۆرێك لە جۆرەکان ، لە مەوجوددا رۆدەچین و بە تەواوی خۆمانی بۆ تەرخان دەکەین))[3] . واتە خەریکبوونی بەردەوامەمان بە مەوجودەوەو رۆچوونمان تیایدا ، وامان لێ دەکات لە حاڵەتی کەوتنە قەلەق دوور بین و ئامادەیی ئەوەمان تیا نەبێت تووشی حاڵەتی قەلەق ببین ، چونکە بوار بە خۆمان نادەین بۆ ماوەیەك واز لە خەریکبوون بە مەوجودەوە بهێنین ، بۆ ئەوەی هەست بە بوونی خۆمان بکەین . ((تا زیاتریش خۆمان بە مەوجودەوە خەریك بکەین ، کەمتر لە دەستمان دەردەچێت))[4] . واتە خەریکبوونی

(1) هـ . س ، هـ . ل .

(2) هـ . س ، هـ . ل .

(3) هـ . س ، هـ . ل .

(4) هـ . س ، هـ . ل .

زۆرو بەردەوامی ژیانی رۆژانەمان بە مەوجودەوە ، وادەکات بەردەوام مەوجود ئامادەیی هەبێت و ((بەمەش زیاتر لە (عەدەم) دوور دەکەوینەوەو بەرەو ئاستی گشتیی دازاین دەچین))[1] . واتە بەگشتی وەك هەر مرۆڤێکی سادەو ساکار و ئاسایی دەبین ، کە بە لایەنێکی مەوجودەوە خەریك دەبێت و تیایدا رۆ دەچێت . ئەمەش مانای وایە خەریکبوون بەدەرەوە ، لە بوونی رەسەنی خۆمان دامان دەبڕێت و بەرەو بوونێکی ساختەمان دەبات ، کە بەدەرەوە خەریکەو لە ژێر کاریگەری دەرەوەدایەو (قەلەق) بوون تیایدا روو نادات .

## ڕەنگدانەوەی (عەدەم) لە شیعری مەحویدا

ئەوەی باسکرا سەبارەت بە (عەدەم) بوو . باسکردنی (عەدەم) و چۆنیەتیی دەرکەوتنی بۆ ئەوەیە لە رێگەی (عەدەم)ەوە بەرەو بوونی رەسەنی مرۆڤ بچین و پەی پێ ببەین . کەوتنە حاڵەتی (عەدەم) لە کاتێکدا دەبێت مەوجود لە مرۆڤ دەکشێتەوە . بە دەربڕینێکی تر ، مرۆڤ بۆ ئەوەی بکەوێتە حاڵەتی (عەدەم)ەوە ، پێویستە مەوجود لێی کشابێتەوەو کەسەکە هیچ پەیوەندییەکی بە مەوجودەوە نەمابێت و بە نسبەت ئەمەوە مەوجود وەك نەبێت وابێ .

مەوجود لە شیعری مەحویدا بە دنیاو شتی دنیایی تەعبیری لێ کراوە ، واتە مەوجود لای مەحوی بریتییە لە دنیا بەشێوەیەکی گشتی و لە شتی دنیایی ماددی و مەعنەویی (وەك پارەو سەروەت و سامان و موڵك و دەسەڵات و پلەو پایەی ئایینی و کۆمەڵایەتی و ... هتد) بە شێوەیەکی تایبەتی . کەواتە ئەو روانگەیەی مەحوی لێیەوە لە دنیاو شتی دنیایی دەڕوانێت و لێی دەدوێت ، هەمان ئەو روانگەیە کە هایدگەر لێیەوە لە هەمەکییەتی مەوجود و مەوجود دەدوێت . هایدگەر پێی وایە کاتێك مەوجود لە هەمەکیەتیدا لە مرۆڤ دەکشێتەوە ، مرۆڤ دەکەوێتە حاڵەتی (عەدەم)ەوەو لەو (عەدەم)ەدا پەیوەندی بە هیچ شتێکی دنیاییەوە نامێنێت و لێیان دادەبڕێت و پەی بە بوونی رەسەنی خۆی دەبات و بەرەو ئەو بوونەی دەچێت و هەوڵی بەدیهێنانی ئەو بوونەی دەدات . ئەم کشانەوەیەی هەمەکییەتی مەوجود لە حاڵەتی بێزاری و لە (قەلەق)دا روو دەدات .

---

(1) هـ . س ، هـ . ل .

مەحوی دوای ئەوەی بۆی دەردەکەوێت دنیا بەرامبەر بە مرۆڤ بێ وەفایەو هەر رۆژەی لەسەر بارێکەو تا سەر بۆ مرۆڤ نابێت و شتەکانی ناویشی وەك پارەو سامان و پلەو پایەو دەسەلات و ، ...هتد وەك خۆی وان و تا سەر بۆ کەس نامێنن ، ئیتر لەبەرامبەر دنیاو شتە دنیاییەکاندا دەکەوێتە حالەتی بێزارییەوە . کەواتە ئەم بێزارییەی مەحوی لە دنیا لەوەوەیە هەستدەکات دنیا هیچە ، بۆیە گەیشتووەتە ئەو قەناعەتەی بەرەبەرە لە دنیا دوور بکەوێتەوەو دەستی لێ هەڵبگرێت .

## هیچی و بێبایەخی دنیا لای مەحوی

مەحوی هەستی کردووە گێتی یاخوود دنیا دایکێکی خراپی مرۆڤە ، چونکە مرۆڤ لە بوونی رەسەنی خۆی دوور دەخاتەوەو بەرەو خۆی (واتە دنیا) دەیبات :

**مادەری گێتی لە شیری بڕیەوە ، دەبڕێتەوە**
**فائیدەی چی شەخصی لێ کەوتوو بەدادایی بکا[(١)]**

مەحوی پێی وایە ئەو بوونەی ، مرۆڤ لە رێگەی دنیاوە بەدەستی دەهێنێت ، بوونێکە بە دنیاوە بەستراوەو مان و نەمانی ئەو بوونە لە دەست دنیادایە ، کە دنیا ئەو بوونەی لەو کەسە سەندەوە ، ئیتر ئەو کەسە بوونی نامێنێت و کۆتایی پێ دێت . بۆیە مەحوی ئەم کەسە بە (شەخصی لێ کەوتوو) ناو دەبات ، کە مەبەستی ئەوەیە ئەم جۆرە کەسە تووشی (کەوتن) بووەو لە بوونی رەسەنی خۆی دابڕاوەو بوونی بەستراوە بە دنیاو شتی دنیاییەوە . بەلای مەحوییەوە دنیا وەفای بۆ کەس نییەو ئەو بوونەی داویەتی بەو کەسە لێی دەسەنێتەوەو لە ناوی دەبات ، بۆیە دەڵێت :

**ئەگەر تاجت لەسەر کا سەرتی پێوە قووت ئەدا ئاخر**
**موبارەك کەی دەبێ ئەو خەلعەتەی خەلعی لە دوا بێ[(٢)]**

مەحوی هەستدەکات ئەگەر دنیا بەرەو رووی کەسێك هات و بایەخی پێداو وای لێکرد زۆرترین سەروەت و سامان و گەورەترین پلەو پایەو دەسەلات بەدەست بهێنێت ، تەنانەت ئەگەر دنیا تاجی پاشایەتیی لەسەرکرد ، ئەوا ئەم روو تێکردن و بایەخدانەی دنیا بەو کەسەو گەورە کردنی ، کاتییەو هەر ئەو دنیایەی کە تاجی

---

(1) د . م ، ل ١٨ .
(2) د . م ، ل ٢٩٥ .

پاشایەتیی کردووەتە سەر ، نەك هەر تاجەکەی لێ دەسەنێتەوەو بێ دەسەڵاتی دەکات ، بەڵکو لە ناویشی دەبات و سەری بە فەتارەت دەدات . ئەمە وای لە مەحوی کردووە دڵی بەم جۆرە خەڵات و پاشایەتییەی دنیا خۆش نەبێت و ، هەستدەکات هەرچەند لە لایەن دۆست و کەسانی دەوروبەریشەوە موبارەك بایی لێ بکرێت ، بەڵام ئەو خەڵاتەی دنیا لێی موبارەك نابێت ، چونکە کاتییەو دوای ماوەیەکی کەم و دوای ئەوەی گەیشتە ئەوەی بە تەواوی دڵی بەو خەڵاتەی دنیا خۆش ببێت ، ئەوا هەر لەلایەن خودی دنیاوە ئەو خەڵاتەی لێ دەسەنرێتەوە . بۆیەش دنیا دەتوانێت ئەم تاجی پاشایەتیە لە مرۆڤ بسەنێتەوە کە رەمزی گەورەیی و دەسەڵاتە ، چونکە خۆی داویەتی پێی و ئەو گەورەیی و دەسەڵاتەی لەو خەڵاتەوە دەبێتە خاوەنی ، لە خودی خۆیەوە سەرچاوەی نەگرتووە ، تا تەنها خۆی خاوەنی بێت و هیچ شتێك نەتوانێت لێی بسەنێت ، بەڵکو لە دنیاوە دەستی کەوتووە ، کە دەرەوەی خۆیەتی . دنیا بۆیە ئەمە دەکات بۆ ئەوەی مرۆڤ لە ریشەو بوونی رەسەنی خۆی دابېرێت و بیکاتە مەوجودێك لە مەوجودە دنیاییەکانی ناو خۆی . بەمە کەسەکە دەکەوێتە ژێر دەستییەوەو دەسەڵاتی بەسەردا پەیدا دەکات و هەر کاتێك ویستی بەرزی دەکاتەوەو هەر کاتێکیش ویستی نزمی دەکاتەوەو پشتی دەشکێنێت . هەر لەم روانگەوەیە مەحوی دەڵێت :

**ئەو مەسخەرەی زەمانە بە شاه و وەزیری کرد**

**ئەو کەتنە قەت مەڵێ بە گەداو فەقیری کرد**

**کلکێکی پێوە کرد و بەرەو ژووری ژووری برد**

**تێی هەڵدەدا شەقێك و سەرەو ژێری ژێری کرد**[1]

لێرەدا مەحوی باس لەوە دەکات کە زەمانەو دنیا مرۆڤ دەکەنە مەسخەرەو گاڵتەجاڕی خۆیان . لەمەشدا جیاوازی لە نێوان هیچ جۆرە مرۆڤێکدا ناکەن ، ئیتر ئەو مرۆڤە چ پاشاو وەزیر بێت چ گەداو فەقیر . مرۆڤ کردنە مەسخەرەش لەلایەن دنیاوە بەوە دەبێت ، ئەگەر مرۆڤەکە گەدا یاخود فەقیر بێت ، ئەوا دنیا بەرزی دەکاتەوەو دەیکاتە پاشا یان وەزیر ، بەم بەرز کردنەوەیە وا لە مرۆڤەکە دەکات بەتەواوی پێوەی خەریکبێت و تیایدا رۆبچێت و لەودا هەست بە بوونی خۆی بکات و خەریکی

---

(1) د. م ، ل ٣٣٦ .

بەدیهێنانی ئەم بوونە بێت . بەڵام لەبەرئەوەی ئەم بوونە بوونێکی ساختەیەو لە خودی کەسەکەوە سەرچاوەی نەگرتووەو لە لایەن دنیاوە پێی دراوە ، کەسەکە وەك مەوجودێك لە مەوجودە دنیاییەکانی لێ دێت و لە ژێر دەسەڵاتی دنیادا دەبێت . دوای ئەوەی دڵی بەم پاشایەتی و وەزیرییە خۆش دەبێت و هەستدەکات ئاسوودەیی و خۆشی لەمانەدایە ، دنیا شەقێکی تێ هەڵدەدات و دەسەڵات و وەزیری و پاشایەتییەکەی لێ دەسەنێتەوەو نزمی دەکاتەوەو دەیکاتە گاڵتەجاڕی خۆی . واتە بوونێك و پاشایەتییەك کە لە دنیاو زەمانەو چەرخەوە دەست مرۆڤ کەوتبێت ، تا سەر نییە . بۆیە دەبێت مرۆڤ خۆی لە زەمانە بپارێزێت ، چونکە هەوڵی لەناوبردنی دەدات . ئەوەتە بە روو وەرچەرخاندنێك چەندین پاشای لەناو بردووەو کۆتایی پێ هێناون :

**الحذر لەم چەرخی کەچبازە بە روو چەرخاندنێك**

**چەندە سوڵتان و شەهی کردو دەکا بێ دەست و مات[(١)]**

دنیاو چەرخی زەمانە بەرامبەر بە مرۆڤ بێ وەفان و کەچبازن ، واتە لەگەڵ مرۆڤ راست نین و مرۆڤ هەرچەند هەوڵ بدات بەرەو روویان بچێت و دەستیان پێوە بگرێت و سەردەم و دنیاو دەوروبەرەکەی بۆ خۆی لەبار بکات و ببێتە پاشا و سوڵتان و دەسەڵات پەیدا بکات و وای لێ بێت هەست بکات کە زەمانەو رۆژگار بۆ ئەم لەبارن و لەگەڵیدان ، بەڵام چەرخی زەمانە بە یەك روو چەرخاندن ئەو دنیا خۆشەو هەروەها دەسەڵات و پاشایەتییەکەی لێ تێك دەدات و لە ناوی دەبات . زۆر پاشاو فەرمانڕەوا هەبوون کە بەم دەردە چوون ؛ بۆیە مەحوی متمانە بە دنیا ناکات و دەڵێت :

**دنیایە کە دوو رۆژە نەوازش بکا ، سێیەم**

**ڕۆژی گودازشە ؛ ئەمەتە داکی سێبەڕۆ**

**ڕووترش و رووخۆشە لە رووێکا ، لەیەك دەما**

**قەهری درۆیە ، میهری درۆ ، هەردوو هەر درۆ**

**پشتی کە دا بە پشتەوە ، بۆ پشت شکاندنە**

**ئەمرۆ خودا شوکرتە ، سبەینێ براله رۆ[(٢)]**

---

(1) د . م ، ل ٥٨ .

(2) د . م ، ل ٢٥٤ .

دنیا ئەگەر دوو ڕۆژ ڕووت تێ بکات و بە دڵی تۆ بێت و گەورەت بکات ، ئەوا سێیەم ڕۆژ دەتتوێنێتەوەو لە ناوت دەبات . بۆیە دنیا بەهیچ جۆرێك جێی متمانە نییە ، چونکە دووڕووەو ئەو ڕووە خۆشەی کە پیشانت دەدات ، هەر بە ڕواڵەتەو لە حەقیقەتدا بەرامبەرت ڕووی ترشە . نە تووڕەبوونی جێی متمانەیە و نە خۆشەویستیی ، هەردووکیان درۆن و کە پشتی دا بە پشتتەوە بۆ ئەوە نییە پشتت بگرێت و نەهێڵێت پشتت لە زەوی بدرێ ، بەڵکو بۆ ئەوەیە کە هەستت کرد بووەتە پاڵپشتت و بێخەم بوویت ، لەو حاڵەتی بێخەمیەدا پشتت بەر بدات و پشتت بشکێنێت . بۆیە دەبێت پشت بە دنیا نەبەستیت و وا هەست نەکەیت دنیا پشتیوانتەو دەست بکەیت بە سوپاسگوزاری خوا کە دنیاو سەروەت و سامان و دەسەڵات و ماڵی دنیای پێ بەخشیویت چونکە هەر دوای ئەوەی دڵت بە دنیاو ئەو شتە دنیاییانە خۆش بوو کە دنیا پێی بەخشیویت ، هەموویت لێ دەسەنێتەوەو بێ پشت و پەنات دەکات و دەتخاتە بەرازۆ کردن . واتە ئیشی دنیا پێچەوانەیەو مەحوی لەبارەی ئەم پێچەوانەییەی ئیشی دنیاوە دەڵێت :

**وەکو دێو ئیشی عەکسە ، میهری قەهرە ، شەربەتی زەهرە**
**فریبە : گەنمی هەر جۆ ، شیری هەر دۆ ، ڕۆنی هەر پیوە** [1]

دنیا هەموو شتەکانی بە پێچەوانەوەیەو هەڵخەڵەتێنەرن و مرۆڤ لە خشتە دەبەن ، چونکە کە بەرامبەر کەسێك خۆشەویستیی پیشانداو شەربەتی پێشکەشکرد ، ئەوا ئەو خۆشەویستییەی بە ڕاست نییەو لە پشت ئەو خۆشەویستییەوە بەرامبەر ئەو کەسە ، پڕە لە قەهرو تووڕەیی و ئەو شەربەتە هەر بەڕواڵەت وا دیارە شەربەتە ، ئەگینا لە ڕاستیدا ژەهرەو بۆ ئەوە دەیدات بەو کەسە تا بیکوژێت و لە ناوی ببات . شتەکانیشی هەمووی هەڵخەڵەتێنەرن و تەنها بە ڕووکەش جوان و ڕازاوەو شادی بەخشن و لە جوانی و ڕازاوەیی و شادیی ڕاستەقینە بێبەشن و وەك ئەوەیە بە گەنم کولێرە چەورەت بۆ بکات و لەگەڵ شیردا بتداتێ ، کەچی کاتێك سەیر دەکەیت کولێرەکە لە جۆ دروستکراوەو لە جیاتی ڕۆن بە پیو چەورکراوەو لە جیاتی شیریش دۆی داوە پێت . واتە شتەکانی دنیا لە ڕواڵەتدا جوان و خۆش و چێژبەخش دیارن ، کەچی لە ناوەڕۆکدا وانین و ڕێك پێچەوانەی ڕواڵەتەکەیانن . بۆیە مەحوی کە

---

(1) د. م ، ل ٢٨٩ .

هەستدەكات دنيا بەمجۆرەيەو جيى متمانەو باوەڕ نييە ، پێی وایە دەبێت مرۆڤ لە بەرامبەر دنیادا بە ئاگا بێتەوەو دڵی پێی خۆش نەبێت ، بۆیە لەم بارەیەوە دەڵێت :

**گەر لە دنیا چاكەیێ صادر بوو تەفرەی پیێ نەخۆی**
**ڕووسپی هەر ڕوو ڕەشە گەر بیێ صەد ئازایی بكا**(1)

لێرەدا مەحوی بە تەواوی دنیای بۆ دەركەوتووەو ناسیویەتی و دەزانێت كە مرۆڤ لە خشتە دەبات . بۆیە هەستدەكات ئەگەر دنیا بەرامبەری چاكەیەكی لێ وەشایەوەو كردیە خاوەنی سەروەت و سامان ، یان پلەو پایەو دەسەڵات ، دەبێت ئاگای لە خۆی بێت و لە خشتە نەچێت و لە خۆی دانەبڕێت و ڕوونەكاتە دنیاو بەخششەكانی ، چونكە دنیا ئەوەندە تەفرەی مرۆڤی داوەو مرۆڤی بەرز كردووەتەوەو دوایی نزمی كردووەتەوەو لەناوی بردووە ، متمانەی نەماوەو بە نسبەت مەحوییەوە وەك ڕووڕەشێك وایە . ڕووڕەشیش گەر سەد چاكەو ئازایی بنوێنێت و بیەوێت بەمە لای مەحوی خۆی خۆشەویست بكات و ببێتە ڕووسپی ، لای مەحوی هەر ڕووڕەشەو چاكەو ئازاییەكانی هیچ بەهایەكیان نییەو بۆ ئەوە دەیاننوێنێت تا بەهۆیانەوە مەحوی لە خشتە ببات و لە بوونی ڕەسەنی خۆی دابیبڕێت و بەرەو ئەو (واتە دنیا) بچێت ، كە بەرەو ڕووی چوو ، لە دوای ئەوەی ماوەیەكی كەم دەیكاتە جێگەی بایەخ و بەرزی دەكاتەوە ، بەدەردی پاشاو دەسەڵاتدارەكانی پێش ئەمی دەبات و پشتی دەشكێنێت و دەیدات لە زەوی و دەیكاتە گاڵتەجاڕی خۆی . بۆیە مەحوی بە چاكەكانی تەفرە ناخوات و هەر بە ڕووڕەشێكی دەزانێت كە جێگەی متمانە نییەو شایەنی ئەوە نییە مرۆڤ بایەخی پیێ بدات و بەرەو ڕووی بچێت ، چونكە مرۆڤ بەرەو ڕووی شتێك دەچێت و هەوڵی بەدەستهێنانی دەدات ، كە بەلایەوە بەنرخ بێت و بەهایەكی هەبێت و ئەوە بهێنێت خۆی پێوە ماندوو بكات . بەڵام دنیا لەبەرئەوەی بەرامبەر مرۆڤ بێوەفایەو مرۆڤ لە بوونی ڕەسەنی خۆی دادەبڕێت ، ئەوا بەلای مەحوییەوە هیچە . شتێكیش هیچ بێت ئەوە ناهێنێت مرۆڤ خۆی بۆ ماندوو بكات و پێوەی خەریك ببێت ، بۆیە دەڵێت :

---

(1) د. م ، ل ١٧ .

**دنیا کە هیچە جوملە دەزانن ، کەچی چ کەس**
**مەردانە بۆ خودا نییە دەست هەڵگرێ لە هیچ[1]**

مەحوی هەستدەکات خەڵکی و کەسانی تریش وەك ئەم چاو و گوێ و هەست و هۆش و بیرو ژیرییان هەیەو ، بینیویانەو بیستوویانەو هەروەها خۆشیان ئەوەیان بۆ دەرکەوتووە کە دنیا هیچ و بێ بایەخە ، کەچی سەرەڕای ئەمە دەست لە دنیا هەڵ ناگرن و هەر پێوەی خەریك دەبن و هەوڵی بەدەستهێنانی دەدەن و تیایدا رۆ دەچن و لە پێناویدا واز لە بوونی رەسەنی خۆیان دەهێنن . لێرەدا مەحوی سەری سوڕماوە لەم هەوڵدانەی خەڵك بۆ بەدەستهێنانی دنیا . بەڵام دواتر دەگاتە ئەوەی کە راستە ئەو خەڵکە چاو و گوێ و هەست و عەقڵیان هەیە ، بەڵام بەهۆی دابڕانیان لە بوونی رەسەن و مرۆڤانەی خۆیان و خەریکبوونیان بە دنیاوە ، چاویان راستی نابینێت و گوێشیان نابیستێت و عەقڵیشیان دەرکی حەقیقەت ناکات . بەمەش ئەم جۆرە کەسانە کە هەر بە دنیاوە خەریکن ، دەبنە ئەهلی دنیاو کەسی دنیایی و وەك دنیا هیچ دەبن ، هەر لەم روانگەوەیە مەحوی دەڵێت :

**دنیا بە کامی هیچ کەسانە هەمیشە دەم**
**هیچ ئەڵبەتە بەهیچ دەمێ نابڕێ لە هیچ[2]**

لێرەدا مەحوی کە سەیری دنیای کردووەو بیری لێ کردووەتەوە ، ئەوەی بۆ دەرکەوتووە دنیا بە ئارەزووی ئەوانەیە کە (هیچ کەس)ن . واتە هەر بەناو کەس یاخود مرۆڤن و لە ناوەڕۆکدا هیچ نین و وەك هەر مەوجودێکی تری دنیایی وان و لە خودی خۆیاندا هیچیان لەباردا نییەو تەنها گرنگی بە دنیا دەدەن و پێوەی خەریکن . بەمەش بە تەواوی لە بوونی مرۆڤانەو رەسەنی خۆیان دادەبڕێن . دنیاش بە کەیفی ئەوان دەبێت و ژیانێکی بێ ناوەڕۆك و پڕ لە بەزم و سەفایان بۆ فەراهەم دەکات . لەم بارەدا ، ئەم جۆرە لە مرۆڤ ، بەلای مەحوییەوە هیچن و پێشتریش دەرکی بەوە کردووە کە دنیا هیچە ، لێرەدا دەرك بەو راستییە دەکات دنیا بۆیە بە کەیفی ئەم جۆرە کەسانەیە و دەیانکات بە شت ، چونکە ئەوانیش وەك خۆی هیچن و هیچ لەگەڵ هیچی لێ خۆش دێت و دەیەوێت لێی دانەبڕێت . هیچیی دنیاو هەروەها هیچیی ئەو کەسانەش کەبە دنیاوە خەریکن لەم دێڕەدا زیاتر روون دەبێتەوە کە دەڵێت :

---

(1) د. م ، ل ٩٨ .

(2) د. م ، ل ٩٨ .

دنیا همه هیچ است ، ولی هیچ تر از وی

ماییم ، که در باختهایم این همه با هیچ[1]

واتــه : دنیــا هیــچه ، بـەڵام لـەو هیـچتر ئێمـەین ، کـه ئـەم هـەمووەمان دۆڕاندووه و له دەستمان داوه لەبەرئـەوەی کـه لەگـەڵ دنیـادابن ، یـاخود لـەو هیـچتر ئێمەین کەئەوەنده لەسەر هیچ(مەبەستی دنیایه) شەڕ دەکەین . مەبەستی ئەوەیه دنیا هیچه ، بەڵام له دنیا هیچتر ئەو جۆره کەسانەن که له پێناو دنیاو بەدەستهێنانی شتی دنیایی وەك پارەو سامان و دەسەڵات و موڵکدا شـەڕ دەکـەن و یـەکتر لـەناو دەبـەن . مـرۆ[redacted] و بوونی مرۆڤ زۆر له دنیا بـه بـەهاو پایـەدارترن و نابێـت لـه پێنـاو دنیـادا لـەناو ببرێن ، چونکه دنیا لای مەحوی ئەوەنـده بـێ بەهایـه کـه نرخـی مـورووه کەرانەیـەکی هەیەو نابێت مرۆڤ تەمەنی خۆی له پێناو دنیادا سەرف بکات و دەڵێت :

میثالی وایه بەحرێ گەوهەری دابێ به خەرموهرێك

لـه بـۆ دنـیـا ئـەوی عومری عەزیزی کردووه ضایع[2]

لێرەدا مەحوی تەمەنی مرۆڤی به بەحرێك گەوهەر چواندووەو ئەو تەمەنـه زۆر به عەزیز دەزانێت . ئەمـەش مانـای وایـه تەمـەن و ژیـان لای مـەحوی زۆر بـه بایـەخ و گرانبەهان و هیچ شتێکی ئەم دنیایەو تەنانەت خودی دنیاش پێی ناگەن . بۆیـه نابێـت مرۆڤ ئەو تەمەنه عەزیزەی خۆی ، له پێناو دنیادا بەسەر ببـات ، چـونکه بەسـەربردنی تەمەن و ژیان له پێناو دنیادا ، به فیڕۆدانی تەمـەن و ژیانـەو وەك ئـەوه وایـه بـەحرێك گەوهـەر بگۆڕرێتـەوه بـه مـورووه کەرانەیـەك . بێگومـان ئـەم مامەڵەیـه بـەلای مرۆڤـی تێگەیشتووەوه مامەڵەیەکی نادروستەو دەبێت ئەو بەحره گەوهەره لـه پێنـاو شتێکدا خەرج بکرێت که زۆر له دنیاو شته دنیاییەکان به قیمەتتر بێت و به دەسـتکەوتنی ئـەو شته ، مرۆڤ بەها پەیدا بکات و هەست به خۆی بکات .

بەم پێیه به گشتی دنیا لای مەحوی هیچه ، که دنیا خۆی هیچ بێت ، ئەوا ئەو شتانەش که دنیا به مرۆڤیان دەبەخشێت له دنیا هیچترن . بۆیه نابێت مرۆڤ بۆ دەستکەوتنی شتی دنیایی خۆی منەتباری دنیا بکات ، هەر بۆیه دەڵێت :

بەخششی دنیا مەخۆ ، یەعنی به نانێکی جۆ

خـۆ مـەکـەره بـەر مـنـەت پـیـره ژنی نانەوا[3]

(1) د. م ، ل ٤٩٠ .

(2) د. م ، ل ١٦٥ .

(3) د. م ، ل ٣٧ .

دنیا وەك پیرەژنێكە كە نانەوا بێت ، بەخششەكەشی وەك نانێك وایە .
مەحوی هەستدەكات ئەگەر مرۆڤ بەهۆی بایەخدانی بە بوونی رەسەنی خۆی و رووكردنە ئەو بوونەی ، لە دنیا داببڕێت و هیچ پەیوەندیەكی بە دنیاوە نەمێنێت ، ئەم دابڕانەش ببێتە هۆی ئەوەی نەداری و برسیەتی رووی تێ بكەن و لەم حاڵەتی برسیەتیەدا پیرەژنی نانەوا (دنیا) نانێكی پێ بدات بۆ ئەوەی لە برسا نەمرێت ، ئەوا مەحوی پێی وایە دەبێت ئەگەر لە برساندا بشمرێت ئەو نانەی دنیا قبوڵ نەكات و لێی وەرنەگرێت و خۆی منەتباری دنیا نەكات . واتە ئەوە هەڵدەبژێرێت لەگەڵ بوونی رەسەنی خۆیدا بێت و لە پێناویدا بمرێت ، نەك بۆ نانێك رووبكاتە دنیاو منەتباری دنیا ببێت ، چونكە بەم منەتباربوونەی بۆ دنیا ، دەبێتە كۆیلەی دنیاو بوونی رەسەن و راستەقینەو مرۆڤانەی خۆی لەدەست دەدات . تەنانەت پێی وایە نابێت بۆ پاروە نانێك روو بكاتە دنیا و ئەو پارەیەشی نەوێت كە دەبێتە هۆی دەستخستنی ئەو پاروە نانەو دەڵێت :

**بۆ پارە حەیفە خۆ دەكەیە پولی ناڕەواج**
**بۆ پارۆێكی نان ئەسەفە روو دەكەی بە ساج**[1]

مەحوی پێی وایە ئەگەر مرۆڤ لە بوونی رەسەن و مرۆڤانەی خۆی دابڕێت ، ئەوا روو لە دنیاو بەدەستهێنانی شتی دنیایی وەك پارەو سامان و... هتد دەكات و لە پێناو بەدەستهێنانی پارەدا ئامادەی ئەنجامدانی هەموو كارێكی ناپەسەندو نامەشروع دەبێت . پارە لە ئەسڵدا شتێكی بێ بەهایە و مرۆڤ نرخ و بەهای پێ دەدات . بەڵام كە مرۆڤ لە پێناو پارەدا خۆی بێ بەها كرد ، ئەوا ئەو پارەیەش كە بەدەستی دەهێنێت بێ بەها دەبێت و بەهۆی بوونی ئەو پارەیەوە كەسەكە نابێتە كەسێكی (هەبوو) ، بەڵكو دەبێتە كەسێكی بێ بەها ، یاخود مەحوی گوتەنی دەبێتە (پوولی ناڕەواج) . بەهەمانشێوە كەسێكیش لە پێناو ناندا سەر بۆ ئەو دنیایە شۆڕ بكات كە بەلای مەحوییەوە رووڕەشە ، ئەوا ئەو كەسەش وەك دنیا رووی رەش دەبێت . مەحوی هەستدەكات مرۆڤ زۆر لە دنیا گەورەو بە بەهاترەو بەلایەوە حەیفە مرۆڤ لە پێناو ناندا وەك ئەو ساجەی كە نانەكەی پێ دەكرێت ، خۆی رووڕەش بكات . جگە لەمە ، مەحوی هەستدەكات نابێت مرۆڤ لە پێناو دنیاو خۆشی و رابواردنی دنیادا بژی و دەڵێت :

---

(1) د. م ، ل ٩٢.

**چییه؟ خوسران ئەمەندە مەستی لەهو و لەعبی دنیا بوون**

**بـرا ! عـومـری گـیـرامی بـەس لە رێی ئەم بادە بەربادە**[1]

مەحوی هەستدەکات مادەم دنیا هیچە ، خۆشی و شادی و رابواردنەکانیشی وەك خۆی هیچن و کاتی و راگوزەرن و خۆشی و شادییەکی قوولْ و راستەقینە نین و مرۆڤ مەست و بێئاگا دەکەن و لە بوونی رەسەنی خۆی دایدەبڕن . بۆیە ئەوەی تەمەنی عەزیزو بە نرخی خۆی لە پێناو دنیاو خۆشی و رابواردنەکانیدا خەرج بکات کە وەك بادە مرۆڤ مەست دەکەن ، ئەوا کەسێکی دۆڕاوە . واتە تەمەنی خۆی کە زۆر بە بەهایە دۆڕاندووەو لە بەرامبەریدا خۆشی و رابواردنێکی کاتی و راگوزەری دەستکەوتووە . مەحوی پێی وایە نابێت مرۆڤ تەمەنی خۆی لە پێناو خۆشی و رابواردن و (لەهو و لەعبی) دنیادا سەرف بکات و دەبێت ئاگای لەو تەمەنەی خۆی بێت و بزانێت چۆن و لە پێناو چیدا بەسەری دەبات .

## بێزاری و وازهێنان لە دنیا لای مەحوی

مەحوی کە ئەوەی بۆی دەردەکەوێت دنیا هیچەو شتە دنیاییەکانی وەك (پارەو سامان و دەسەلاَت و ...هتد.)یش وەك دنیا خۆی هیچن . لە دنیا بێزار دەبێت و هەستدەکات دەبێت وازی لێ بهێنێت و دەڵێت :

**تاسەر نەبۆتە گۆ دە لە دنیا دە تۆ شەقێ**

**هەر ئەو شەقە بەکارە کەوا هەڵدرێ لە هیچ**[2]

مەحوی هەستدەکات تا بەدەست دنیاوە سەری نەبۆتە گۆو وای لێ نەهاتووە کە دنیا بە ئارەزووی خۆی یاریی پێ بکات و بیکاتە گاڵتەجاڕی خۆی ، دەبێت دەستی خۆی پێش بخات و چیتر بە دنیاوە نەبەسترێتەوەو شەقێکی تێهەڵبدات . ئەم شەقەش کە لە دنیای هەڵدەدات شەقێکی بەکارە ، چونکە وەشاندنەکەی لە جێی خۆیدایەو ئەو مەبەستە دەپێکێت کە لە وەشاندنەکەیدایەو لە شتێك هەڵدراوە کە هیچەو دەبێت لێی دوور بکەوێتەوەو پێی هەڵنەخەڵەتێت ، چونکە دنیا هەرچەند لە رواڵەتدا رازاوەو دڵگیر خۆی پێشانی مرۆڤ دەدات و دەیەوێت مرۆڤ بەرەو خۆی رابکێشێت ، بەلاَم بەلای مەحوییەوە لە لاکە تۆپیوێك بەولاوە نییە ، بۆیە دەڵێت :

---

(1) د. م ، ل ٢٦٨ .

(2) د. م ، ل ٩٨.

## دەزانی جیفەیە دنیا دە حەیفە
## وەکو سەگ ئەم شەڕو شۆڕە لەسەر لاك[1]

مەحوی کە سەیری خەڵکی کردووەو بینیویەتی لەبری ئەوەی بە دوای بوونی خۆیاندا بگەڕێن و لەو بوونەیانەوە بەرەو دنیا بچن و دنیا بۆ خزمەتی ئەو بوونەیان کە پڕە لە جوانی و گەورەیی و زیندوویەتی بەکار بهێنن ، وازیان لە بوونی خۆیان هێناوەو لەبیریان کردووەو بەدنیاوە خەریکبوون ، کە لەچاو ئەو بوونە رەسەن و پڕ زیندوویەتییەی خۆیاندا وەك لاکە تۆپیو وایە . مەحوی پێی وایە ئەگەر مرۆڤ خۆی لە راستی لانەدات ، ئەوا چاك دەزانێت کە دنیا وەك لاکە تۆپیو وایە ، کەچی سەرەڕای ئەم راستیە ، مرۆڤ لە سیفەتی مرۆڤانەی خۆی دەردەچێت و وەك سەگ لەسەر لاکە تۆپیوی دنیا شەڕو شۆڕ دەکات و هەوڵی بەدەستهێنانی دەدات . مەحوی ئەم هەوڵدان و ماندووبوونەی مرۆڤی لە پێناو دنیادا بەلاوە حەیفەو هەستدەکات هەوڵدان و ماندوو بوونێکی پووچ و بێ مایەیە ، بۆیە روو دەکاتە خواو دەڵێت :

## خودا تۆ لاگری لەو لاکە (مەحوی )
## بە جاهی پادشاهی تەختی (لولاك)[2]

مەحوی ئەگەر نەیتوانی ئەو هەڵوێستەی پێغەمبەر لە بەرامبەر دنیا وەرگرێت کە وازی لە دنیا هێنا بوو و بە شتێکی کەمی دەزانی و ، بەمە بووبووە کەسێك کە لە دنیاو شتەکانی دنیا بەرزو بەرێزتر بوو و پلەو پایەیەکی بەرزی بۆخۆی بەدەستهێنا بوو . داوا لە خوا دەکات لەبەر خاتری ئەو پێغەمبەرە پایەبەرزە کە دنیاو گەردوونی لەبەر خاتری ئەو دروستکردووە ، لەو دنیایە دووری بخاتەوە کە وەك لاك وایە ، چونکە بە دوورکەوتنەوەی لە دنیا ، بەرەو بوونی رەسەنی خۆی دەچێت و گەیشتن بەو بوونە بە ئەوپەڕی پایەبەرزی و گەورەیی دەزانێت . بەڵام ئەگەر بێت و بەرەو ئەم بوونەی نەچێت و روو بکاتە دنیاو بەرەو دنیا بچێت ، ئەوا دنیا هەر ماوەیەکی کەم وەری دەگرێت و دوایی دەری دەکات . بۆیە هەستدەکات دەبێت ئاگای لە خۆی بێت و نەهێڵێت بەر ئەم دەرکردنەی دنیا بکەوێت ، چونکە ئەمە وەك ئەوە وایە لە جیاتی ئەوەی ئەم شەق لە دنیا هەڵبدات (وەك پێشتر باسکرا) ئەوا دنیا شەقی لەم هەڵداوەو دەری کردووە ، بۆیە دەڵێت :

---

(1) د. م ، ل ١٨٧.

(2) د. م ، ل ١٨٧ .

**تا لە ماڵی دەر نەکردووی ئەم شەوی صەد شوو کەرە**

**(مەحوی) ئازانە بدە تۆ سێ بە سێ دنیا تەڵاق**[1]

لەناو کۆمەڵگەو خەڵکدا وا باوە ئەو ئافرەتەی ژمارەیەکی زۆر شوو بکات ، مانای ئەوەیە هیچکام لەو پیاوانەی شووی پێ کردوون ، پێی رازی نەبوون و بەکەمیان زانیوە ، بۆیە تەڵاقیان داوەو لە ماڵی خۆیان دەریان کردووە . بەڵام بە نسبەت شووکردنی دنیاوە ئەم مەسەلەیە بە جۆرێکی ترە ، کە دنیا شەوی سەد شوو دەکات ، لەبەرئەوە نییە ئەوکەسانەی کە شووی پێکردوون بە کەمیان زانیووەو دەریان کردووە ، بەڵکو ئەمە ئیشی دنیایە کە بە چێژو خۆشییەکی کاتیی لە سەروەت و سامان و دەسەڵاتدا ، مرۆڤ بەرەو خۆی رادەکێشێت و بە خۆیەوە سەرقاڵی دەکات و دەیکاتە ئەهلی خۆی ، دواتر وازی لێ دێنێت و لە ماڵی خۆی دەری دەکات و دەیکاتە کەسێکی بێ قیمەت . سروشتی دنیا وایە کە مرۆڤ بێ قیمەت یاخوود مەحوی گووتەنی ترۆ دەکات ، بۆیە دەبێت مرۆڤ وازی لێ بهێنێت و نەهێڵێت دنیا ترۆی بکات و دەڵێت :

**دنیا تیاترۆیە مەوەستە تیا برۆ**

**کێ مایەوە تیا کە نەبووبێ تیا ترۆ**[2]

لێرەدا مەحوی بە تەواوی مەوقیعی مرۆڤی لە دنیادا بۆ دەرکەوتووەو هەستدەکات مانەوەی مرۆڤ لە دنیاداو خەریکبوون پێوەی ، دەبێتە مایەی ترۆ بوونی مرۆڤ . بۆیە مرۆڤ بۆ ئەوەی لە دنیادا ترۆ نەبێت ، دەبێت لە دنیادا نەمێنێتەوەو بڕوات . مەبەستی لەم رۆیشتنەش ئەوە نییە ئەو کەسە تەمەنای مردن بکات ،بۆ ئەوەی لە دنیادا نەمێنێت و بڕوات ، بەڵکو مەبەستی ئەوەیە مرۆڤ با بەجەستەش لە دنیادا بێت و تیایدا بژی ، بەڵام دەبێت لە ناوەوەیدا خۆی لە دنیا دابڕیبێت و تیایدا نەمابێت و بەرەو بوونی خۆی چوو بێت ، واتە ئەو رۆیشتن و دەرچوونەی لە دنیا ، بۆ ئەوە بێت بەرەو بوونی خۆی بچێت ، نەك بەرەو مەرگ . ئیتر لێرەدا مەحوی دەگاتە ئەوەی کە ئەم دنیایە وێرانەیەو نابێت لەو وێرانەیەدا نیشتەجێ ببێت و دەڵێت :

**مەحویا : بازێکی تۆ قودس ئاشیان**

**بوونە بوومی شوومی ئەم وێرانە بۆچ**[3]

---

(1) د. م ، ل ١٨٠.

(2) د. م ، ل ٢٥٣.

(3) د. م ، ل ٩٧.

مـەحوی مرۆڤێکـە بازئاسـا نـەفس بـەرزەو هەسـتدەکات ئـەو شـوێنەی کـە نشینگەی ئەمە شوێنێکی بەرزو پیرۆزەو دەبێت هەر چاوی لـەو شـوێنە بـەرزو پـیرۆزە بێت و ، وەك کوندەپەپوو دنیا نەکاتە نـشینگەی خـۆی کـە لەچـاو ئـەو شـوێنە بـەرزو پیرۆزەی خۆیدا وەك وێرانەیەك وایەو هیچ ئاوەدانی و گەشەکردنێکی تێدا نییـە . ئـەو شـوێنـە بەرزو پیرۆزەشی بەوە دەست دەکەوێت واز لە دنیاو شـتی دنیـایی بهێنێـت و بەرەو بوونی رەسەنی خۆی بچێت .

بەمجۆرە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت مـەحوی لـە دنیـاو شـتی دنیـایی بێـزارەو لێیان دوور دەکەوێتەوەو سەرئەنجام وازیان لێ دێنێت . ئەم بێزاریەشی لە دنیا لەوەوە سەرچاوەی نەگرتووە کە کەسێکی مەرگدۆستەو حـەز لـە ژیـان ناکـات ، بۆیـە لـە دنیـا بێزارە ، بە پێـچەوانەوە مـەحوی تـا ئەوپـەڕی ژیاندۆسـتی ژیاندۆسـتەو حـەز بـە ژیـان دەکات . بەڵام ژیانی بـە بـوونی رەسـەنی خۆیـەوە دەوێـت و دەیـەوێت لـە پێنـاو ئـەو بوونەیدا بژی و بەدیی بهێنێت ، نەك لە پێناو دنیاو شتی دنیـایی وەك پـارەو سامان و دەسەڵات و پلەو پایەی ئـاییـنی و کۆمەڵایەتیـدا بـژی و پێیانـەوە خـەریکبێت و هـەوڵی بەدەستهێنانیان بدات و تەمەنی خۆی لە پێناویاندا خـەرج بکـات . کەواتـە بێزاربـوونی مەحوی لە دنیاو شتی دنیـایی لـەوەوە سەرچـاوەی گرتـووە کـە ئەوانـە لەچـاو بـوونی مرۆڤدا زۆر بێ بایەخن و ئەوە ناهێنن مـرۆڤ لـە پێنـاو بەدەسـتهێنانیاندا واز لـە بـوونی رەسەنی خۆی بهێنێت . بـە پێـچەوانەوە ، بـوونی رەسـەنی مـرۆڤ ئـەوە دەهێنێـت لـە پێناویدا واز لە دنیاو شتی دنیایی (واتە واز لە مەوجود) بهێنێت . بەم وازهێنانەی مرۆڤ لە دنیاو شتی دنیایی یاخود لـە مـەوجود ، مـەوجودیش لێـی دەکـشێتەوەو دەکەوێتـە حاڵەتی (عەدەم)ەوە .

## (عەدەم) لە شیعری مەحویدا

مەحوی لە ساتێك لە ساتەکاندا بیر لەو کاتەی خۆی دەکاتەوە کە بـە دنیـاوە خەریکبووە ، هەروەها بیر لەو خەڵکەش دەکاتـەوە کـە بـە دنیـاوە خـەریکن و تیایـدا رۆچوون و دەڵێت :

ئـەم خـەڵقـە کـەوا تـێگەییون گەیونە مەقصوود
ڕێشگاوییەکی مەحضە بە دەردی من و تۆ چوون[1]

(1) د. م ، ل ٢٤٤ .

ئەو خەڵكەی كە بە دنیاوە خەریكن و دڵیان بەو پارەو سامان و دەسەڵاتە خۆشە كە بەدەستیان هێناوەو وا دەزانن بە مەبەست گەیشتوون ، بەلای مەحوییەوە لە خەیاڵ پلاویدان و نەك هەر بە مەبەست نەگەیشتوون ، بەڵكو بە رۆچوونیان لە دنیاو شتی دنیایی وەك پارەو سامان و دەسەڵاتدا ، لە بوونی رەسەنی خۆیان دابڕاون و لە دەست دەرچوون و بە دەردی ئەم چوون كە بە دنیاوە خەریكەو لە پارەو سامان و دەسەڵاتی ئایینی و كۆمەڵایەتیدا رۆچووەو لە بوونی رەسەنی خۆی دابڕاوە . مەحوی مەستدەكات گەیینە مەبەست ئەوەیە بە بوونی رەسەنی خۆی بگات ، كەچی ناتوانێت پێی بگات و دەڵێت :

**بۆ جیلوەی بێچوونی نیە قووەتی چوونم**

**(لا حول ولا قوة) كە من حەولمە بۆ چوون**[1]

مەحوی دەیەوێت بە جیلوەی بێ هاوتای (یار - بوون) بگات و بەرەو رووی بچێت ، بەلام توانای چوونی نییەو سەریشی لەوە سوڕماوە كە لەگەڵ ئەم بێ تواناییەشدا كەچی هەر هەوڵی چوون دەدات . ئەمەش مانای ئەوەیە شتێك لە ناوەوەیدا بەرەو (یار - بوون) رای دەكێشێت ، بێ تواناییشی لە بەرامبەر ئەوەدا كە بەرەو (یار - بوون) بچێت و پێی بگات لەوەوەیە كە بە دنیاو شتی دنیاییەوە خەریكەو ئەوانە بوونەتە جێی مەبەستی ، بۆیە بەوانەوە بەستراوەتەوەو ناتوانێت بەرەو (یار - بوون) بچێت ، واتە مەوجود (كە بریتییە لە دنیاو شتی دنیایی) وای لێ كردووە بەرەو بوونی خۆی نەچێت . تا وازیش لە مەوجود نەهێنێت و نەكەوێتە (عەدەم)ەوە ناتوانێت بەرەو (یار - بوون) بچێت ، بۆیە دەڵێت :

**بێ چوونە عەدەم پەی بە سۆراغی دەمی نابەی**

**فایز ببە بەم گەوهەرە لەو بەحرە بە رۆ چوون**[2]

مەحوی دەركی بەوە كردووە بێ كەوتنە عەدەم ، پەی بە یار نابات (مەحوی لێرەدا تەنها باسی دەمی یار دەكات كە پەیی پێ نابات) . عەدەم وەك دەریایەكەو (یار - بوون)یش وەك گەوهەرێكە كە لە ناو ئەو دەریایەدایە ، چوونە عەدەمیش بەوە دەبێت واز لە دنیاو شتی دنیایی بهێنێت و پێوەیان خەریك نەبێت و بە تەواوی لێیان دابڕێت . مەحویش ، وەك پێشتر باسكراوە ، دوای ئەوەی بۆی دەردەكەوێت دنیاو

---

(1) د. م ، ل ٢٤٤ .

(2) د. م ، ل ٢٤٤.

شتی دنیایی هیچن ، هەوڵی بەدەستهێنانیان نادات و وازیان لێ دێنێت . کاتێك ئەم واز لە دنیاو شتی دنیایی دێنێت و هەوڵی بەدەستهێنانیان نادات ، دنیاو شتی دنیاییش لێی دەکشێنەوە (کە ئەمەش وەك کشانەوەی مەوجودە لە مرۆڤ لای هایدگەر ) ، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی لای خەڵکیش بوونی نەمێنێت و کەسانی دەورو بەریشی لێی بکشێنەوەو بایەخی پێنەدەن:

**گەر لە تۆ دنیا بەری بوو ، قەوم و خوێشت لێ بەرین**

**گەر بەراتی بوو هەموو عالەم بووە باب و برات[1]**

بەدەستهێنانی دنیاو شتی دنیایی وەك پارەو سامان و دەسەڵات دەبنە هۆی ئەوەی نەك هەر خزم و کەسوکار و ناسیاو لێت نزیك ببنەوە ، بەڵکو کەسانی بێگانەش هەوڵ دەدەن خۆیان بکەن بە کەسێکی نزیك لێت . بەڵام ئەگەر مرۆڤ وازی لە دنیاو سەروەت و سامان و ...هتد هێنا ، ئەوا ئەوانیش لێی دەکشێنەوە . بەم کشانەوەیەی دنیاش ، هەموو کەس و تەنانەت خزمەکانیشی ، هیچ حسابێکی بۆ ناکەن و خۆیانی لێ دوور دەخەنەوە . بە کشانەوەی هەموو ئەمانەش لەمەحوی کە پێشتر وەك پاڵپشتێك وابوون بۆی ، دەکەوێتە حاڵەتی عەدەمەوەو بێ پاڵپشت دەمێنێتەوەو تەنیا دەکەوێت ، بۆیە دەڵێت :

**چ خاکێ کەم بەسەرما مامەوە تاك**

**بە لێو ئاه و ، بەچاو ئەشك ، بەسەر خاك[2]**

لێرەدا مەحوی بە تەواوی هەست بەوە دەکات کە بە تەنیا ماوەتەوەو لە هەموو شتێك و هەموو کەسێك دابڕاوە . ئەم تەنیاییە وای لێ کردووە بە لێو ئاه و هەناسە هەڵکێشێت و بەچاو فرمێسکی غەمباری بڕێژێت و بەسەر قووڕ بپێوێت . واتە ئەم تەنیاییە بەلایەوە قورسەو بە تەواوی غەمبارو نائارامی کردووەو ژیان و گوزەرانی ناخۆش کردووە . کەچی سەرەڕای ئەم هەموو ناخۆشی و ناڕەحەتییە ، هەر بەرگەی ئەم تەنیاییەی گرتووەو رووی لە پارەو سامان و پلەو پایەی ئایینی و کۆمەڵایەتی نەکردووەتەوە . واتە بەرەو مەوجود نەچووەتەوەو چاوەڕوانی ئەوەیە دوای وازهێنانی لە مەوجود ، (یار - بوون) دەربکەوێت . بۆیە هەستدەکات دەبێت هەر لە عەدەمدا بمێنێتەوەو دەڵێت :

---

(1) د.م ، ل٥٧ .

(2) د. م ، ل ١٨٥ .

**مەگەر شاری عەدەم جێی وا تیا سەرگەشتە بم قاتە**

**بیابانە بەشی مەجنوونە ، خاصی کۆهکەن کێوە**[1]

مەجنوون دوای ئەوەی لە پێناو یاردا دەستی لە پارەو سامان و... هتد هەڵگرت ، وازی لە ئاوەدانیش هێناو رووی کردە بیابان . لێرەدا بیابان وەك مەوجودێك ئامادەیی هەیەو مەجنوون پێوەی پابەندەو تیایدایە ، جگە لەوەی کە لەیلاش وەك مەوجودێکی مرۆیی لای مەجنوون بوونی هەیە . فەرهادیش بە هەمانشێوە ، کێو وەك مەوجودێك و شیرین وەك مەوجودێکی مرۆیی بوونیان هەبوو لای . بەڵام مەحوی لەوان واوەتر دەڕوات و واز لە گشت مەوجودێك دێنێت و دەچێتە شاری عەدەمەوە ، چونکە لەعەدەمدا لە هەستکردن بە بوون لەوانی ترو دنیاو شتی دنیایی دادەبڕێت و تەنها چاوەڕوانی دەرکەوتنی (یار ـ بوون) دەبێت ، (یار ـ بوون)یش لەم حاڵەتی عەدەمەدا دەردەکەوێت . بەڵام وەك یارێکی عەینی دەرناکەوێت و کێشەی مەحوی ئەوەیە چاوەڕوانە (یار ـ بوون) وەك یارێکی عەینی دەربکەوێت ، بۆیە دەڵێت :

**ماچی دەمی لە کەڵکەڵەما بوو ، چ خۆشی وت :**

**قرم ، ئەی ئەسیری واهیمە ، خۆش ناکرێ لە هیچ**[2]

لێرەدا مەحوی وەك یارێکی بەرچاو و دەرەکی و دیار ، لە (یار ـ بوون) دەڕوانێت و مرخی لەوە خۆش کردووە کە یار دەرکەوت دەمی ماچ بکات ، بۆئەوەی ئەو ماچەی دەمی یار بۆی ببێتە ئاوی حەیات و زیندوویەتی و نەمریی پێ ببەخشێت . (یار ـ بوون)یش کە هەست بەم حاڵەتەی مەحوی دەکات ئەوە بە مەحوی دەڵێت کە کەوتووەتە وەهمەوە ، چونکە ئەم (واتە یار) وەك یارێکی بەرجەستەو عەینی دەر ناکەوێت ، تا مەحوی دەمی ماچ بکات . هەرچەند ئەم دەرنەکەوتنەی ئەو مەبەستەشی تیایە کە دەمی یار ئەوەندە بچووکە بەچاو نابینرێت تا ماچ بکرێت . بەڵام لەهەمان کاتدا ئەوەیشی لێ هەڵدەهێنجرێت کە مادەم بە (هیچ) تەعبیری لێکردووە ، ئەوا ئەو (هیچ)ەی کە دراوەتە پاڵ دەمی یار و لە پشت ئەمەشەوە خودی یار ، مەبەست لێی ئەو حاڵەتی عەدەمەیە کە بریتییە لە هیچ . واتە هیچ شتێکی دنیایی وەك پارەو سامان و دەسەڵات و ...هتد ، یاخود مەوجود بە گشتی نەماوەو لە مەحوی کشاوەتەوەو ئەوەی ماوەتەوە (هیچ) یاخود (عەدەم)ەو لەم عەدەمەدا

---

(1) د. م ، ل ٢٩١.

(2) د. م ، ل ٩٩ .

(یار ـ بوون) دەرکەوتووە . بەلام دەرکەوتنەکەی وەك دەرکەوتنی شتێکی بەرجەستەو دیار نییە تا بە چاو ببینرێت ، بەلکو حالەتێکی ناوەکییەو تەنها دەرك دەکرێت و کەسەکە لە ناوەوەی خۆیدا بە چاوی دڵ (کە چاوێکی بیناترە) دەیبینێت . مەحوی لە سەرەتای حالەتی دەرکەوتنی (یار ـ بوون)دا ، دەیەوێت بە چاوی سەر بۆی بڕوانێت و ببینێت ، بەلام لەبەرئەوەی (یار ـ بوون) عەینی نییە ، مەحوی ناتوانێت ببینێت و ئەم نەبینینەی نابێتە هۆی ئەوەی هەست بکات (یار ـ بوون) بوونی نییە ، چونکە هەرچەند بەچاو نایبینێت ، بەلام لەناو خۆیدا هەستی پێ دەکات و هەرچی دەکات نازانێت چۆن تەعبیری لێ بکات ، بۆیە دەلێت :

**دەم نادیارو نازی قسەی پڕ بە دەشت و شار**

**دنیایەك ئاوی زیندەگی و دەرخرێ لە هیچ[1]**

لێرەدا هەست بەوە دەکرێت کە مەحوی گوێی لە قسەی یار بووە ، بەبێ ئەوەی لە کاتی قسەکردنەکەدا دەمی یار ، یاخوود خودی یار ببینێت . قسەکانی یار قسەی سادەو ئاسایی نین و لە رووی ماناوە پڕ بە دەشت و شار مانادارن و وەك ئاوی زیندەگی وان و زیندوویەتی و ژیان بە مەحوی دەبەخشن و لە خۆیدا هەست بەو زیندوویەتیە دەکات ، کە لەو قسانەوە وەری دەگرێت . بەلام سەرسامە لەو دەمەی کە دیار نییەو کەچی ئەم هەموو قسانەی لێوە دێتە دەر ، کە وەك ئاوی ژیان وان . ئەم سەرسامییەی لە مەحویدا دەردەکەوێت تەنیا بەرامبەر بە دەمی (یار ـ بوون) نییە ، بەلکو بەرامبەر بە خودی (یار ـ بوون)ە ، واتە بەرامبەر بەو بوونە رەسەنەی خۆیەتی کە دوای وازهێنان لە مەوجود (دنیا و شتی دنیایی)و کەوتنە عەدەمەوە دەرکەوتووە .

بەم پێیە دەتوانین بەگشتی سەیری مەحوی بکەین و بلێین : سەرەتا لە دنیاو شتی دنیاییدا هەستی بە بوون و ژیان و خۆشی کردووەو پێوەیان خەریکبووەو تیایاندا رۆچووە . بەلام دوایی ئەوەی بۆ دەرکەوتووە کە دنیاو شتی دنیایی کاتی و راگوزەرو کۆتادارن ، ئەو بوون و ژیان و خۆشییەش کە بە مرۆڤی دەبەخشن کاتی و راگوزەرو رووکەشن و راستەقینە نین ، چونکە دنیا هیچەو شتەکانیشی هیچن (واتە پووچ و بێ مانان) . ژیان و خۆشیی راستەقینەش لە دنیاو شتی دنیایی پوچ و بێماناوە بە دەست نایەن ، بۆیە وازیان لێ دێنێت و بە وازهێنانی لێیان ، ئەوانیش لێی دەکشێنەوەو

---

(1) د. م ، ل ٩٩.

دەکەوێتە حاڵەتی عەدەمەوەو هەست بە تەنیایی و غەمبارییەکی قووڵ دەکات . بەڵام لەو حاڵەتی عەدەمەو لەو تەنیاییە قووڵەدا کە دەرەوەو مەوجود لای ئەم حزووریان نامێنێت ، بوونی رەسەنی خۆی دەردەکەوێت و حزوور پەیدا دەکات . مەحوی هەرچەند بەچاو نایبینێت ، بەڵام لەناو خۆیدا هەستی پێ دەکات و بەچاوی دڵ دەیبینێت و دەرك بەوە دەکات کە ئەو بوونەی وەك دنیاو شتی دنیایی بەرچاو نییەو نادیار ، بەڵام حزووری ئەو بوونە لە مرۆڤدا ، مرۆڤ لە ژیان سەرشار دەکات ، ژیانێکی راستەقینەی وای پێ دەبەخشێت کە لە هەموو دەردو خەم و خەفەت و ئازارێکی دنیایی خاڵیە ، چونکە خەم و خەفەت و ئازار بۆ شتانێك دەخورێن کە بە دەست نەهاتوون ، ئەگەر هاتوو بەدەستیش هاتن ، بەڵام کاتی بوون و دوای ماوەیەك نەمان و لە دەست دەرچوون ، ئەوا دیسان هەر دەبنەوە مایەی خەم و خەفەت و ئازار . بەڵام ئەو ژیان و ئەو خۆشییەی ، مرۆڤ لە بوونی رەسەنی خۆیەوە دەستی دەکەوێت ، لەبەرئەوەی ئەو بوونە هی خودی کەسەکەیە ، هیچ کەسێك و هیچ شتێك ناتوانێت ئەو بوونەی لێ بسەنێت و لەو ژیان و خۆشیە بێبەشی بکات کە لەو بوونەیەوە سەرچاوە دەگرن ، بۆیە لە خەم و خەفەت و ئازار دوور دەبێت و ژیانێکی ئارام و پڕ لە خۆشیی راستەقینە دەژی . هەر لەبەر ئەمەیە کە مەحوی دەرك بە (یار - بوون) دەکات ، هەستدەکات دەبێت گیانی خۆی ببەستێت بەو یارەوەو دەڵێت :

**دیققەت کە ، غەیری روشتەیی جان و میانی یار**

**ڕوشتەم نەدیوە (مەحوی) ئەمن بادرێ لە هیچ**[1]

مەحوی کە گیانی خۆی بەست بە یارەوە ، مانای ئەوەیە ژینی خۆی بەستووە بە یارەوە ، چونکە گیان وا دەکات کە مەحوی نەمرێت و لە ژیاندا بێت ، (یار - بوون)یش وا دەکات کە ئەو ژیانەی مەحوی پڕ لە زیندوویەتی بێ و ژیانێکی راستەقینە بێت . لێرەدا دیسان سەرسامی مەحوی بەرامبەر ((یار - بوون) هەر بەردەوامەو ، سەرسامیەکەی زیاد دەکات بەوەی کە رۆحی خۆی بەستووە بە (یار - بوون)ەوە ، کەچی نە رۆحی شتێکی بەرجەستەو دیارەو نە (یار - بوون)یش عەینی و بەرچاوە ، ئەم دوانەش کە دیار نین و وەك (هیچ) یاخوود (عەدەم) وان ، لەیەك بادراون و بەیەکەوە بەستراون . مەحوی هەستدەکات ئەم دەرکەوتنەی یار کە سەرسامی کردووە ، لە حاڵەتی عەدەمدا رووی داوەو لەم حاڵەتی عەدەمەدا مەحوی بە

---

(1) د. م ، ل ٩٩.

نسبەت دەرەوە وەك نەبوو وایەو هیچ نییە ، کەچی توانیویەتی لەسەر ئەم هیچ (یاخوود عەدەم)ە ئەم شیعرە جوانە بنوسێت و دەڵێت :

**چاوی کەویٚ کە بەم غەزەلەم دوڕشناسی شیعر**
**کیٚ بیٚ دەڵیٚ ئەوەندە گەوهەر وەرگریٚ لە هیچ**[1]

مەحوی ئەو وشەو دەربڕین و دێڕە شیعرانەی خۆی ، کە بە هۆیانەوە تەعبیر لە (یار ـ بوون) دەکات ، بە گەوهەر دەزانێت . پێی وایە کەسێك کە شیعرناس بێت و بە قووڵی لە شیعر تیٚ بگات ، سەری لەوە سوڕ دەمێنێت ، کەوتنە حاڵەتی عەدەم کە لەدەرەوە وا دیارە ئەو کەسە بایەخ بە دنیا نادات و لە سەروەت و سامان و دەسەڵات و ...هتد بیٚ بەشەو هیچ شتێکی نییە مایەی بایەخ پێدان بێت ، کەچی سەرەڕای ئەمە بە هۆی دەربڕینی عەدەم و هەستکردن بە (یار ـ بوون) لەو عەدەمەدا ، شیعری وا دەڵێت کە وەك گەوهەرن و زۆر لە دنیاو پارەو سامان بە نرخترن ، چونکە پارەو سامان مرۆڤ بەهایان پیٚ دەدات و پارە خۆی لە خۆیدا لە کاغەزێك بەو لاوە نییە ، بەڵام گەوهەر بەهاو نرخی لە خودی خۆیدایەو بەهاو نرخ لە دەرەوەی خۆی وەرناگرێت . کەواتە شیعرەکانی مەحویش کە تەعبیر لە بوونی رەسەنی مەحوی دەکەن ، هەم خۆیان و هەم ئەو بوونەش کە تەعبیری لیٚ دەکەن ، وەك گەوهەرن و نرخ و بەهایان لە خۆیاندایەو هیچ کەسێك و هیچ شتێك ناتوانێت ئەو بەهاو نرخەیان لیٚ داماڵێت .

## وەسفی (یار ـ بوون)لە شیعری مەحویدا

مەحوی کە واز لە دنیاو شتی دنیایی و دەرەوە دەهێنێت ، دەکەوێتە حاڵەتی عەدەمەوەو لە عەدەمدا بوونی خۆی دەردەکەوێت و دەرك بەو بوونەی خۆی دەکات . دوای دەرچوون لەو حاڵەتی عەدەمەو دەرککردنی بوونەکەی خۆی ، وەسفی ئەو بوونەی دەکات ، بەڵام ئەو دەربڕینانەی لەو وەسفەدا بەکاریان دەهێنێت ، وا دەردەکەون کە بۆ یارێکی بەرجەستە بن ، کەچی لە راستیدا وەسفی ئەو (یار ـ بوون)ەی خۆین کە بەرجەستە نییەو لە ناوەوەیدایە . بەڵام لەبەرئەوەی ئەو (یار ـ بوون)ەی بەرجەستە نییەو مەحویش ویستوویەتی تەعبیری لیٚ بکات ، لە

---

(1) د. م ، ل ١٠٠ .

شیعرەکانیدا وەك یارێکی بەرجەستە تەعبیری لێ کردووە . ئەمەش لەبەرئەوەیە ئەگەر لە شێوەی یارێکی بەرجەستەدا تەعبیری لێ نەکات ، ئەوا بە هیچ جۆرێك ناتوانێت باسی بکات و هیچ لە بارەیەوە بڵێت :

**لالە خۆ مەحوی لە وەسفی حوسنی بێچوونی نیگار**

**لا لە تەئویلی خەلەف ، قوربانی تەئویلی سەلەف**[1]

مەحوی گەیشتووەتە ئەو راستییەی کە ئەو یارەی ئەم عاشقی بووەو لە دوای کەوتنە حاڵەتی عەدەم بینیویەتی ، وەك هیچ یارێکی دەرەکی و دیارو بەرجەستە نییە . جوانیەکەی بێهاوتایەو لە دنیادا جوانێکی لەو جۆرەی نەبینیوەو لە بەرامبەر جوانیی یاردا سەراسیمەیە ، وەسفی ئەو جوانیەی پێ ناکرێت و زمانی لە ئاست وەسفکردنی جوانی بێهاوتای یارەکەیدا لاڵەو هیچ وشەو دەربڕینێك شك نابات وەسفی ئەو جوانیەی یاری پێ بکات . بۆیە وای بەباش دەزانێت وەك چۆن زانا پێشینەکانی ئیسلام لە بارەی ئەو وەسفانەی خواوە کە گوایە دەست و چاو و هەڵسان و رۆیشتنی هەیە هیچ تەئویلێکیان نەکردووە ، مەحویش وای بەباش دەزانێت لە بارەی جوانیی یارەکەیەوە هیچ نەڵێت ، چونکە جوانیی یارەکەی وەك جوانیی مرۆڤ و هیچ جوانییەکی تر نییەو وەسف ناکرێت . هەر ئەوەندەیە لەبەرئەوەی ئەهلی دڵە بە چاوی دڵ ئەو جوانییەی بینیوە ، بەڵام لەبەرئەوەی جوانیەکی بێهاوتایە ناتوانێت وەسفی بکات .

بەڵام دواتر دڵی ئارامی نەگرتووەو هەوڵی داوە هەرچۆنێك بێت وەسفی (یار - بوون)و جوانیەکەی بکات . بۆ نمونە لەم شیعرەی خوارەوەدا دەیەوێت وەسفی (یار - بوون) بکات ، بەڵام سەرسامەو نازانێت چۆن و بەچی تەعبیر لە یار بکات . بۆیە لە مێشك و زەینی خۆیدا وێنا(تصور)ی دەکات و هەوڵدەدات وەك یارێکی بەرجەستە تەعبیری لێ بکات و ئەندامەکانی جەستەی بە شتە جوانەکانی سروشت بچوێنێت . لە دێڕی یەکەمدا دەیەوێت تەعبیر لە باڵای یار بکات و دەڵێت :

**شمشادە ئەمە ، یا قەدە ، یا سەروی رەوانە**

**یا عەرعەرە ، یا نەخلی موورادی دڵ و جانە**[2]

مەحوی دەیەوێت باڵایەك بە (یار - بوون) ببڕێت و وەسفی ئەو باڵایەی بکات ، بەڵام سەراسیمە بووەو ناتوانێت تەعبیر لە باڵای (یار - بوون) بکات . نازانێت بە داری

---

(1) د . م ، ل ١٧٦ .

(2) د . م ، ل ٢٨٠ .

شمشاد تەعبیری لێ بکات ، یان بە سەرووی ڕەوان یان بە عەرعەر ، یاخوود بە داری ئاواتی خۆی لە ژیاندا ، تەعبیری لێ بکات . بە بڕوای ئێمە مەحوی هەستی کردووە باڵای یار وەك هیچ کام لەو درەختانەی سروشت نییەو لە هیچ شتێك ناچێت ، بۆیە هەستدەکات تەنیا داری ئاواتی دڵ و گیانی ئەمەو ، مانەوە بە گیانی و زیندوویەتی بە دڵی دەبەخشێت . بەهەمانشێوە نازانێت چۆن وەسفی زوڵفیشی بکات و دەڵێت :

**داخۆ ئەمە ئەگریجەیە پەخشاوە بەسەردا**

**یا سونبولە کردوویە صەبا زوڵفی بە شانە**(١)

نازانێت ئەوە ئەگریجەیە بەسەر شان و ملی(یار - بوون)دا پەخش بووەتەوە ، یان سونبولەو بای صەبا شانەی کردووە . کە دێتە سەر وەسفی چاوی دەڵێت :

**ئاهووی خوتەنە جیلوە دەکاتن لە خەطادا**

**یا چاوی ڕەشی فیتنەگەری سوورمەکەشانە**(٢)

چاوی (یار - بوون) کە کلی تێکراوەو ڕەشە ، ئەوەندە جوانە ، مەحوی نازانێت لە چاوی سورمەکەشی کچێکی شۆخ و عەییارو فیتنەگەر دەچێت ، یان لە میسکی ڕەشی ئاسکی خەتا دەچێت . لە وەسفی جوانی و بچووکیی دەمیدا دەڵێت :

**دڵ هایمە دایم کە ئەمە قەترەیە داخۆ**

**یا جوزئێکی بێ جوزئە موسەمما بە دەهانە**(٣)

دەمی (یار - بوون) ئەوەندە بچووك و جوانە ، مەحوی لە ئاستیدا سەراسیمە بووەو نازانێت لە بچووکیدا بە قەد دڵۆپێك دەبێت ، یان لە دڵۆپ بچووکترەو ئەوەندە بچووکە ناتوانرێت لەوە بچووکتر بکرێتەوەو بەشی دیکەی لێ نابێتەوە . مەبەستی ئەوەیە تا ئەوپەڕی بچووکی بچووکەو شتێك نییە لەو بچووکتر بێت . لە ئاست لێویدا هەر تەواو سەراسیمە بووەو دەڵێت :

**ئەم مەی صیفەتی خوون خۆرە وا نازك و سوورە**

**یاقووتی لەبە ، یا گوڵە ، یا قووتی ڕەوانە**(٤)

---

(1) د . م ، ل ٢٨٠ .

(2) د . م ، ل ٢٨٠ .

(3) د . م ، ل ٢٨٠ .

(4) د . م ، ل ٢٨١ .

مـەحوی هەسـتدەكات دەمـی (یـار ـ بـوون) سـیفەتی مـەییی هەیـەو ئـەوەی بیمژێت مەست دەبێـت . بـەڵام لـە كـاتی ئـەم مژینـەدا ، ئـەو (واتـە لێوەكـە) خـوێنی كـەسـەكـە دەمـژێت ، بۆیـە رەنگی بـەو خوێنـە سـوورە ، لەگـەڵ ئـەم سـوورییەدا نازكیشە . بەڵام مەحوی نازانێت چۆن تەعبیر لە سووری و نازكی ئەو لێوە بكات ، ئایا سوورییەكەی وەك یاقووتەو نازكیەكەی وەك گوڵە؟ یان لە هیچ ناچێت و تـەنیا خۆراكی گیانەو ، گیانی مەحوی بێ ماچی ئەو لێوانە نازێ . واتە مەحوی لـەو (یـار ـ بـوون)ەدا هەست بە مانەوەو ژیان دەكات و بەو دەژێ .

لـە كۆتـاییـشـدا هـەسـتـدەكات ئـەم هەموو پیـا هەڵگوتنـەی ئـەو بەرامبـەر (یار ـ بوون) ، تەنـها وەك ئاوازێكـەو تەعبیری لـە هـیچ نـەكردووەو نـەیتوانیوە باسـی (یار ـ بوون) بكات ، بۆیە بـە ئـاوازێكی غـەمگینی بولبـولی وەرزی پـاییز دەچـێت ، كـە تەنها ئاوازەو مانای نییەو تەعبیر لە وەرینی گەڵاو گوڵی درەخت دەكات :

**ناڵاندم و فەرمووی كە ئەم ئاوازە حەزینە**

**یا (مەحوی)یە ، یا بولبولەكەی فەصڵی خەزانە**(1)

مـەحـوی هەرچەند لەو شیعرەی سەرەوەدا نەیتوانیوە تەعبیر لە (یار ـ بوون) بـكـات ، بەڵام هەر وازی نەهێناوەو لە زۆر جێی تردا وەسفی كردووە . بۆنموونە دەڵێت :

**وەكو رۆژ ئەو مەهە لەو دوورە دەركەوت**

**لـەمێوە ئەشك و ئاهی ئێمە سەركەوت**(2)

وەك لە شیعری كلاسیكیدا باوە ، مەحوی لەم دێڕەدا (یار ـ بوون)ی بە مـانگ چواندووە . بـەڵام دەركـەوتنی ئـەو یـارە ، وەك دەركـەوتنی رۆژ وایـە بـۆ مـەحوی و ، ژیان و دنیاو دەوروبەری بۆ رووناك دەكاتـەوەو لەبـەر رووناكی ئـەم بوونەیدا هـەم لـە خۆی تێ دەگات و هەم لـە دنیـاش تـێ دەگـات . هـەر لەبەرئەمەیـە هەستدەكات ئـەم بوونەی شایەنی ئەوەیە هەرچی داغ و غەم و حەسرەتێكی هەیە لە پێناو ئـەودا بێـت ، نـەك لـە پێنـاو دنیـاو شـتی دنیاییـدا . كـە ئـەو (یـار ـ بـوون)ەی دەردەكـەوێت ،

---

(1) د. م ، ل ٢٨١ .

(2) د. م ، ل ٨٧ .

هەستدەكات ئەو (یار ـ بوون)ەی ئەوەندە بەرزو بەهادارە ، هیچ شتێك پێی ناگات ، بۆیە دەڵێت : **كە ئەو لێو و ددانەم دی بە جارێ**

**لەبەر چاوم هەموو لەعل و گوهەر كەوت**[1]

لەعل سوورەو جوانیەكەی لەو سوورییەیدایە ، گەوهەریش بەهاو قیمەتی لە جوانیەكەیدایە . بەلام سووری لەعل و جوانیی گەوهەر ، لە چاو لێوی سووری یارو دانی جوانیدا ، هیچ نین . بۆیە مەحوی كە دەرك بە جوانی و بەهای لێو و ددانی (یارـ بوون) دەكات ، لەعل و گەوهەری لەبەرچاو دەكەوێت و هەستدەكات هەرچەندە لەعل و گەوهەر مایەی دەوڵەمەندین و پێشتر هەوڵی دەدا بەدەستیان بهێنێت ، بەلام لەبەر نەبینین و دەرك نەكردنی جوانی و بەهای (یار ـ بوون) ، لەعل و گەوهەر بەلایەوە جوان و بەهادار بوون ، ئەگینا ئەو كەسەی بە دوای بوونی رەسەنی خۆیدا بگەرێ و بوونی خۆی لامەبەست بێ ، هەر ئەوەندەی هەستی بەو بوونەی خۆی كرد ، ئیتر هەموو لەعل و گەوهەرو دەوڵەمەندی لەپێش چاو دەكەوێ ، چونكە دەوڵەمەندی و لەعل و گەوهەر بوونێكی رووكەش و كۆتادارن ، بەلام بوونی رەسەنی مرۆڤ نیشانەی دەوڵەمەندییەكی ناوەكی و جاویدانییە . لەم حاڵەتی دەركەوتنەی (یار ـ بوون)دا بووە كە شەو داهاتووەو مەحوی خەریكبووە خەوی لێ بكەوێت و لەو بوونەی بێ ئاگا بێت و دەڵێت : **وەنەوزێكم شەوێ دا ، گەییە سەرم و**

**وتی: هەستە، هەتاوت وا لەسەر كەوت**[2]

هەر كە وەنەوزێكی داوەو خەریكبووە خەوی لێ بكەوێت ، (یار ـ بوون) لە ناخیدا درەوشاوەتەوە . درەوشانەوەكەی وەك رووناكیی خۆر وابووەو ئەوەی بە مەحوی وتووە كە نەخەوێت و هەستێت ، چونكە ئەم (واتە یار) بەم دەركەوتنەی دنیاو ژیانی بۆ رووناككردووەتەوەو جوانیی خۆی پیشان داوە . مەحوی هەر ئەوەندە دەتوانێت باسی (یار ـ بوون) بكات و لەمە زیاتر ناتوانێت تەعبیری لێ بكات و پێی وایە هەركەسێك بەرەو یار چوو ، ئیتر هەواڵی نامێنێت ، بۆیە دەڵێت :

**لە كێ یا رەب خەبەر پرسی بكەم من**

**كە هەر كەس بۆ خەبەر چوو ، بێ خەبەر كەوت**[3]

---

(1) د. م ، ل ٨٧ .

(2) د. م ، ل ٨٧ .

(3) د. م ، ل ٨٧ .

هەرکەسێك بە نیازی زانینی هەواڵی یارو باسکردنی ، بۆلای (یار - بوون) بچێت ، لای دەرەوەو خەڵك بزر دەبێت و هەواڵی نامێنێت ، چونکە هەر کەس جوانی و گەورەیی (یار - بوون)ی بۆ دەرکەوت ، لەبەرامبەریدا دەهشەت و سەرسوڕمان دەیگرێت و واقی وڕ دەمێنێت و دنیاو دەرەوەو ئەو خەڵکەی لەبەرچاو دەکەوێت کە پێشتر لەناویاندا توابوویەوەو ، هەستدەکات لەچاو یاردا هیچ نین و جارێکی تر روویان تێ ناکاتەوە . واتە بە حزوور پەیدا کردنی (یار - بوون) لای کەسەکە ، ئەو کەسە لە دنیاو دەرەوە دادەبڕێت و لای خەڵك هیچ هەواڵێکی نامێنێت و بێ خەبەر دەکەوێت . بۆیە مەحوی لەو حاڵەتەدا کە لە (یار - بوون) دادەبڕێت ، نازانێت هەواڵی یار لە کێ بپرسێت و لەگەڵ کێدا باسی (یار - بوون) بکات . ئەوانەی ئەو دەیانبینێت کەسانێکن لە (یار - بوون)ی خۆیان دابڕاون و بە دنیاوە خەریکن و بە کەڵکی ئەوە نایەن باسی (یار - بوون)یان لەگەڵدا بکات . ئەو کەسەش کە بەرەو (یار - بوون)ی خۆی چووەو ئەو یارەی دەرکەوتووەو دەرکی پێ کردووە ، بەو یارەی خۆیەوە سەرقاڵبووەو لە دنیاو دەرەوە دابڕاوە ، بۆیە مەحوی ناتوانێت پەیوەندی پێوە بکات و باسی یاری لەگەڵدا بکات . یاخوود دەتوانین بەم جۆرەش ئەم دێڕە لێك بدەینەوە : لەو حاڵەتانەدا کە بە دنیاو شتی دنیاییەوە خەریك دەبێت هەست بە (یار - بوون) ناکات و لێی دادەبڕێت ، ئەم دابڕانەی لە (یار- بوون) غەمباری دەکات و دنیای لا تاریك دەبێ . بۆیە دەکەوێتە بیرکردنەوە لە (یار - بوون) ، ئەو بیرکردنەوانەی لە بوونی خۆی بەمەبەستی دۆزینەوەی ، وەك ناردنی کەسان وایە بۆ گەڕان بە دوای کەسێکدا . بەڵام ئەو هەرجارێك لەم حاڵەتی خەریکبوونەی بە دنیاو شتی دنیاییەوە ، بیری لەو بوونەی کردبێتەوە ، بیرکردنەوەکەی بێ ئەنجام بووەو نەیتوانیوە ئەو بوونەی خۆی بدۆزێتەوە . ئەمەشی بەوە چواندووە ئەو کەسانەی (بیرکردنەوەکانی) کە بۆ هەواڵ زانینی (یار - بوون) چوون ، هەواڵی ئەویان نەهێناوەو خۆشیان بێ هەواڵ کەوتوون ، واتە هەردەم بیرکردنەوەکانی لە بوونی رەسەنی خۆی ، لە لایەن بوونە نائەسڵییەکانەوە کە ئەم پێوەیان خەریکبووە ، لە ناوبراون و بێ ئەنجام بوون . مەحوی هەستدەکات بەم دابڕانەی لە (یار - بوون) سینەی ئاگری تێبەر دەبێت ، بۆیە دەڵێت :

**دڵم وەك شێری بێشەی شوعلە گرتوو**

**لە سینەی پڕ لە سۆزم دەریەدەر کەوت**(1)

---

(1) د. م ، ل ٨٨ .

ئەم تەنیا کەوتن و دابڕانە لە (یار - بوون)داو نەبوونی کەسێك کە لەگەڵیدا باسی یار بکات و هەواڵی یاری لێ بپرسێت و بێ هەواڵ بوونی لە (یار - بوون) ، بووەتە هۆی ئەوەی سینەی پڕ لە سۆزی ، تەنیایی و غەم و ئازارو سووتان رووی تێ بکات و وەك دارستان گڕ بگرێت ، دڵیشی لە تاو ئەو ئاگرە لە دارستانی سینە دەرچووەو دەربەدەر بووە . نەك هەر ئەمە ، بەڵکو دەڵێت :

**لەسەر خۆ چوو بەدەم گریانەوە دڵ**

**گەڕەك پڕ بوو کە ئەم منداڵە دەرکەوت[(١)]**

دڵی ئەوەندە گریاوە ، بەدەم گریانەوە لەسەرخۆ چووەو خەڵکی گەڕەك بەهۆی ئەم گریان و لەسەرخۆ چوونەی دڵیەوە هەموو هاتوونەتە دەرەوەو گەڕەك پڕ بووە لە خەڵك و ، سەریان لەوە سوورماوە کە دڵی مەحوی بۆچی ئاوای بەسەر هاتووەو بۆچی ئاوا دەگری . بەڵام مەحوی دەزانێت بۆچی ئاوای لێ هاتووە ، هەستدەکات سینەو دڵی لەبەرئەوە وایان بەسەر هاتووە ، چونکە ئەم بە دنیاوە خەریکبووەو هەناسەی بۆ دنیاو شتی دنیایی هەڵکێشاوە ، ئەوەتە دەڵێت :

**بە خۆڕایی ئەوەندەم ناڵە کێشا**

**لە سینەمدا پسا، ما، بێ ئەسەر کەوت[(٢)]**

هەستدەکات ئەو ناڵەو هەناسە هەڵکێشانەی کە بۆ دنیا بوون ، بەخۆڕایی بوون و لە پێناو هیچدا بوون . ئێستاش پرزەی لێ براوەو لە تاو دابڕانی لە (یار - بوون) توانای هەناسە هەڵکێشانی نەماوەو وازی لە دنیاو دەرەوە هێناوە . ئەم دوورکەوتنەوەو وازهێنانەی لە دنیا دەبێتە هۆی دەرکەوتنی (یار - بوون) . بۆیە کە (یار - بوون) دەردەکەوێت ، مەحوی لە وەسفیدا دەڵێت :

**لە رۆژئاواوە ئیمشەو بێ نیقابە**

**مەهی من، ماهی عالەم بێ مەفەڕ کەوت[(٣)]**

کە (یار - بوون) دەردەکەوێت و لای مەحوی سەر هەڵدەداتەوە ، وەك ئەوە وایە مانگی خۆی سەری هەڵدابێتەوە . لە کاتێکدا کە پێش دەرکەوتنی مانگی خۆی (کە مەبەستی بوونی ئەسڵی خۆیەتی) ئەم لە مانگی عالەمدا توابوویەوەو ، بەوەوە

---

(1) د. م ، ل ٨٨ .

(2) د. م ، ل ٨٨ .

(3) د. م ، ل ٨٨ .

خەریکبوو . مەبەستی لە عالەم کەسانی دەوروبەریەتی کە لە ناویاندا دەژی و سەر بە دینی ئیسلامن ، مانگیش رەمزی ئیسلامە ، واتە لەو بوونەدا کە لە رێگەی عەرەب و ئیسلامەوە تیایدا دروست بوویوو ، خۆی دەبینییەوە . بەلاّم ئێستا کە بوونە ئەسڵییەکەی خۆی سەری هەڵداوەتەوە ، بوونە نائەسڵییەکەی (کە مانگی عالەمە) بەلاوە ناوە . تەنانەت هەموو ئەو بوونانەی دی کە هەن ، بەلای ئەمەوە هیچ نین و هەستدەکات دوورن لێی و لە دنیای ئەمدا شوێنێك نییە تیایدا بن . هەروەها ئەم دێرە ئەم لێکدانەوەی تریشی بۆ دەکرێت : هەر کەیارەکەی مەحوی (کە مانگێکە بۆخۆی) دەرکەوت ، ئەوەندە جوان و بەشەوق بوو ، مانگی ئاسمان لە چاویدا هیچ نەبوو و شەوقی لە مانگی ئاسمان بڕی و شەرمەزاری کردو ، مانگی ئاسمان نەیدەزانی بۆ کوێ هەڵبێت[1] . ئەم مانگەی مەحوی هەر بەناو مانگە ، ئەگینا رووناکی و درەوشانەوەی وەك خۆر وایە ، بۆیە کە دەردەکەوێت مەحوی بەسەر بە پیریەوە دەچێت ، ئەوەتە دەڵێت :

**بەپیر ئەو رۆژەو (مەحوی) ئەوەندە**
**بەسەر چوویوو ، وەکو شەونم لەسەر کەوت[2]**

کە (یار - بوون) دەرکەوت ، مەحوی بە پیریەوە دەچێت . بۆ پیشاندانی گەورەیی و شکۆی (یار - بوون) ، مەحوی بەسەر بەپیریەوە دەچێت و ئامادەیە سەری خۆی بکاتە قوربانیی (یار - بوون) ، چونکە بەدەرکەوتنی ئەو ، کە وەکو خۆر وایە ، مەوجودو بوونی ساختە وەك شەونم دەبن بە هەڵم و بە نسبەت مەحوییەوە نامێنن . کە ئەم (یار - بوون)ە دەردەکەوێت ، مەحوی دەهەشەت و سەرسامی دایدەگرێت و نازانێت چۆن تەعبیر لەو (یار - بوون)ەی بکات ، واتە ناتوانێت بە شێوەیەکی هەمەکی وەسفی بکات ، بۆیە هەوڵدەدات بە شێوەیەکی بەشەکی وەسفی بکات . لەم چەند دێڕەی خوارەوەدا وەسفی چاوی دەکات و دەڵێت :

**نەوەك هەر چاوی مەستە ، خۆشی هەر مەست**
**بەلادا دێ ، کە دێ ، وەك تورکی سەر مەست[3]**

---

(1) بڕوانە : د. م ، ل ٨٨ ، پەراوێزی ژمارە ٩.
(2) د. م ، ل ٨٩ .
(3) د . م ، ل ٧٢ .

چاوی مەست چاوێکی جوانە ، ئەو (یار ـ بوون)ەش کە مەحوی دەرکی پێ کردووە چاوی مەستە . تەنانەت نەك هەر چاوی ، بەڵکو خۆیشی مەستەو ، مەستییەکەی لەوەدایە کەوەك کچێکی شۆخ و جوان ، بەنازو لەنجەولار بەرێگەدا دەڕوات . لەنجەو لارەکەی بە جۆرێکە وا هەست دەکرێت کە مەستە ، بۆیە ئاوا بەڕێدا دەڕوات . تەنانەت لە یەکەم دەرکەوتنیدا هەر بە مەستی دەرکەوتووە :

**لە حەجلەی نازو ئیعزازی بە صەد ناز**

**خودا تۆ حافیظی بی ، هاتە دەر مەست[(١)]**

ئەو حاڵەتی عەدەمەی کە (یار ـ بوون) تیایدا دەردەکەوێت ، وەك حەجلە (واتە شوێنی یەکەم شەوی بووك و زاوا) وایە ، کە تیایدا مەحوی بە (یار ـ بوون) گەیشتووەو دەرکی کردووە ، ئیتر لەو حەجلەوە یار بە صەد نازەوەو بەمەستی هاتووەتە دەرەوە . مەحوی هەستدەکات ئەم دەرکەوتن و هاتنە دەرەوەی (یار ـ بوون) وا دەکات نەك هەر خۆی (واتە مەحوی) ، شێخ و سۆفیش عاشقی بن و دوای بکەون :

**بە دویا شێخ و صۆفی مەستی عیشقی**

**لە ڕێیا کەوتوون مەستە لەسەر مەست[(٢)]**

کە (یار ـ بوون) دەرکەوتووەو مەستانەو بە لەنجەولار بە ڕێدا ڕۆیشتووەوە ، مەحوی بە جۆرێك پێی سەرسام بووەو بەرەو رووی چووە ، هەستی کردووە شێخ و سۆفیش کە وازیان لە هەموو جوانی و خۆشییەك هێناوە ، ئەگەر ببینن ، واز لە شێخایەتی و سۆفیەتی دێنن و ، مەستی عیشقی جوانییەکەی دەبن و بەمەستی لەبەر پێیدا دەکەون و ئاواتی ئەوە دەخوازن بتوانن چاوی مەستی ببینن ، چونکە چاوە مەستەکانی ئەوەندە جوانن عالەم سەرسامی دەبن ، ئەوەتە دەڵێت :

**نیگاهی مەستی تا مەستانی ڕێ دا**

**نەما لەو جێگە ڕێگەی کەس لەبەر مەست[(٣)]**

کاتێك چاوە مەستەکانی (یار ـ بوون) ڕێگەیان دا ئەو کەسانە تەماشایان بکەن کە مەستی دنیان و بەشتی دنیاییەوە خەریکن ، ئەو مەستییەی دنیا بەری دان و

---

(1) د . م ، ل ٧٢ .

(2) د . م ، ل ٧٣ .

(3) د . م ، ل ٧٣ .

وازیان له دنیاو شتی دنیایی هێناو مەستی چاوی جوانی یار بوون . ئەوەندە لەم جۆرە خەڵکە بۆ تەماشاکردنی چاوی مەستی یار کۆبوونەوە ، جێگەی کەسێکی تر نەدەبوویەوە . مەبەستی ئەوەیە ئەو خەڵکە بۆیە مەستی دنیان و پێوەی خەریکن ، چونکە هەستیان بە (یار ـ بوون)ی خۆیان نەکردووە ، ئەگەر دەرك بە بوونی خۆیان بکەن مەستی ئەو دەبن و خەریکی بەدی هێنانی دەبن . بۆیە مەحوی شانازی بەو (یار ـ بوون)ەوە دەکات کە ئاوا خەڵك مەست دەکات و دەڵێت :

**بنازم بەو پیاڵەی چاوی مەستە**

**بەیەك پرشنگی عالەم سەر بە سەر مەست[1]**

چاوی مەستی یار چاوێکە بە یەك پرشنگی سەراپای عالەم مەست دەکات . مەحوی شانازی بەم چاوەوە دەکات ، چونکە کە عالەم و دەرەوە لە حاڵەتی هوشیاریدان و مەست نین ، بە جۆرێکی دی خۆیان پیشانی مەحوی دەدەن و سەرسامی دەکەن و بەرەو خۆیان رایدەکێشن ، بەڵام کە یەك پرشنگی چاوی یار بەر عالەم دەکەوێت ، واتە بەر خەڵك و دەرەوەو دنیا دەکەوێت ، مەستیان دەکات و لەو مەستیەدا خۆیان چۆنن ئاوا بۆ مەحوی دەردەکەون و مەحوی دەرك بە حەقیقەتیان دەکات و ئەوەی بۆ دەردەکەوێت کە لەچاو (یار ـ بوون)دا زۆر بێ بایەخن و شایەنی ئەوە نین بەرەو روویان بچێت . ئەمەش بە هۆی کاریگەری چاوی (یار ـ بوون)ەوەیە ، بۆیە دەڵێت : **لەبەر حوکمی نیگایا قاتە هوشیار**

**هەتا چاوی بکا بڕ ، مەستە ، هەر مەست[2]**

کە (یار ـ بوون) پرشنگی چاوی گرتە عالەم ، عالەم و حەقیقەتی عالەم دەردەکەون کە لەچاو یاردا هیچ نین ، بۆیە خەڵك هەموو روو دەکەنە (یار ـ بوون) و مەستی ئەو دەبن . ئەگەر (یار ـ بوون)ی هەر کەسێك بۆ ئەو کەسە دەربکەوێت و دەرکی بکات ، ئەوا ئەو کەسە لەبەرامبەر دنیاو شتی دنیاییدا بە هوشیاری نامێنێتەوەو واز لە دنیا دێنێت و مەستی نیگای (یار ـ بوون) دەبێت . کە ئەم حاڵەتە روویدا ئیتر دەشت و دەر پڕ دەبن لە مەست ، بۆیە دەڵێت :

**وتی : سەیری دەرو دەشتم نەماوە**

**لە چاوم مەوج ئەدا ، پڕ دەشت و دەر مەست[3]**

---

(1) د . م ، ل ٧٣ .

(2) د . م ، ل ٧٣ .

(3) د . م ، ل ٧٣ .

که دەشتودەر پڕ دەبن لە مەستی نیگای (یار - بوون) ، ئیتر نیگای یار هەر بەر ئەو مەستانە دەکەوێت و بەر دەشتودەر ناکەوێت . پێشتر کە (یار - بوون) دەرنەکەوتبوو ، کەس مەستی تەماشاکردنی نەبووبوو و دەورویەری چۆڵ بوو ، بۆیە سەیری دەرودەشتی دەکردو رووی لە خەڵك وەرگێڕا بوو ، بەلاّم کە خەڵك دەرکیان پیّ کرد ، لەدەوری کۆبوونەوەو دەشتودەریان پڕ کرد ، بۆیە (یار - بوون) جگە لە مەستەکانی نیگای چاوی ، لە دەوروبەری خۆیدا هیچ نابینێت . مەحوی سەری لە (یار - بوون) سوورماوە کە خەڵك بەو جۆرە مەستی بوون ، نازانێت چ ناوێکی لیّ بنێت ، بۆیە دەڵێت :

**بە جوز مەی ناوی ئەم ناوە بەچی بەم**
**بە نەشئەی ئەو بەشەر هەم (بو لبشر) مەست**[1]

مەحوی ناوی مەی لە یارو لەو نازە دەنێت کە چاوی یار دەیکات ، جگە لەم ناوە نازانێت چ ناوێکی تری لیّ بنێت . بۆیەش ئەو ناوەی لیّ دەنێت ، چونکە بە نەشەی خۆی ، وەك مەی مرۆڤ مەست دەکات و وای لیّ دەکات ئاگای لە دنیاو دەرەوەنەمێنێت و لە هەموو شتێك دابڕێت .

(1) د . م ، ل ٧٣ .

# ئەنجام

لە کۆتایی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا سەبارەت بە شیعرەکانی مەحوی ، گەیشتینە ئەم ئەنجامانەی خوارەوە :

١ ـ مەحوی هەوڵیداوە لە شیعرەکانیدا تەعبیر لەو بوونە بکات کە لەناوبایەتی و دەیجولێنێت . لە شیعرەکانیدا بە (یار ، شۆخ ، دلبەر ، ...هتد) ناوی دەبات .

٢ ـ هەم بوونی رەسەن و هەم بوونی ساختە ، بە جیا لەناو مەحویدا ئامادەییان هەبووە . زۆرجار بوونی ساختە ویستوویەتی لەناو مەحویدا ئامادەیی هەبێت و بەسەر مەحویدا باڵادەست بێت ، ئەم بوونە ساختەیەش لەدەرەوەی مەحوییەوە هاتووەتە ناوی و لە خودی خۆیەوە سەرچاوەی نەگرتووە . مەحوی ململانێی بوونە ساختەکان دەکات و دەیەوێت رزگاری ببێت لێیان و بوونە رەسەنەکەی خۆی تیایدا باڵادەست بێت و بەدی بێت .

٣ ـ ئەو ساتانەی مەحوی لە بوونی رەسەنی خۆی دادەبڕێت ، کە بوونێکی کوردییە ، لە شیعر نووسین بە زمانی کوردی دادەبڕێت و بەو زمانە شیعر دەنووسێت کە لێیەوە بوونێك هاتووەتە ناوی .

٤ ـ تا لەناو مەحویدا بوونی ساختە هەبێت ، بوونە رەسەنەکەی خۆی دەرناکەوێت .

٥ ـ مەحوی مردنی پێ باشترە ، لە مانەوەی لە دنیادا بە بوونێکی ساختەوە کە لە دەرەوە هاتووەتە ناوی .

٦ ـ مەحوی پێی وایە دەرکەوتنی بوونی رەسەن و بەدی هاتنی ، نەمری بە مرۆڤ دەبەخشێت ، نەك ئاوی حەیات .

٧ ـ لە حاڵەتی غیابی (بوونی رەسەن )دا ، مەحوی داوای لێ دەکات بێت و بیکوژێت . ئەم کوشتنەش دەکاتە کوشتنی ئەو لایەنەی مەحوی کە بوونی ساختەو مەوجود تیایدا ئامادەییان هەیە ، نەك کوشتنی ئەو مەحوییەی کە خاوەنی ئەو بوونە رەسەنەیە .

٩ ـ کاتێك مەحوی واز لە بوونی ساختەو مەوجود دەهێنێت و رۆحی موقەددەس دەبێت ، لە خەودا (یار ـ بوون)ەکەی دەردەکەوێت و دەیبینێت .

١٠ ـ دوای وازهێنانی مەحوی لە بوونی ساختەو مەوجود ، دەرکەوتن و ئامادەیی (یار ـ بوون) لە ئاگاییدا روو دەدات . بەڵام لەبەرئەوەی مەحوی بە چاوی سەر بۆی دەڕوانێت و دەیەوێت وەك یارێکی بەرجەستەو دیار ببینێت ، دەرکی پێ ناکات و (یار ـ بوون) دەکەوێتەوە حاڵەتی غیابەوە .

١١ ـ مەحوی لە بەرامبەر (یار ـ شۆخ ـ دلبەر ـ بوونی رەسەن)دا کەوتووەتە حاڵەتی عیشقەوەو عاشقی ئەو بوونە رەسەنەی خۆی بووە .

١٢ ـ عیشق لای مەحوی قۆناغی دوای وازهێنان لە (بوونی ساختەو مەوجود)و پێش دەرکەوتنی (بوونی رەسەن) و گەیشتنە پێی .

١٣ ـ کە مەحوی عاشقی ئەو بوونەی خۆی دەبێت ، دەکەوێتە جیهانی عیشقەوە . ئەو جیهانەی عیشق کە مەحوی تێی دەکەوێت وەك دنیا نییەو تیایدا خەم و خەفەت و دەردو ئازار ، مایەی خۆشین و نیشانەی ئەوەن عاشق لە عیشق بەردەوامە . جگە لەمە ، لە جیهانی عیشقدا کەس لە کەس زیاتر نییەو هەموو مرۆڤەکان وەك یەکن و هەر یەکەیان پاشایەکە بۆ خۆی .

١٦ ـ مەحوی لە عیشق و جیهانی عیشقدا هەست بە نەمری دەکات . واتە ئەگەر عاشق بێت کەسێکی نەمرەو ئەگەر لە عیشقدا نەبێت وەك مردوو وایە .

١٧ ـ لە جیهانی عیشقدا ئاگر هەیە . ئەم ئاگرەی جیهانی عیشق وەك ئاگری دنیا سووتێنەر نییە ، تەنها ئەو لایەنەی عاشق دەسوتێنێت کە بە بوونی ساختەو مەوجودەوە پەیوەستە . بۆیە مەحوی خۆی دەداتە بەر ئەم ئاگرەی جیهانی عیشق ، بۆ ئەوەی لە بوونی ساختەو مەوجود پاك ببێتەوە .

١٨ ـ مەحوی خۆی داوەتە بەر رووناکیی بوون و بە هۆی ئەو رووناکییەوە دنیاو دەوروبەری بۆ رۆشن بووەتەوە .

١٩ ـ لە جیهانی عیشقدا مەحوی ئامادەیە لە سەری خۆی ببورێت و بیکاتە قوربانیی مەعشووق .

٢٠ ـ مەحوی کە دەبینێت دنیا هیچ و بێ وەفایەو هەر رۆژەی لەسەر بارێکە ، رۆژێك مرۆڤ بەرز دەکاتەوەو رۆژێك دەیدات لە زەوی و تاسەر بۆ کەس نییە ، واز لە دنیاو شتی دنیایی دەهێنێت .

٢١ ـ واز هێنانی مەحوی لە دنیا ، لە مەرگ دۆستییەوە نییە ، بەڵکو لەوەوەیە کە دنیا لە چاو بوونی رەسەنی خۆیدا هیچ نییەو لە پێناو بەدیهێنانی ئەو بوونەیدا واز لە دنیا دەهێنێت . کەواتە مەحوی ژیان دۆستە ، بەلاّم ژیانی بە بوونی رەسەنی خۆیەوە دەوێت .

٢٢ ـ بە واز هێنانی مەحوی لە دنیاو شتی دنیایی ، دنیاو شتی دنیاییش لە مەحوی دەکشێنەوەو لە دەستی دەردەچن . بەمە دەکەوێتە حاڵەتی عەدەمەوەو لەو عەدەمەدا پەی بە (یار ـ بوون) دەبات .

٢٣ ـ لە دوای دەرچوون لە حاڵەتی عەدەم ، مەحوی دەیەوێت وەسفی (یار ـ بوون) بکات . بەلاّم کێشەی مەحوی ئەوەیە دەیەوێت وەك یارێکی بەرجەستەو دیار ، دەرك بەو (یار ـ بوون)ەی بکات و وەسفی بکات . لە کاتێکدا ئەو (یار ـ بوون)ە ، بەرجەستەو دیار نییەو وەسف ناکرێت ، بۆیە مەحوی لە بەرامبەر (یار ـ بوون)دا سەراسیمە بووەو هەرچیی کردووە نەیتوانیوە وەك یارێکی بەرجەستەو دیار وەسفی بکات .

# سەرچاوەکان

**سەرچاوە کوردییەکان :**

– چەند فەیلەسوفێکی بوونگەرا ، فوئاد کامیل عەبدولعەزیز ، و : سامان عەلی حامید ، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم ، ب.ژ.چ ، س ٢٠٠٥.
– دیوانی مەحوی ، لێکدانەوەو لێکۆڵینەوەی : مەلا عبدالکریمی مودەڕیس و محمدی مەلا کەریم ، ئینتشاراتی کوردستان ، س ٢٠٠٣.
– فەلسەفەی بوونگەرایی ، جۆن ماکواری ، و : ئازاد بەرزنجی ، چاپخانەی ڕەنج ، سلێمانی ، چ ١ ، س ٢٠٠٥ .

**سەرچاوە عەرەبییەکان :**

– أصل الأخلاق وفصلها ، فردريك نيتشة ، ت : حسن قبيسي ، المؤسسة الجامعية للدراسات والنشر والتوزيع ، بيروت ـ لبنان ، ط ٢ ، س ١٩٨٣ .
– اشكالية التواصل فى الفلسفة الغربية المعاصرة ، عمر مهيبل ، الدار العربية للعلوم ، بيروت ـ لبنان ، ط ١ ، س ٢٠٠٥ .
– اشكالية الوجود والتقنية عند مارتن هيدجر ، ابراهيم احمد ، منشورات الاختلاف ، الجزائرالعاصمة ـ الجزائر ، ط ١ ، س ٢٠٠٦ .
– الفلسفة فى مواجهة العلم والتقنية ، مارتن هيدجر ، ت: د. فاطمة جيوشى ، منشورات وزارة الثقافة ، سوريا ـ دمشق ، ب.ط ، س١٩٨٨ .
– الكينونة والزمن ، مارتن هيدجر ، ت : د. جورج كتورة ، مجلة العرب والفكر العالمى ، العدد الرابع ، سنة١٩٨٨ .
– المأدبة (فلسفة الحب) ، افلاطون ، ت : د. وليم الميرى ، دار المعارف بمصر ، ط ١ ، س ١٩٧٠ .
– المذاهب الوجودية ، ريجيس جوليفيه ، ت : فؤاد كامل ، دار الآداب ـ بيروت ، ط ١ ، س ١٩٨٨ .
– الوجود والعدم ، جان بول سارتر ، ت : عبدالرحمن البدوي ، منشورات دار الآداب ـ بيروت ، ط ١ ، س ١٩٦٦ .
– محاضرات هيجل في تاريخ الفلسفة ( المجلد الثالث) ، هيجل ، ت : ا. د. امام عبدالفتاح امام ، مكتبة المدبولى ـ القاهرة ، ب.ط ، س ١٩٩٧ .
– سورين كيركجارد ـ مؤسس الوجودية المسيحية ، د. على عبدالمعطى محمد ، دار المعرفة الجامعية ـ الأسكندرية ، ب.ط ، س ١٩٨٥ .
– كتابات اساسية (الجزء الثانى) ما الميتافيزيكا ، مارتن هيدجر ، ت : اسماعيل المصدق ، المجلس الأعلى للثقافة ـ القاهرة ، ط ١ ، س ٢٠٠٣ .
– مبدأ العلة ، مارتن هيدجر ، ت : د . نظير جاهل ، المؤسسة الجامعية للدراسات والنشر والتوزيع ـ بيروت ، ط ١ ، سنة ١٩٩١ .

ـ مبدأ الهوية ، مارتن هيدجر ، ت : آمال ابى سليمان ، مجلة العرب والفكر العالمى ، العدد الرابع ، سنة ١٩٨٨ .
ـ موسوعة العلوم الفلسفية (المجلد الثانى) ، هيجل ، ت : ا. د. امام عبدالفتاح امام ، مكتبة المدبولى - القاهرة ، ب.ط ، س ١٩٩٧.
ـ نداء الحقيقة ، مارتن هايدجر ، ت : أ . د. عبدالغفار المكاوي ، دار الشرقيات للنشر والتوزيع ، القاهرة ، ط ١ ، سنة ٢٠٠٢ .
ـ نقد العقل التأويلى ، فتحى المسكينى ، مركز الانماء القومى، بيروت ، ط ١ ، سنة ٢٠٠٥.

**گۆڤار :**

ـ العرب والفكر العالمى ، مركز الانماء القومي ـ لبنان ـ رأس البيروت ، العدد الرابع ، خريف ١٩٨٨.

**ئەنتەرنێت :**

ـ وجود الانسان باعتباره وجوداً في العالم ، جيانى فاتيمو ، ت : عبدالمنعم البرى .
ـ العالم والأشياء ، قراءة لفلسفة مارتن هيدجر ، كلاوس هيلد ، ت : اسماعيل المصدق.

# له بڵاوکراوەکانی مەڵبەندی کوردۆلۆجی

## بەرهەمی نوسین

١-فەرهەنگی ڕێزمانی کوردی، د. کەمال میراودەلی.

٢- فەرهەنگی زەویزانی، جەمال عەبدول.

٣-حركات الخوارج فی غربی إقلیم الجبال وشهرزور والجزیره الفراتیه:عطا عبدالرحمن محی الدین.

٤- سۆفیزم و کاریگەریی لە بزوتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەیی گەلی کورددا: ١٨٨٠- ١٩٢٥، د. جەعفەر عەلی رەسوڵ

٥-قـضـــاء هەڵەبجـه، دراسه فی الجغرافیه الإقلیمیه: عطا محمد علاءالدین.

٦-رۆڵی هۆکـــارە سیاســـییەکان لە دابەشبوونی دانیشتوانی پارێزگای سلێمانیدا: جاسم محەمەد محەمەد عەلی.

٧-پەیوەندییە سیاسییەکانی نێوان هەرێمی کوردستان و تورکیا، ١٩٩١-١٩٩٨: هێرش عەبدوڵلا حەمەکەریم.

٨-رۆژنامەگەریی خوێندکارانی کورد لە ئەورووپاو ئەمریکا، ١٩٤٩-١٩٩١، لێکۆڵینەوە لە مێژووی رۆژنامەگەریی، نەوزاد عەلی ئەحمەد.

٩-هوشیاری کۆمەڵایەتی، فوئاد تاهیر سادق

١٠-شاری سلێمانی ١٩٣٢-١٩٤٥ ، د. ئاکۆ عەبدولکەریم شوانی.

١١-إقلیم کوردستان العراق في دائرة السیاسات النفطیة العالمیة، د. محمد رؤوف سعید مهندس النفط زمناکو سعید

١٢-بەعەرەبکردن لە هەرێمە کوردنشینەکاندا ٦٣- ٨٤٧ ز، رحیم ئەحمەد ئەمین

١٣-تعریب قضاء خانقین من منظور جیوسیاسي، صلاح الدین انور قیتولي

١٤-کۆیە، کامەران طاهر سەعید

١٥-بوون لە شیعری مەحویدا، د. محەمەد ئەمین عەبدوڵلا

16/Report on the Sulaimani District of Kurdistan, E.B. Soane.

## بەرهەمی وەرگێڕان

١-کۆمەڵکوژییەکەی دەرسیم، حوسێن یڵدرم، لە سوێدییەوە: کاوە ئەمین.

٢-جەنگی عێراق، کاپلان و کریستل، لە ئینگلیزییەوە: عەبدولکەریم عوزێری.

٣-یاسا دەستوورییەکانی تورکیا و کورد لە سەردەمی نوێدا، م. ئە. حەسرەتیان، لە روسییەوە: د. دلێر ئەحمەد حەمەد.

٤-سلێمانی ناوچەیەك لە کوردستان، ئی.بی. سۆن، لە ئینگلیزیەوە: مینە.

- **گۆڤاری کوردۆلۆجی، ژمارە یەکی ساڵی ٢٠٠٨**